# دڵشاد مەریوانی

## ئەو دەمەی شیعر بە پێوە دەمرێ

ڕۆڤار 40

ڕۆڤار
ڕۆژنامە - گۆڤار

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات



# دڵشاد مەریوانی شەهیدێکی یاخییە

**هەمزە عەلی**

قەیری نییە
دڵشاد مەریوانییە
لای ئەم کام لوتکەی هونەر
قەیری هەیە!؟
ئەوێک دەڵێ: بە گۆڕەکەی
ئەوێک دەڵێ گۆڕی نییە
ئەوێک دەڵێ بە فیشەکێک
یاخود بەدوان
شەهیدکرا
ئەوێک دەڵێ: نا.. نا
قەلای مەریوان سوتێنرا
ئەوێک دەڵێ:
لە ئەمنەکە لەتلەتکرا
ئەوێکی دی دەڵێ: نا بەرەو خوار برا
ئەوێکی دی دەڵێ: دڵشاد لە چاڵ نرا
لە وەڵامدا ئەویش دەڵێ
بۆخۆم بینیم
ئەهریمەن گۆڕەوشاریدا
نا..سوێند بەگۆڕەکەی مەخۆن
وا تێدەگەم.. وەک خۆی دەڵێ:
لەسارا یێک تەرم و لاشەی فرێدرا
گرینگ نییە. چۆن بوو کوژرا
گرینگ نییە.. گۆڕی هەیە، یاخود نییە
ئەو شەهیدێکی یاخییە
گرینگ نییە..
بە فیشەکێ شەهیدکرا
یاخود بەدوان..
یاخود نەکرا!.

سەرچاوە گۆڤاری دیالۆگ، ژمارە (٣) تەمووزی ١٩٩٨.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلاعیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرب شەمۆ.


سەرپەرشتیاری گشتی
شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار
یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید

سەرپەرشتیاری چاپ
فەرهاد ڕەفیق

ڕۆژڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوومانگ جارێك دەریدەکات



ناونیشان
سلێمانی- فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
ت: ٣١٢٩٦٠٩

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info



چاپخانەی ڕەنج

## کورتە ژیاننامەیەکی

# شاعیری شەهید دڵشاد مەریوانی

دڵشاد محەمەد ئەمین فەتاحی- مەریوانی-یە

باوکی لە ساڵانی سی سەدەی بیستەمەوە لە گوندی کاڵێی خواررووی مەریوانەوە، هاتووەتە پێنجوێن، پاشان شاری سلێمانی، هەر لەوێ ژنی هێناوەو نیشتەجێ بووە. ساڵی ١٩٤٦.

*١٩٤٧/٣/٢٨ لە دایک بووە.

*خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی بەشی وێژەیی هەر لە سلێمانی تەواو کردووە.

*بۆ تەواوکردنی خوێندنی زانستگا چووەتە شاری بەغدا بەشی زمان و ئەدەبی کوردی لە زانستگای بەغدا کۆلێژی زمان و ئادابی تەواو کردووەو ساڵی ١٩٧٢ بەکالۆریۆس، لیسانسی تیادا وەرگرتووە.

بەهۆی نۆبەرەیی خۆی لە خێزانەکەداو هۆشیاری باوکی هەر لە ساڵی ١٩٥٩- ١٩٦٢ لە خەباتی یەکێتی خوێندکارانی کاتی خۆی کاری کردووە.

*هەر لە مانگی مارتی ١٩٦٣ وە کاری سیاسی و خەباتی ژێر زەمینی کردووە. چەندین جار زیندانی کراوەو ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری دیوە.

لە شۆڕشەکەی ئەیلوولی ١٩٦١ لە شۆڕشەکەی حوزەیرانی ١٩٧٦دا یەکی پتر لە دوو ساڵ ژیانی پارتیزانانەی ناو شاری تاقیکردۆتەوە.

*جارێك بە دەربەدەریو چەندین جار بە گەشت زۆربەی شارەکانی وولاتانی عەرەب و تورکیا و وولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای دیوە.

*ئەندامی:

١-کۆمەڵی ڕۆشنبیری کورد.

٢-یەکێتی نووسەرانی کورد.

٣-نەقابەی ڕۆژنامەگەرانی عێراق ئەندامی هاوبەش بووە.



*ماوەیەك چەند بەرنامەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە ڕادیۆی عێراق بەشی کوردی، تەلەفزیۆنی کەرکوك بەشی کوردی بردووە بەڕێوە.

*بەرهەمە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکانی لە ڕۆژنامەکانی: ژین، هاوکاری، کاری میللی، بیری نوێ، دەنگوباس.. هتد بڵاوکردووەتەوە.

هەروەها لە گۆڤارانی: بەیان، ڕۆشنبیری نوێ، ڕۆژی کوردستان، دەنگی کرێکار، تریفە.. هتد.. بڵاوکردووەتەوە.

*گەلێك ووتاری ڕەخنەی ئەدەبی لەسەر نووسەران و شاعیران و ڕۆشنبیرانی کورد نووسیوە لەوانە: ئیبراهیم ئەحمەد، د.مارف خەزنەدار، محەمەد مەولوود، د.ئەمین موتابچی، هێمنی شاعیر، د. عەبدولرەحمانی قاسملۆ، شێرکۆ بێکەس، د. کاوس قەفتان، کەریمی حوسامی، حەمە ساڵح دیلان، شوکور مستەفا، ڕەووف بێگەرد، ڕەفیق سابیر، ڕەووف حەسەن، حسێن عارف، لەتیف هەڵمەت..هتد.

*پتر لە ١٧ شانۆنامە-نمایش نامە-ی نووسیوەو وەریگێڕاوە و ئامادەی کردووە. لەوانە: نازدار و شوان، پەروانە، خۆرکە، چاوی ڤێتنام، پراوەی ژن هێنان، بووکە خان، مانگیش ئاوابوو.. هتد.

*چەندین محازەرە، کۆڕی ئەدەبی و ڕۆشنبیری، کۆڕی ڕەخنە سازی بە درێژایی ١٢ ساڵ دەربارەی: شیعر، ڕەخنە، ئافرەتان، چیرۆک، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی..هتد. لە شاری: سلێمانی، هەولێر، دهۆک، بەغدا..هتد پێشکەش کردووە.

*بەناوی هەمە جۆرەوە چەندین بەرهەمی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و سیاسی لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوە و گۆڤار و نەوارە نەهێنییەکاندا بڵاوکردۆتەوە.

*لە هاوینی ١٩٦٢ تا پاییزی ١٩٦٦ لەگەڵ دەستەی لاوانی هۆشیاری ئەو کاتەدا، دامەزرێنەری (کۆمەڵەی بوژاندنەوەی سامانی نەتەوایەتی کورد) بوو. کە کۆمەڵێکی ئەدەبی هونەری بوو، باوەڕیان بە خەباتی ژێرزەمینی ئەدیبان و هونەرمەندانی خێر خواز و پێشکەوتووی کورد بوو. تا بەرهەمی ئەدەبی و هونەری بەرەنگاری، بەشێوەی بڵاوکراوەو نامیلکەی دەستاودەست کردوو بەناو جەماوەردا بڵاوبکەنەوە. لەولاوانەی ئەو سەردەمە: فەرەیدوون قادر، عەلی توانا، دارا شێخ نووری شێخ سالح، عەبدوڕڕەزاق پشدەری، ئەکرەم قەرەداخی، عومەر سالح، جەلال محەمەد، جەلال مەهدی، محەمەد ئەکرەم کەریم، عەبدوڵڵا عەباس، عومەر چاوشین..هتد.

*شیعری بەرەنگاری گەلێک لە شاعیرانی عەرەب و فارسی و ئەورووپایی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی لەوانە: موزەفەر نەواب، محمود دەروێش، سەمیح القاسم، پاپلۆ نێرۆدا، پۆل ئیلوار، فابتزارۆف، مایکۆفسکی، یەسەنین، کاڤاڤی..هتد.

*لە ژیانی ئاشکرای ئەدەبیدا ئەم نامیلکە سەربەخۆیانەی لە چاپ داوە:

١-فرمێسک و زەردەخەنە شیعر ١٩٦٨.

٢-یەکەم هەنگاو، پەخشان ١٩٧٣.

٣-دڵدارانی شۆڕش، چیرۆک ١٩٧٣.

٤-پێشوازی خاوەن شکۆ، ڕەخنە ١٩٧٣.

٥-بن بە تیشک، شیعر ١٩٧٦.

٦-بە پەنجەکانم دەتبینم چیرۆک ١٩٧٧.

٧-دێر یاسین، چیرۆک ١٩٧٨.

٨-سەمفۆنیای وەنەوشە، شیعر ١٩٨٠.

*لە دوو شانۆنامەدا وەک ئەکتەر بەشداری کردووە:

١-لانەوازان ١٩٧٣.

٢-پردیووڵات ١٩٧٤.

*لە فیلمێکی سینەمایی ١٢ خولەکیدا وەک ئەکتەر بەشداری کردووە، فیلمی ژیانی شوان ١٩٧٢ بەرهەمی زانستگای سلێمانی.

*لە کاتی قوتابێتیدا لە زانستگای بەغدا ١٩٦٩-١٩٧٢ دامەزرێنەرو سەرۆکی تیپی شاڵاوی کەرکوکی هونەری بوو، کە لەسەردەمی خۆیدا ڕۆڵێکی گرنگی دیاری بینی لە ناوەندی زانستگای بەغدا و موستەنسریەدا، جگە لەو ئاهەنگانەی لە یادە فەلەستینییەکاندا دەیان گێڕا بۆ ناساندنی کورد بەو کۆمەڵە و یەکێتییە شۆڕشگێڕانەی لە شاری بەغدا داڵدە درابون، لە ئەندامانی ئەم تیپە: ووریا حەسەن فیکری، دڵشاد ئەحمەد محەمەد ئەمین، پەخشان جەلال، کاژاو محەمەد ئەمین مەریوانی، بەهجەت ڕەشید، عەبدوڕڕەحمان ئەبوبکر، مستەفا زەنگەنە، گەلاوێژ حەمەئەمین، گوڵتان حەسەن عەباس.

*لە فرمانی دەوڵەتیدا ئەم کارانەی دیوە:

١-چاودێری زمانەوانی (مشرف لغوی) وەزارەتی ڕاگەیاندن.

٢-مەشقیاری هونەری (مدرب فني بدرجه معلم) لە بەشی زمان و ئەدەبی کوردی کۆلێژی ئاداب.

٣-هەروەها لە لقی کوردی کۆلێژی پەروەردە. بۆ ماوەی مانگ و چەند ڕۆژێکیش مامۆستای میوان لە بەشی خوێندنی کوردی لە زانستگای سلێمانی.

٤-تۆمارکاری قوتابیان (مسجل غيابات) لە کۆلێژی پزیشکی ئاژەڵ (كلية طب) لە ئەبو غرێبی نزيك بەغدا.

٥-ڕۆژنامە نووس لە وەزارەتی ترانسپۆرت لە بەغدا، نووسیاری گۆڤاری رساله النقل.

٦-مامۆستای زمان و ئەدەبی کوردی لە قوتابخانەی سانەوی سەرچنار، پاشان ناوەندی برایەتی لە سلێمانی سەر بەئەمینداریێتی پەروەردە.

*لەکاری یەکەمیدا نەبێ، کە بە مەیلی خۆی گوێزراوەتەوە، دەنا لە هەموو کارەکانی تریدا بەهۆی سزادان و دوور خستنەوەو ناچارییەوە شوێنە گۆڕکێی پێ کراوە. جگە لە دووجار دوور خستنەوەی لەکاری دەوڵەتی بەناوی پێویست پێ نەبوونەوە. (فائض عن الحاجة).

*لە ساڵی ١٩٧٥ بەشەکەی تری ژیانی هاوسەری خۆی دیوەتەوە، پاشان نیشانی کردووە. بەڵام تا ساڵی ١٩٧٨ لەبەر دەربەدەری لەکارکردن و بەندی مۆڵەتیان نەبووە پێکەوە بژین و خاوەن خانە بن.

*هاوسەر و هاوڕێکەی شیرین ک.ی ئەدیب و چیرۆک نووسە.

*لە ١٩٨٣/١٠/١٨ تا ١٩٨٥/٢/١٣ ژیانی پارتیزانانەی ناوچیای بردۆتە سەر لەگەڵ هاوسەر و کچەکەیدا.

*لە ئەیلوولی ١٩٨٤ەوە وازی لە هەمو ئیلتیزام و کاروبارێکی سیاسی هێناوەو گەڕاوەتەوە لای نامەو دەفتەرو قەڵەمەکەی.

*بە کرێکاری و بێ کاری ژیانی بردۆتە سەر هەتا گەڕاوەتەوە سەر کاری دەوڵەت، بووە بە مامۆستا لە ئامادەیی هەڵگورد تا ساڵی ١٩٨٧.

بەهۆی ڕەفزکردنی (جيش شعبي)یەوە دوبارە لە وەزیفە دەرکرا.

*لە ١٩٨٨ دانرایەوە لە ناوەندی سەرۆک.

*لە ١٩٨٩ ئامادەیی شۆڕش (٢ مانگ)

*١٩٨٩/٢/١٢ دەستگیر کراوە.

*لە ١٩٨٩/٣/١٣ شەهید کراوە.

سەرچاوە:

پەلکە زێرینەش نامۆمەکەن، دیوانی شیعر، دڵشاد مەریوانی، لە بڵاوکراوەکانی چاپەمەنی زاموا، سلێمانی ١٩٩٨، (لاپەڕە ٥-١٠).

# سەرەتای نوسینم

دڵشاد مەریوانی

ساڵی ١٩٦٠ بوو، یەکەم پەخشانی هونەریم نوسی بەناونیشانی (هەرەوەز) بە گوێرەی دەسەڵاتی ئەوسام، یەکەم پەخشانی هونەریم نووسی و باسی کارکردن و گۆڕانی تەك کارکردنم نووسی بوو لە گوندێکدا کە هەموو خەڵکی دێ لە مەزرای کابرایێك کۆبوونەتەوە.

کارەکەی بۆ دەبەنەسەر. هەر لە شەبەقی بەیانییەوە هەتا چێشتهەنگاو. پاشان نیوەڕۆو نان خواردنی بەکۆمەڵ و دوای ئەوە، کاری بەرەو دوایان هەتا عەسرو بەزم و ڕەزمی دەمەو ئێوارەو خۆرەنگینکردن لەژێر تیشکی خۆر ئاواداو چریسکەو بریسکەی خشڵی زیوینی کیژان و ژنانی لادێ. بەڵام بەداخەوە وێنەی ئەو پەخشانەم فەوتا، دەنا لێرەدا تێکستەکەیم دەنووسی.

ساڵانی ١٩٦٠-١٩٦٣ خەریکی وەرگێڕانی (عرائس المروج، العواصف، المجنون، النبی) جوبران خەلیل جوبران بووم، بۆ زمانی کوردی. ئەو کابرایە لە پەخشان داو محەمەد عەبدولحەکیم عەبدوڵلا لە چیرۆکدا، کارێکی زۆریان تێ کردبووم. ئێستاش هەندێك لەو وەرگێڕاوانەم ماوە. جار نەجارێ بۆ پێکەنینی خۆم و خۆم دەیان خوێنمەوە.

پێش ئەوەی یەکەم چیرۆك بنووسم. وەك پێشتر وتم، ئاشنای گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە بووم. لەگەڵ ڕۆژنامەی (ژین)دا زۆر دۆست بووم، عەجەب دەستانێکم هەبوو لە ((بۆ پێکەنین، ئایا ئەزانی؟، مەتەڵی ژمارە)دا. لە (ژین)ی ساڵی ١٩٦٢ لەو نموونانەم هەیە بەناوی دڵشاد محەمەد ئەمین-ەوە، بەڵام کە بڕیاری نووسینی یەکەم چیرۆکم دا، دڵم جۆرێك بوو، خۆ من ڕێگەی چاپخانەی (ژین) شارەزابووم، کە هیچ نەبێ بەهۆی نوکتەو ئایا ئەزانی و مەتەڵی ژمارەوە، جگە لە کۆڵان کوتیم لەوسەردەمی مێردمناڵیەمەوە بە دوای کیژانی جوانی ئەو گەڕەکەوە. بەڵام دەمویست لەو قاوغە دەربچم و وەك ئەدیبێك بێمە کۆڕەوە.

هاوینی ١٩٦٢ بوو. بۆی چوومە خەڵوەتەوەو ویستم مەسەلەیەکی باوی ناو کۆڕی پیران بکەمە چیرۆکێك بۆ منداڵان، ئەوسا وام دەزانی چیرۆك نووسان هەموو بە چیرۆکی منداڵان دەستیان پێ کردووە، پاشان کە زۆر شارەزابوون ئەوسا چیرۆکیان بۆ گەورە نووسیوە. وام دەزانی ئەمەیان ئاسانترە.

سەیر ئەوەیە ئێستا باوەڕم وایە مەرج نییە کام چیرۆك نووسی پیاوان و ژنان گەورەو بەناوبانگە. مەرج ئەوەیە ئایا دەزانێ و دەوێرێ شیعرو چیرۆك بۆ منداڵان بنووسێ؟



ئەمەیان زۆر گرنگەو کاری هەموو ژن و پیاوێکی ناسراوو بەناوبانگ نییە، گەرچی بەداخەوە لای ئێمە بووە بە گاڵتە بازاڕ، زۆریش بەداخەوە! چونکە مەسەلەی منداڵان گەلێك لەوە مەزنترە کە کاری تاك و تەرا هەندێکێش لە گەوران بێ.

بەهەرجا، مەیلەکەم گەورە تر بو لەشەرمەکەی ئەوسام. چیرۆکێکی لەو جۆرەی باسم کرد، نووسیمەوە بەناونیشانی (دڵسۆزی باوك) پێچامەوەو بەرەو قەلەندەرخانەکەی (پیرەمێرد) چووم، لە گەڕەکی گاوران — سابونکەران، وەك وتم بەهۆی نوکتەو ئایا ئەزانی و مەتەڵەوە شارەزابووم. لەڕێگە دووعا دووعام بوو کەس لە نووسەرانی —ژین— لەوێ نەبن.

شەرمەکەم زۆر زۆر بوو. حەزم دەکرد تەنیا کرێکارێك دەرگام لێبکاتەوە، نامەکەی بدەمە دەست، چەند و چۆنم لەگەڵ نەکا، بیدەمێ، لێم وەربگرێ و دەرگا دابخاتەوە، منیش تێی بتەقێنم و بۆی دەربچم.

چۆنم دەخوازی وەهابوو. تەمەنم پانزە ساڵان بوو قەیناکە بەو تەمەنەوە دەم سپی و خاوەن ڕاوێژی ناو برادەرانی خۆم بووم. بەڵام ئەم مەسەلەیە زۆر جیابوو. بۆیە بە تەسلیم کردنی چیرۆکەکەم گورج وەك زەوی قووتم بدا، گەڕەکی گاوران و قەزازان قووتیان دام بۆ

مەیدانی ماستەکەو دووکانی باوکم. لە ناخەوە خۆم بە لێهاتوو دەزانی و دڵنیا بووم لەوەی چیرۆکەکەم بڵاودەکرێتەوە. بەڵام بێ گومان نەبووم. هەموو چوار شەممەیێك لەلای من (عارفە) بوو. پێنج شەممەش ئەو جەژنەی (ژین)ی تیادا دەکەوێتە بازاڕەوە. هەتا لەپڕ یەکێك لە پێنج شەممەکان دوو جەژنی چاوەڕوانکراوی من دەرچوو. پێنج شەممەی ١٩٦٣/١/١٠ (ژین)ی ژمارە ١٧١٠ دەرچوو، لەلاپەڕەی (٤)دا. چۆن چیرۆکە (بەناو چیرۆکەکەم) بلاوکرایەوە ئەوا وەکو خۆی بێ دەستکاری تۆماری دەکەم.

ڕۆژنامەی ژین پێنج شەممە ١٩٦٣/١/١٠

ژ: ١٧١٠ ل ٤

بەشی مندالآن

بەسەرپەرشتی : محمد فیدا

## دڵ سۆزی باوك[1]

مناڵە خۆشەویستەکان ڕۆژتان باش

بزانن کە باوك مناڵی خۆی زۆر خۆش ئەوێ. وە هەمیشە ئەیەوێ کە مناڵی بگاتە پایەیەك لەخۆی گەلێك بەرزتر، وە هەموو کەسێ بەباشی ستایشی بکەن. وە ئەوە بزانن کەکەس نایەوێ کەسێکی تر لەو بەرزتر بێ. جا ئێستا چیرۆکێکتان لەبارەی بەزەیی و دڵ سۆزی باوکێکەوە بۆ ئەگێڕمەوە کە چیرۆکێکی ڕوو دراوو ڕاستە.

ئەگێڕنەوە، پیاوێکی تێ گەیشتوو کوڕێکی ئەبێ کە زۆری خۆش ئەوێ، کوڕە گەورە ئەبێ ئەگاتە کاتی ژنهێنانی. باوکی ژنی بۆ ئەهێنێ. دوای ساڵێ لە ژنە کوڕێکی ئەبێ. کە ئەمیش وەکو باوکی خۆی کوڕە مناڵەکەی زۆر خۆش ئەوێ. ئەوسمی زستان بەسەرا دێ و ڕۆژێ لە ڕۆژان بەفرێکی زۆر ئەبارێ. خەڵکەکە ناچار ئەبن هەرکەس بچێتە سەربانی خانوی خۆی و بان بماڵێ..

لەم شەوە کوڕ دەست ئەداتە بەفر ماڵ و سەر ئەکەوێتە سەربان. ڕۆژەکەی ساردبوو وورده وورد بەفریش هەر ئەباری. باوکی کوڕە ئاگری دەروون گرتی. لە خوارەوە وەستاو بانگی کوڕەکەی کرد کە جارێ واز لە بان ماڵین بهێنێ وە بەم سەرمایە خۆی تووشی نەخۆشی نەکا، هەرچەند بە دڵسۆزی و بە توڕەیی داوای هاتنە خوارەوەی لێ کرد. بێ سوود بوو. کوڕە ووتی تا تەواو نەیماڵم نایەمە خوارەوە. باوکە چی بکا باشە؟ ڕۆیشت کوڕە ساواکەی لە بووکەکەی وەرگرت و هێنای بە باوەشی خۆیەوە لە ژێر بەفرو سەرماکە ڕای گرت. کوڕەکە لەسەربانەکەوە چاوی بەمە کەوت قیژاندی ووتی: بابە گیان ئەوە بۆچی وا بێ بەزەییت. ئەو مناڵە کەی توانای ئەم سەرماو بەفرەی هەیە. تکا ئەکەم بیبەرەوە ژوورەوە با نەخۆش نەبێ. باوکە ووتی: کوڕم هەتا تۆ نەیەیتە خوارەوە پەیمان بێ ئەم مناڵە نەبەمە ژوورەوە. بزانە تۆ چەندە کوڕی خۆت خۆش ئەوێ. من سەد ئەوەندە تۆم خۆش ئەوێ. گڕی جەرگی من بەتین ترە لە هی تۆ.

بەم جۆرە کوڕە لەسەربان هاتە خوارەوە. زانی کە باوکی دڵسۆزێکی ڕاستەقینەیەتی، جا مناڵان لە بەزەیی باوك گەیشتن.

نەکەن هەرگیز لە فرمانیان دەرچن. هەرچی پێتان ئەڵێن بە گوێیان بکەن تا لە ژیانا شادو کامەران بن.

لێرەدا پێویستە ئەو هەڵەیەی بەرگی پشتەوەی دیوانی (فرمێسك و زەردەخەنە)م، ڕاست بکەمەوە، لەوێ نووسراوە، لەمانگی ئابی ١٩٦٣ دەستی کردووە بە نووسینی چیرۆك و پەخشانی کوردی، وەلێ ڕاستییەکەی ١٩٦٢-وە.

دوای نموونەی یەکەم چیرۆکێك کە نووسیومە با بچین بەلای یەکەم شیعریش کە لە ژیانمدا نووسیومە، ئەیلوولی ١٩٦٤ یەکەم شیعرم نووسیوە. لە دیوانی یەکەمم دا، فرمێسك و زەردەخەنە) لە لاپەڕە ٤ دا بلاوم کردۆتەوە. ئەمەش دەقەکەیەتی. کت و مت بێ دەستکاری.

## گوڵی سوخمە

"ئەو گوڵەی کە بەهۆی تۆوە خۆی خۆشەویست کرد لەلام"

گوڵی سوخمەکەت لەسەر مەمی تۆ
شادەماری ژین هەڵ ئەتەکێنێ
تیلەی چاوی گەش. خەندەی لێوی ئاڵ
لەلای من هەموو جیهان ئەهێنێ

لەنجەو ڕەوتی ڕێ. یاریی قژی ڕەش
شەرمەزاری یەکەم یەکجار ئەشکێنێ
ئاوازی بازن لەگەڵ تاری دەنگ
هەزار مۆسیقا و ئاواز ئەنوێنێ
خەندەی شیرینی نێوانی زارت
جەرگی تاریکی بۆ من ئەدڕێنێ

داخی ئەو پەخشانی (هەرەوەز)ەم ناچێ، لە دوو دەفتەری سەد پەڕەییدا بە کۆمەڵێکی تر لە پەخشان و کورتە چیرۆکەوە فەوتان هێندەم لە یادە ناوی کۆمەڵەکە "مشتێك زێڕ" بوو. گەر وەها نەبووایە ئێستا شان بە شانی تێکستی یەکەم: چیرۆك، شیعر، تێکستی یەکەم پەخشانیشم تۆمار دەکرد.

ئازیزان، نۆرەی ئەوە هات بێین بەسەرو باری یەکەم وتاری ڕەخنەییمەوە، با چیرۆکی ئەمیش بگێڕمەوەو تێکستی ئەم یەکەم وتارەشم تۆمار بکەم.

ساڵی ١٩٦٧، وا تێ بگەم مانگی تەمووز یان ئاب بوو یەکەم دیوانم بردە چاپخانەی ژین. ڕووی خۆم قایم کردو ووتم چاپی

---

[1] ئەم چیرۆکەمان لەلایەن کاك دڵشاد محمد ئەمین بۆ هاتوە، بەدەستکاریەکی کەمەوە بڵاومان کردەوە. زۆر سوپاسی ئەکەین.

دەکەم. تەمەنم بیست ساڵانە، لەخۆم ڕازیم و بەهۆی بەرنامەی (شیعرو مۆسیقا)ی ڕۆژانی هەینی ئێستگەی ڕادیۆی بەغدا- بەشی کوردی- ناوی خۆم بەرگوێ کەوتۆتەوە. لە بەرنامەی (گوڵی بەیان) یش دا بە هەمان سەرچاوەوە پەیتا پەیتا پەخشانی هونەری ناسک و ڕۆمانتیکی‌یانەی خۆم و ناوی خۆم گوێ لێیە. جار نەجارە ئێستگەی کوردی کرماشان شیعرم بڵاو دەکاتەوە. دیسان جارنەجارە شیعری نوێی خاوەن کێش و بێ قافیەم لە ڕۆژنامەی "الاخبار- دەنگ و باس" کە بە کوردی و عەرەبی لە بەغدا دەردەچوو "بریفکانی و ووردی" بەڕێوەبەری بوون. بڵاو دەبووەوە. خۆم بەشت دەزانی. لەم جەووەدا کەڵکەڵەی دیوان چاپکردن هاتە سەرمەوە.

ڕۆژێك دوای کریسمسی ١٩٦٨ واتە ١٩٦٨/١/٢ یەکەم دیوانم "فرمێسك و زەردەخەنە" کەوتە بازاڕەوە.

ئای!... لەو کەیف و هەوایەی ئەو ڕۆژانە هەم بوو! هەر ئەو ٣-٤ مانگەی لەم کەیفەدا بووم پێشبڕکێیەکی وەزارەتی پەروەردە هەبوو، لە نێوان سەرانسەری قوتابخانە ئامادەییەکانی عێراقدا، بۆ شیعر و چیرۆك و ووتار. بەڵام بەزمانی عەرەبی. منیش چیرۆکێکم نووسیبوو بەناونیشانی (کرات الدموع) لە قوتابخانە داوایان کردم و بەڕێوەبەرەکەم بە ڕێزەوە ناردمی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە، لەوێ زانیم کە چیرۆکی بەشدار بووم لەو پێشبڕکێ‌یەدا یەکەمی شاری سلێمانی و دووەمی سەرانسەری عێراق دەرچووە. چیتان لێ بشارمەوە هێندەی تر خۆم گێڤ کردەوە.

لەم لایشەوە دیوانم بەدەست کیژانی تازە هەڵچووی قوتابخانەکانەوە تەراتێنی بوو، لە ڕێی قوتابخانە گوێم لە توانج و پەنجە بۆ ڕاکێشانی بەلەزەتیان دەبوو. وەیش و وایشیان بوو. گەرچی من شەرم دەیگرتم و لە بەردەمیاندا وام دەزانی دەچمە یەك و بچووك دەبمەوە، بەڵام لەناوەوە زیاتر باوەڕم بە توانای خۆم پەیدا دەکرد هەر ئەوەش هانی دام. زوو ئەو ٥٢ دینارەی چوو بووە مەسرەفی چاپکردنی دیوانەکەمەوە، زوو چنگم بکەوێتەوە بەرهەمی ترم بەدوایدا چاپ بکەم. کۆشش و هەرای تاقیکردنەوەی بەکالۆریۆی پێنجی ئەدەبی ئەوسام لوولیان کردم و منی خاوەن تواناو دەسەڵاتی ئەدەبی، نمرەکانم هەمووی واشەری هەڵکەوتبوون تەنیا یەك ٦٧ م هەبوو ئەویش لە ماتماتیکدا، چۆن و بۆ؟ ئەوە یان نەهێنی منە یان هی بەکالۆریۆیە، ماڵیان ئاوابێ بەهەزار لەقەلەق و قنگە خلیسك و واسیتە لە بەشی کوردی زانستگای بەغدا وەرگیرام.

با لە باسەکە دوور نەکەوینەوە. من لەو کەیف و هەوایەدام، گوڕەی بەهاری ١٩٦٨-ە چەند برادەرێکی کچم پەیدا کردووە. کیژان دێڕە شیعری ناو دیوانەکەم لەنامەی دڵداریدا بۆ کورانی دەستگیرانیان دەنێرن. لە پڕ لە ڕۆژنامەی (ڕاپەڕین)ی ژمارە ١٧٣دا، کە دەڕوانم ووتارێك لەسەر خۆم و دیوانم نووسراوە. شرت و شۆی لەخۆم بریوەو دیوانی شندڕو ووندڕ کردووە.

چی بێ و لە ئێوە نەهێنێ‌بێ، ئاگرم تێ بەربوو! هێندەی پەرێشان کردم. هاوڕێیانم بەحاڵمیان زانی و ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ وەڵام دانەوەی، ئەو ساتانە مەسەلەکەمان هەر بەشەڕە کوتەك دەهاتە پێش چاو. وەك ڕەخنە نووس تەعەدای لەمن کردبێ و هاوڕێکانم لەسەرم هەڵبدەنێ، منیش ئەوان ڕەت بکەمەوەو سوارچاکی خۆم لەوەدا دەربخەم کە دەبێ خۆم هەقی خۆم بکەمەوە. ئەوسا تەمەنم ٢١ ساڵ بوو بی ڕتووش سۆزی ئەوسام تۆمار دەکەم. ئیتر دەخڵم نییە بەوەی ئێستاش بەداخەوە زۆر خاوەن تەمەن و خۆ بەزانا زانیو، لە بابەتی ڕەخنەگرتندا، وەك ئەوسای ئێمە بیر دەکەنەوە.

لە داخی ئەو ڕەخنەیە، هەر بە تۆپزی بڕیارم دا ببم بە ڕەخنەگر. پێم وابوو دەبێ وەڵامێکی وا خەست و خوڕ و هەقە وەسێنی بدەمەوە، لەناو جەماوەردا بمکرێتەوە. (قسەی خۆمان بێ جەماوەرەکەش مەبەستی زۆریم هەر کیژانی بە خۆم موعجەب بوون" وەڵامی ڕەخنەم شەڕە تێلایی‌یانە نووسی و بردم بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕاپەڕین) مامۆستا ساجید ئاوارە- بوو. دوای ئەوەی خوێندییەوە. کەمێك ڕاما. پاشان ووتی: کاك دڵشاد ئەم وەڵامە زۆر توندو تیژە و کەڵکی بڵاوکردنەوەی نییە. تۆ بۆ هێندە بەو ڕەخنەیە قارس بووی؟! پاشان بۆ بەهێمنی‌یەکەی ژیانی ڕۆژانەی خۆت وەڵامی نادەیتەوە؟ من ڕام وایە هەر بەوەیان گرەو دەبەیتەوە.

قسەکەی زۆر کاری تێکردم. هەر لەوێدا بڕیارم دا شێوەیەکی ساکارو گاڵتە ئامێز بەکار بهێنم. ووتارەکەم وەرگرتەوەو چوومە ماڵەوە. وەڵامەکەم داڕشتەوەو بۆ ڕۆژی دوایی بۆم بردەوە. خوێندییەوە وتی: هێشتا ڕەقی تیادایە بەڵام ڕەخنەکەی ئەویش هەر وابووە، لەبەرئەوە قەیناکە.

هەر لەو ساتەی دڵنیا بوون لە بڵاو بوونەوەی ڕەخنەکەم. هەر لەو ساتەی لە قەڵەندەرخانەکەی (پیرەمێرد) هاتمە دەرەوە. ئیتر دڵم چووەوە جێی خۆی. بە خەیاڵی خۆم وام دەزانی هەموو دنیا دەزانێ کە هەقی خۆم کردۆتەوە. بۆیە وام دەزانی ئیعتبارم چۆتەوە جێی خۆی. ئەو هەستە بۆ؟ نەم دەزانی!

ئای! لەو ڕۆژەی: دووشممە ١٩٦٨/٤/١٥ کە (ڕاپەڕین)ی ژمارە ١٧٨ ساڵی ٥ کەوتە بازاڕەوەو وەڵامەکەی منی تیادا بڵاو کرابووەوە!

بڕیارمدا، دوو ڕۆژ نەچمە دەرەوە، هەتا هەموو خەڵك وەڵامەکەم دەخوێننەوە. لەوە دەچوو هەستم وابێ وابزانم چوونە دەرەوەی خۆم زیان لە خوێندنەوەی ئەوان بداو و وەڵامەکەم باش نەخوێننەوە!

ئەمەش دەقی یەکەم ووتاری ڕەخنەییمە بێ دەستکاری چۆن بڵاوکرابووەوە هەروەها:

وەڵامی ڕەخنە:

## دەربارەی فرمێسك و زەردەخەنە

دڵشاد مەریوانی

لە ژمارە ١٧٣ی ڕۆژنامەی ڕاپەڕینی بەڕێزدا نووسراوێکم بینی لەژێر ناونیشانی، ڕەخنە لە "فرمێسك و زەردەخەنە" بە پێ نووسی "صلاح الدين...." نووسراوە کە ڕەخنە نەبوو بەڵکە ڕای نووسەرەکە خۆی بوو تەنانەت سەیرم لێ هات کە بە ناونیشانی ڕەخنە بڵاوکرابوەوە. بەڵام کە بیستم زۆر لە ئاوەڵانم وە چەند نووسەرێکیش نیازیان وابوو لە جیاتی منەوە وەڵامی بدەنەوە، وا ئەم وەڵامەم بۆ نوسی.

براله ڕەخنەگرتن پیشەی هەموو خاوەن پێ نوسێك نیە بەڵکە ڕەخنە بەشێکی بەتوانای وێژەیە، وە پێویستی بە شارەزاییەکی زۆر هەیە، کە بە نوسراوەکەی بەڕێزتانا بۆم دەرکەوت ئێوە لەو شارەزاییەی بێ بەشن. چونکە لە سەرەتاوە باسێکی دیوانەکەمی کردوە بە گەوهەرێکی بەنرخ وەشایانی ڕێز لێ گرتن. لە پاشیشدا ووتوتە ئەو شێوە نووسینانە خراپن وە نابێ بی خوێننەوە.

وە نووسیوتە "ناپاکی، واتە جنسی" نازانم ئەو مانا بەلەمیەت لەکام دەریای بیرت دەرهێناوە؟

نووسیوتە هەڵبەستەکانی جنسیە.. نەء تۆ خراپ تێگەیشتوی وە وادیارە لە ڕێژەی کوردیا زۆرت نەخوێندۆتەوە.. وە هەروەها چاویشت نەخشاندوە بە ویژەکانی تری میللەتانی جیهان، ئەگینا تێ ئەگەیشتی کە ئەو شێوە هەڵبەستانەی من، شێوەیەکی جوان و ڕێز لێ گیراوی هەڵبەستە لەلای ڕەخنەگرو بوێژ و نوسەرە تازەکان، کە مەبەستیان دارشتنی وێژەیەکی (ڕۆمانتیکی) تازەیە بۆ مرۆڤایەتی ئێستاو لەمەو پاش.

گیانەکەم، وێژە لەناو هەر گەلێك و کۆمەڵێکدا بێت، بە گوێرەی (ئایدۆلۆژیەتی) ژیانی ئەو کۆمەڵە ئەڕوات و پێش ئەکەوێت لەگەڵ ڕووداوە تازەکانی ژیانیانا.

ئێستە شاعیرێك شەوێك لە ژیانی سپی ئەکات، تا بەیانی فریشتەی خەو ئەتۆرێنێ، بۆ باسێك، بۆ مانایەکی تازە، کە تا ئێستا بە خەیاڵی هیچ هەستیارێکدا نەهاتبێ، هەوڵ ئەدات بۆ شتێکی نوێ، بۆ باسێکی ناسك و بەتام.

لەبەرئەوە تۆ مافی ئەوەت نیە کە بە یەکێك لەو بوێژانە بڵێیت: نووسینەکانت کۆمەڵی کوردەواری ڕانەهاتووە لە گەڵیا. وە ئەبێت خۆت ببەستی بە شێوەی (کلاسیکیەتی) بوێژە کۆنەکانمانەوە، چونکە هەموو نوسەرێ سەربەستی ئەوەی هەیە چ ڕێگایەك بگرێت لە ڕێگاکانی وێژە:

لەسەر هەڵبەستی ل ٦٤ نووسیوت، هەروەکو شاعیر ئەو هەڵبەستەی لە (ملهی)دا نووسیبێ وایە نەك لەسەر مێزی وێژەیی.

بەڵێ، ئیتر هەروەکوی ناوێ، وا دیارە تۆ ئەو هەڵبەستەت هەر نەخوێندۆتەوە کە بە ئاشکرا نووسیومە (ژوری مەیخانە)، وە بە ئاشکرا باسی، گۆرانی بێژ، سەماکەر، تیپی مۆسیقا، دانیشتوەکانی نادیم کردوە.. چونکە شاعیر لە کوێدا دەرونی جۆشا.. هەڵبەست ئەنووسێ، وەمن تا ئێستاش نەم زانی بوو کە دارتاشی وەك بەڕێزتان هەیە مێزی وێژە دروست ئەکا، ئەگینا دانەیەکم لێ ئەکڕیت، چونکە قسەکەت وا نوسیوە کە نوسینی شیعر مێزی تایبەتی هەیە کە لە تەنیشتیەوە دانیشتی شیعر بەلێشاو دێت، ببورە کە تا ئێستا بەو داهێنراوەی (اختراع) بەڕێزتم نەزانیبوو، هیوادارم مێزێك لەو مێزە وێژەییەکانم پێ بفرۆشی بە نرخێکی هەرزان چونکە لە کۆمەڵەکەی ئێمەدا خۆت ئەزانی کە شاعیر و بوێژ زۆربەیان هەژارن ڕەنگە هۆی ئەوەش بزانی.

نووسیوتە کە لە دیوانەکەی منا جۆرە هەڵبەستی تری تیا نیە لە دڵداری بەولاوە. (براله) لەو جۆرە هەڵبەستانەم زۆرە کە دڵداری نەبن، فەرموو وەرە چاپیان بکەن من ڕێگات ئەدەم.

زۆریشم پێ خۆش بوو کە نووسیبووت (لە زۆربەی هەڵبەستەکانیا ووشەی وای بەکار هێناوە کە موچرکەی لەش پەرستی ئەخاتە لە شەوە) چونکە (نزار قباني) ئەڵێ: شیعری ناپاب ئەو شیعرەیە کە شێوە کارەباییەکی خۆش و بە سۆزی تیابێت و خوێندەوار لەکاتی خوێندنەوە هەستی پێ بکات لە گیانی خۆیدا، منیش بەو قسەیەت بۆم دەرکەوت کە هەڵبەستەکانم لەو کارەبا خۆشە بێبەش نین، بە تایبەتی جێی شانازیە بۆ من کە هەڵبەستەکانم توانیبێتیان تەنانەت مچورکە بە تۆش بگەیەنن، کە لەلای خۆت ڕەخنەت لێ گرتوون.

خۆشەویستان ئەوەی تا ئێستا نووسیم، گەشتێکی پاکی ڕاستگۆیانەی بێ ڕتووش بوو بە ژیانی سەرەتاو دەست پێکردن و هاتنە کۆڕی ئەدەبمەوە. بە چاکە و خراپە و خەوش و ناتەواوی ئەو سەرەتایەوە هیوادارم گۆشەیەکی ژیانم لەم بابەتەوە بۆ ڕوون کردبنەوە.

دوای ئەمانە ئیتر مانگی دەی ١٩٦٨ بوومە قوتابی لە زانستگای بەغدا و ئەو چوار ساڵی خوێندن و خوێندنەوەیە کە تیایدا کتێبی سەربەخۆم چاپ نەکرد. ساڵانی خۆ پەروەردەکردنی زانستیانەم بوون ، ساڵانی خۆ کۆك و سفت کردن بوون. تا دەستپێکردنەوەی نوێم لە ١٩٧٢ وە، واتە ساڵی دەرچوونم لە زانستگا.

پاش ئەم سەرەتایە لەسەر سەرەتای ژیانی ئەدەبی و ڕۆشنبیریم کە هەردەم بە هەموو خەوش و ناتەواویەکانیەوە شانازی دەکەم و مەگەر خۆم بزانم چەند لە خۆم دا هیلاك بووم تا هاتوومەتە ئەم ئاستەی ئێستا. ئێستاش فەرموون ئەوە هەڵبژاردەی ووتارو بەرهەمم لە بەردەمتانایە هیوام سەرفرازی و خێری گەلە.

د.م

ئەیلوول ١٩٨٤ سلێمانی

# هەڵبژاردەیەك لە دیوانی دڵشاد مەریوانی

## بۆ هاوڕێیانم

من دەزانم دەکوژرێم
من دەزانم تەرمەکەم
لە (سارا)ییک فڕێ دەدرێ
وا دەشێوێ
ناناسرێ
پێ نازانرێ:
تەرمی کامە قاچاغچییە
پێ نازانرێ
تەرمی کامە پێغەمبەری یاساغچییە
هاوڕێیانم نامناسنەوە
نە، سیمای خۆشی نەدیوم
نە، باڵای قەد نە نەویوم
نە، هیوای پڕ چاوی گەشم
نە، جێ زامێ،
شوێن ئەشکەنجەی نەخشەی لەشم
نە، ئەبرۆی ڕەشیووریام
نە دەم و لێوی پڕ سەودام
نا ناسنەوەو
نام ناسنەوە
هاوڕێیانم نام ناسنەوە
بەڵام هەموو بەتاسەوە
دەڕواننە:
لاشەی لە (سارا) کەوتووم
لە یەکتری دەپرسن:
(بۆچی سەگی بێ خاوەن و بەبێ خانە
سەگی برسی و دەرکراوی لانە
لە لاشەیان نەخواردووە!
بۆ؟ دەمیان بۆ نەبردووە؟!)
ئەی هاوڕێیان
گەر لاشەم جێ گەستەی سەگ بوو.
بزانن سەگی پۆلیسە
گەستەی سەگی بۆرژووایانی نەگریسە
سەگی برسی
گاز لە لاشەی من ناگرن.
هەر ئەوەشە هێشتوومیەوەو
دوژمنانم بەرگەم ناگرن.

١٩٨٣/١٠/١٧

## نەهێنی نەکوشتن و نە نووستنم

لەو ساتەوەی لەدایک بووم
خەنجەرێکی، دەبانیان لە ژێر سەرم داناوە..
تا، گەوهەری لێ وەربگرم،
پێی گەورە بم.
تا بتوانم..
خۆم سەربڕم

***

شا ژنێکی شکۆدارو خۆشەویست..
پەروەردەی کردم.
تا، پەنجەکانم بمەیێ و
مشتووی خەنجەری پێ بگرم
بە ئاسانی خۆم سەربڕم.
کە گەورە بووم..
دەستی هێنا بەسەرما
فەرمووی: کوڕم
لە پەروەردەتا
شەکەت بووم.
هەڵسە ئیتر، من دەنووم.
شا ژنی خۆشەویست،
لە جێگەکەم نووست.

دەزانم، توانای بڕین- م تیایە.
بەڵام چی بکەم، دڵم نایە..
دای چڵەکێنم.
تا، خەنجەرەکە، دەربێنم

***

بە خۆرهەڵات دا، کەوتمە ڕێ و هەنگاوم نا،
هەتا ئەژنۆم، بەناو زەوی‌دا، دەچەقا.
بەڵام هێشتا ..
بە، من وایە،
بووارەو هەنگاوەکانم، ئاوەڵایە.
زۆری نەبرد، هەر دەست بەجێ..
گەییمە ئاوەدانی‌یەک، نا ئاشنا
تیا، مامەوەو، کردمە جێ،
جێشم نەهێشت،
تا خاتوونێکی نازدارو خۆشەویستم..
کردە هاوڕێ
بەو هیوایەی:
بە هێمنی و چرپەچرپی خانمانەی
شاژنەکە، خەبەردارکا.
ئەوەی، کە، بۆی لە دایک بووم..
لە گەردنی خۆمی بسووم.
لەگەڵ خاتوونە هاوڕێکەم، کەوتمە ڕێ.
بە خۆرئاوادا هاتمەوەو، گەییمە جێ.
خاتوونی هاوڕێو خۆشەویست ..!
کاتێک چاوی..
بە دیدەنی ..
شاژنە نوستووەکەم.. شوشت
فەرمووی: ڕەنگە
خەو بە تۆوە ببینێ؟!
ئەمیش لە تەنیشتی‌یەوە- نوست.
گەرچی، لە مێژە نەنووستووم
حەزم لە مەرگەو
شەکەت و ماندووم.
بەڵام چی بکەم!! دڵم نایە
هەر دووکیان ڕاچڵەکێنم
تا، خەنجەرەکە، دەربێنم.
ئەم جارەیان، سەفەرەکەم نەهێنی کرد.
شاراوە، وەک بەردی بن گۆم

تا، کچۆڵەیەکی چاو ڕەشی، خڕینم کرد..
بە هاوڕێی خۆم
هیوادار بووم بە گۆرانی دەنگە نەرمە بەهەشتیەکەی
هەردووکیان خەبەرکاتەوە.
شەکەتیم لەبیر باتەوە.
کەچی، کاتێک، کە، بینینی،
چوو لە نێوانیاندا پاڵ کەوت
تا، گەییمە لای، خەوی لێ کەوت.
گەرچی، لە مێژە نەنوستووم
هێندە ماندووم..
شەکەت-ی ئارامی بردووم.
مەرگ-یش نەبێ..
هەر دەمەوێ..
تاوێک بنووم!
بەڵام چی بکەم، دڵم نایە
هەرسێکیان ڕاچڵەکێنم
جێ-ش نەماوە خۆم-ی
تۆزێک
تیا بنوێنم

خاتوو سیڤا بمانبەخشە
کچم هەتاوەکو ئێستا
من و دایکت
هەتا، مۆڵەت هەبوو توانرا
گوڵی نازی تۆمان ئاودا
بمان بەخشە کە لەمەولا
سیخوڕەکان:
ناهێڵن بووکت بۆ بکڕین
ئامێردەکان
ناهێڵن لێت نزیک بین و
ئەو ووشانەی کە بۆ انازان
بیچرپێنینە گوێتەوە
ملوانکەو موستیلەو بازن
بکەینە مل و دەستەوە
ئەو گولانەی کە هی اڕازان
بیبرژێنینە ڕێتەوە
کاتێک لە باخچە دێیتەوە
بمان بوورە

سیخوڕەکان
ناهێڵن بووکت بۆ بکڕین
نا، ناهێڵن
بیانووە ناسکەکانت ببڕین
بووکە شوشە و یارییێکانی،
سەر ڕەفەکەت بۆ داگرین
کچم داگیرکەرانی،
(خۆشی لەم کوردستانە
کە وەک نوری چاومانە)(١)
لە (ڕۆژباش)ی
دایک و باوک و منالانی
ئەم کوردستانە تێ ناگەن
لە (ماچی ماڵ ئاوایی) و (بای بای) چوونیان،
بۆ ئیش و کار، تێ ناگەن
نا، تێ ناگەن
لە عەتری بۆنی گوڵ بەهار
لەسەرنجی تۆ بۆ خاڵەی ڕێبوار
لە حەزت، لە قاسپەی خۆشی کەوو کەوبار
لە چرپەی تۆو بووکە شوشە
پرچنەکەی چاوبەخومار
کە بە ڕیزە ناوت نابوون
شیلان، خەندە، ڕۆزا و مینۆو بووکێ و تەلار
میشەو دن دن و مەیموون و دەنکە هەنار(٢)
چی تێ بگەن؟
بۆچی لەبەر: باخچەی ساوایان ڕووخاندن
بۆچی لەبەر: لێدان و گرتن و مەرگی بەخنکاندن
فریای هیچی وەها کەوتوون:
تێ بگەن (مرۆڤ) یانی چی!
بۆچی دەخواو کار دەکات و بۆچی دەژی!
تێ گەیوون خۆشەویستی
نیشتمان و گەل (سوور)ە:
یا نە (ڕەش)، یا (سپی)یە
بەڵام گوڵە، ڕەنگینە زۆر بۆن خۆشەکەم
من و تۆ و پێشمەرگەکانی هاوڕێمان
شتی جوان و نەخشینەمان بۆ داناوی
بۆت دەکەینە دەستە دیاری
جووتێک گوارەی سوورو گەشی
کارەساتەکەی (هەکاری)
پەیکەری (مامە مەولودی)
قوڕە (بەرازە)ی بە هەڵمەت
هەرزەکاری.
وێنەی پڕ شکۆی داستانی
(شارستێنە)
چیرۆکەکانی (قەندیل) و (هەورێ) و (ماکۆک)ی
بێ وێنە.
خاڵە شەهاب، جەعفەر، ئەنوەر.
دەنگی زەنگیان بۆ داناوی
(ئیبراهیم عەزۆ) و (ژەنگاری)
ڕێگەی شەنگیان بۆ داناوی
هاوڕێ ئارام عەینەکەکەی
جەمال تاهیر قەڵەمەکەی
جەمال باپیر، قەڵغانی دژی وەیشوومە
کاکە سەلاح، پرۆژەی ئاوی مالومە
مامە غەفوور ژاژڵەیی،
خۆڕاگری بۆ داناوی
خاڵە شەماڵ، وانەی هەردەم بەرەنگاری
بۆ داناوی
کچە شیرینەکەم وەرە
بیانوو بگرەو پێ داگرە
خاڵان و مامانت توند توند
یەخەی بگرە
بڵێ: دەبێ ئەوانەم بۆ بکەنە نیشان
بۆم بکەنە ئیکلیلی گوڵ
هەتا منالانی هاوڕێم، تێر بۆ نیکەن،
چونکە نەک دوژمنانی خاک
بووکی منیان شکاندووە
بەڵکە خوێنی گەشی باوک و
خاڵ و مامی هەزارەها منداڵی وەک منیان
بەقەست ڕژاندووە.
بڵێ دەبێ
نان و ئاشتی و
شارستانی
زامن بکەن بۆ مندالانی کوردستان
بڵێ دەبی..
ئەم میللەتە دواکەوتووە بگاتە ڕیزی میللەتان

١٩٨٢/٧/٥

---

(١) گۆرانییەکی منالانە لە سەردەمی سیڤای کچم بوو.
(٢) ناوی بووکە شوشەکانی سڤای کچم بوو.

## شوشه خان

خۆشەویستیت:
دەریاییێکەو
ئەو ماسییانەم خۆش دەوێن
کەوا لە بناریا
دەژین.

خۆشەویستیت: ڕووبارێکەو
ئەو پاساریانەم خۆش دەوێن
کەوا لە کەناریا
دەژین.

خۆشەویستیت:
کانییێکی ئیسپرتۆیەو
منیش سنەوبەرێکی گڕ
پێم گرتووەو بەرەو ڕووت دێم
شووشەخان تۆیش
وەکو نازێ
بڕژێ بەسەر گیانی ئۆقرە لێ بڕاوما

شووشەخان تۆیش
وەکو ژانێ
مەتکێ بەناو ناخی بەحەز ئاخنراوما

(دەنگ:
شووشە خۆشەویستییە
خۆشەویستی ئیسپرتۆیە
ئیسپرۆتۆ ماسییەو
ماسی خەمەو
بەرەو دەریای لمی دەبەن)


دڵشاد مەریوانی و شیرین خانی خێزانی ١٩٧٦/٢/١

خەم پێ دەگرێ
وەکو ساوای دڵ بێ کینە
خەم پێ دەگری

لەبەر تاقگەی
پڕ لە ژانی چاوەکانما
وورک دەگرێ:
=بابە گیان بمبە لەگەڵ خۆت
=کچە شیرینەکەم مەیە
ڕۆحە شیرینەکەم مەیە
خێڵی کوێستان بەرەو خوارەو
ئەم ڕێگایە
پڕ لە ژان و ئەندێشەیە
باوانەکەی بابە، مەیە.
=بابە گیان چۆن جێم دەهێڵی!
خۆ من لە گورگیش ناترسم
ئەی بۆ نامبەی؟!
بابە گیان بمکەرە کوڵت.
=باشە گیانە شیرینەکەم دەتگرمە کوڵ
وەکو خەمی هەموو دنیام گرتۆتە کوڵ

دەتگرمە کۆڵ

بەڵام باوان:

توند دەست بگرە بە سەرمەوە

هەتا کاتێک کە تیغ سەری لێ کردمەوە

تۆپی سەرم

لە باوەشی نەرمتا بێ

نەک تۆڕی دۆڕاندنی خەڵک

(دەنگ:

کۆچی کاروان، کۆچی خێرە

بەڵام هەوار سەرەو ژێرە)

=بابە گیان خێڵ بەرەو خوارە

بەڵام من حەز لە بەفری سەر چیا دەکەم!

=ڕۆڵە نەم ووت: هەوارەو خێڵ بەرەو خوارە

نەم ووت؟ نەم ووت؟

=بابە خۆتۆ بابەی خۆمی

بۆ زیز دەبی و دەمرەنجێنی؟!!

خۆتۆ لای خۆت خۆشت ویستم

دەسرازەکەمت کردەوە!

=باوانەکەم (سەرمایە)م تۆی

دڵم پرە

دەنا گشت کات خۆشم دەوێ

کچە جوان و شیرینەکەم

تۆ ڕووبارێکی ئیسپرتۆی

زامەکانم لە چاوتا

وەک گوڵە مێخەکی تینوو مەلە دەکەن

بەڵام چی بکەم

من بەتەنیا چیم لەدەست دێ

ئەم دڵەی من کوترێکی لانەوازە

دڵدارە بۆ گێتی تازە

=بابە گەر چی پەنجەکانم نەرم و ووردن

بەڵام دڵنیام کە بەرگەی

قوڵپی خوێنی سەرت دەگرن

(دەنگ:

دوانن. دوانن

هاتوون بەدوای خەمدا وێڵن

غەریبی خۆیان دەکێڵن)

=بابە گیان تۆ گوێت لە دەنگە؟

=بەڵێ ڕۆڵەکەم

ئەم جیهانە سنەوبەری گڕی زۆرە

پەیتا پەیتا وەک من و تۆ

هەنگاو دەنێن

بەرەو کانیاوی ئیسپرتۆ

=بابە گیان ئەی بۆ دەیان ووت:

کاربۆن زیندەی لێ پێک نایە؟؟!!

=نا ... کەسەکەم

فیزیای خۆشەویستی جیایە:

ئاو لە کاربۆن دەزێتەوە

کاربۆن زیندوو دەبێتەوە

ئەوسا دەبینی

(بێ دەنگی) زەڕ ڕەیێک (سروە)

ناسڕێ

ئەوسا دەزانی

کە (تەور) نە (ئاگر) و نە (ئاو)

نابڕێ

بەڵام هەتا ئەو دەمە دێ

توند دەست بگرە بە سەرمەوە

هەتا کاتێک کە تیغ سەری لێ کردمەوە

تۆپی سەرم لە باوەشی نەرمتا بی

نەک تۆڕی دۆڕاندنی خەڵک.

٢٨ی دیسمبر ١٩٧٥

## بنِ بە تیشك

-لەم دیو دیواری مەرگەوە-

ڕۆڵە

تۆ نەمامێکی گوڵ دەگری

ئاگادار بە

نەمام هەیە نووکی نێزەی لێ دەبەستری

بەڵام نەکەی لێی بترسی.

ڕۆڵە

چاوەکانم دەردەهێنن

گوێزان دەخەنە ناو گەرووم

مەترسە تیشک نافەوتێ

دەنگ ناخنکێ

ئەوەتا من:

بی دەنگ نەبووم

***

-لەودیو دیواری مەرگەوە-

ڕاستە گیانە تیشک نافەوتێ

بەڵام لێرە:

دەنگ دەخنکێ

لە ئاسیای سوور

هێشتا شەوە

شەو برژانگ دەبێتە ڕەوێک ئەسپی سەرکێش و

بیلبیلەکان:

دەفرێنن

بۆ وولاتی خەنە بەندان

ئێستا لێرە دڵدارەکان

بوون بە تیشک تا نەفەوتێن

تەنیا بەچاو سرووود دەڵێن

***

-دیوار ڕووخا-

ببن بە تیشک بۆ ئاسیای سوور

خۆشم دەوێن و شەو درەنگە

شەوە زەنگە

گوێزان تیایدا باڵ دەگرێ و

گەردنی نەونەمامە گوڵ گرتووەکان دەبڕێتەوەو

گوڵ دەسـ ...

ووس س س

کەس دەنگ نەکا

خوای ڕەش و شەیتانی سپی

پێکەوە مەقامێک دەڵێن:

-(سورمێ) لە (خورشید) دابڕن.

بیدەنە ئەمیر لاوێ دەورەتێ

لە ئەمیر لاوێ دەورەتی گەڕێن

با سورمێ لۆ-وی- بیو

خورشیدی چاو بەخار کۆستی کەوتبیو

جەرگی سۆتبی

+دەنگی خورشید:

لە چیای (هێستوون) چ کاکێ؟

دەڕواتە دووی ووراغەکەی خاتوو سورمێ

تا هوشیار بی و هەڵ نەدێرێ؟؟؟

+دەنگی خەج:

لەسەر چیای (سپیان) ێ چ خاتوونێ؟

کەزییەکانی خۆی دەبڕی و

دەیخاتە سەر کەزییەی خەجێ

تا سیامەند ڕزگار ببێ؟؟؟

***

ئەی خۆشەویستی بێ سنوور

لە ئاسیای سوور

دڵدارانی کاروانەهای وەنەوشەیی

بۆ وولاتی خەنەبەندان

دەبن بە تیشکی سپی

هێشتا شەوەو گوێزان تیایدا باڵ دەگرێ و

گەردنی نەونەمامە گوول گرتووەکان دەبڕێتەوەو...

ووس س س س س

تەماشا بکە:

دەنگێک، دوو دەنگ، پێنج دەنگ، دەنگێکی تر

شەش دەنگ، سێ دەنگ= سیانی تر

=سیانی تر

=سیانی تر

پەتی سێدارە تەسبێحەو

دەنگ سەری جوانەمەرگە

***

دووایین ڕاپۆرتی نەهێنی لە -الطب العدلي- یەوە:

بەڕێزەکان ... بەڕێزەکان

لە کردنەوەی چەکمەجەی فرێزەرەکان

زۆر دەترسێن

زۆر دەترسێن

هەرکامێکیان ڕادەکێشین

گوێمان لە دەنگی سرووودی

ئینتەرناسیۆنالی دەبێ

٢٠ی دیسمبر ١٩٧٦

# گۆرانیی شەقامێکی ترسناك

٢٧ی جنیوەری ١٩٧٧

دەمەو ئێوارە
خۆتان دەکەن بە شارا
سەر دەکەن بە هەموو ماڵە هەژارەکانا
زەردە خەنە دەچێنن
چاوی نازداران دەڕێژن
لایلایە بۆ ساوا برسیێیکان دەکەن
لەگەڵ کرێکاران، سبەینان دەچنە کار
گۆرانی خۆشیان بۆ دەڵێن
یا ساوڵان:
گوێیان لە دەنگتان دەبێ
دەتان گرن
دەتان کەن بە پەتا
دەمەو ئێوارە خۆ دەکەنەوە بە شارا
سەردەکەنەوە بە هەموو ماڵە هەژارەکانا

***

گوێم لە گۆرانیە خۆشەکەتە
هەردوو باڵم بۆ کردوویتەوە
ئەی ئاشنا
بپەڕێرەوە باوەشم
ئەم شەقامی ترس و مەرگە ببڕە
بی ئۆقرەم
بۆت داگیر ساووم
ئەم تاریکی شەوە زەنگە ببڕە
لە مێژەوە نازدارێکی ئاشنا
ئەم شەقامەی نەبڕیوە
لە مێژەوە ئەم شەقامە
هەنگاوی پێغەمبەرێکی نەدیوە.

***

لەو دیو شیشی ئاسنینی وێستگەی ئەم شەقامەوە
گوێم لە گۆرانییە خۆشەکەتە
تیشکی هیوا
پەپوولەی سەر گۆناتە
کۆت بشکێنەو بچریکێنە
لە مێژەوە چەقۆی یەئس
جەرگی هەڵمەتی چنیوە
ئەم شەقامە گۆرانی لێ بزر بووە
ماشێنێکی تیژ ڕەوی شل
دێ
دەتشێلێ و
جێت دەهێڵێ

***

سبەی دایکت
دوو پرچ نیە قردێلەیان لێ بدا
ڕەشەباکەی سلێمانی گەمە ناکا
خۆر زیزەو چاو شارکێ ناکا
هەموو زمانیان شکاوە
لە خوێنت خۆیان وەرداوە

***

بەڵام سبەی
قوتابخانە دەکرێتەوە
شەقامیش ڕادەخرێتەوە
شلە ماشێنانی بێ خوو
دەشێ تاوانی تر بکەن
دەستانی تر بە بێ پرچ و

ڕەشەبای تر بەبێ قردێلە و
خۆریش لە چاو شارکێ بکەن



بۆ بەرگیبە پاڵەوانانەکەی شاری سنەی
پڕداستان سنەی خۆ ڕاگری خاوەن شیلانەها

## شیلانی سنە

دایکی شیلان
دوو پرچی بەردابووەوە
باوکیشی جووتێک سمێڵ و
شیلانیش جووتێک ڕوومەتی خەپەی
گۆشتن
قاپە ماستەکەی بەردەمی
(جامی تەراش)ی هەفتانەی باوکەکەی بوو
دەستی تەتەڵەی دەکردو
لە دەم و لووتی هەڵ دەسوو
دوو خوشکەکەی
بەدەم (بەساقە) و (بەقوربانە)وە
بۆ دەم و پلی ماستاوی
دەتریقانەوە
لە ناکاودا
تریقەکان
تێکەڵ بە هارەی بۆمبا بوون
خانووەکەو
چی تێدا بوون
وەکو مەرگ
ڕەش داگیرسان
بەڵام ماستی
دەم و پلە نەرمۆڵەکەی
گوڵە شیلان
هەر سپی بوو
وەکو هیوا
وەکو ئاشتی
وەکو ژیان.

**٣ی مارتی ١٩٨٠**

# ئەرنستی کورد*
# بۆ شەهید (ئەکرەمی حەپسە)

گیانە ئەکرەم
تۆ لە کارگەی شۆڕشان دا
کرێکارێکی جەسور بوی
لەناو کۆمەڵی ئینسان دا
باوەڕێکی پڕ لە نوور بوی
لە ملانێی دوژمناندا
توانایەکی بێ سنوور بووی
لە دیوانی کۆڵنەدان دا
لاپەڕەیەك شیعری سوور بووی
گیانە ئەکرەم
تۆ ئەمەندە ساکار نەبووی
تۆ کۆترێکی سپی بووی
بەڵام ڕۆژگار
تاپڕ بەدەستت ڕاو دەکرد
لە بەیانی تا ئێوارە
تۆ گیانێکی خێر نەدیو بووی
لەو ئاقارە
خێرت بۆ هاوڕێیان دەبرد
لە عێراقی کپ و ماتی بە خوێنی سوور شەتەك دا
لە کوردستان بەناچار- خەڵك فێری کوتەك دا
دڵدارێکی بەرگ سپی بووی
ڕێگەی خەنجەرت هەڵبژارد
لەسەر دیوی ڕاستی نووستی
بەرگە سپییەکەت ژەنگ گرتی
لەسەر دیوی چەپی نووستی
دیسانەوە هەر ژەنگ گرتی
ئەوسا زانیت، کانزای خەنجەر
هەربەڕواڵەت.. جەوهەرداری شۆخ و شەنگە
دەنا هەتا بینەقاقای مشتووەکەشی هەموو ژەنگە
ئەوسا زانیت، تۆ دڵدارێکی بێ چەکی
بەڵام هیوا بڕاو نەبووی
نەخێر گیانە نا هوشیار و بێچاو نەبووی
هەرگیز ئومێد بڕاو نەبووی
بێ ئەدرێس و بێ ناو نەبووی
بۆیە لە نێو دڵدارانە
دڵدارێکی خاوەن ئەزموون و دیوانە
بە پەیژەی سووری خەباتی کرێکاراندا هەڵزنای
بۆ خۆری ژان ڕەوێنەری کوردان
گەڕای
بۆ شاری بێ چەوساندنەوەی ئینسان
گەڕای
کووچەو شەقامت
بۆ هاوڕێیانت
کردە ئاگردان
(دە مەگری مەگری چاوانت ئێشێ)[1]

---

* ئەرنست: ئەرنست ئیڤەر هارد/ پاڵەوانی ڕۆمانی (پاژنە پۆڵاینەکان) (العقب الحديدية)ی جاك لندن.

[1] گۆرانییەکی فۆلکلۆرییە لە کاتی خواردنەوەدا حەزی لێ دەکرد و دەیووت..پێش خنکاندنیشی ووتی. هەموو جار خۆشناوی برام و هەمزەی عەلی دەدە بە نەرمی دەیان ووت ئەویش دەجووڵا.



بووە درووشمی هیوا نەبڕان

ئاوازت کردە هاوسەرو[٢]

ڕۆزات بۆ کورد پەروەردە کرد[٣]

سەنگەرت بۆ دوا ڕۆژ لێ داو[٤]

هانات بۆ گشت کارگەران برد

تا- ژەنگ لە خەنجەر بکەنەوە

تا-تووڵە ڕێ بیر بەرنەوە

سیستمێکی نوێ بۆ خەبات دانێنەوە

زۆر لە جاران مەردانە تر

تین بە شۆڕش بدەنەوە

بەڵام سەد داخ

هاوڕێ ئەکرەم

لە ووڵاتی ژێر پۆستاڵی ئاسنین دا

ڕاکشاو

تۆی ئەرنستی ناو کوردستان

وەك دیوانێك شیعری دڕاو

لە ئەڵقەی پەتی موسڵەوە[٥]

شۆڕبووویتەوە

هەتا باڵات گەیشتە فاو[٦]

هەتا گیانت چووە کۆڕی شەهیدانی هاوڕێمان و

بوونە هەتاو

ئەی هەتاوە پیرۆزەکە

خەمت نەبێ ئەم کاروانە

ڕاناگیرێ بە گێلە پیاو

هەردەم دەژی

هەردەم دەژی

هەردەم دەژی و بەردەوامە

---

[٢] ئاواز: ناوی هاوسەرەکەیەتی

[٣] ڕۆزا: ناوی کچەکەیەتی.

[٤] سەنگەر: ناوی کورەکەیەتی.

[٥] لە موسڵ لە سێدارە درا

[٦] فاو: خوارووی عێراق- ئەوێ و هۆرەکانی سەردەمێك شوێنی بزووتنەوەی چەکدارانەی حزبەکەی شەهید بوو.

# پەلکە زێڕینەش نامۆ مەکەن

پێشەکی:
دەست و پەنجەکانت نەڕزێ
وەك خاتونێك.. دەست درێژکە
ماچێکی نەرمە تیشکی
هەڵقووڵاوی پەنجەکانتم.. پێ ببەخشە
با ڕوخسەتی سەمایەکت
لیٚبخوازم
تا لە ناو هاوڕێکانم دا
بە هاوڕێ یەتیت
بنازم

## پەلکە زێڕینەش نامۆ دەبێ

یەکەم

تیشکێ
تۆ دەتزانی
پەلکە زێڕینەش نامۆ و بێدار دەبێ
تۆ دەتزانی
دەشت و چیا
هاوڕێیەتی دەفامن و
شەقام و کۆڵانیش، دڵدار دەبێ
تۆ دەتزانی
ڕێگاش بە پێچ و بەردو درەختی
کەناریەوە
هۆگری ڕێبوار دەبێ
بۆیە دەبوویتە
پەلکە زێڕینە و
بریندار دەبووی

***

تۆش دڵداری
لەگەڵ ناخ و دیوی دەری
هەموو بووەکانمان دەکەی
تۆش شەنە برژانگی نیگات
لە خەرمانی حەزمان دەدەی
تۆش شانە هەنگوینی دەستکەوت
بۆ هەنگی کارگەکان دەبەی
تۆش وەکو من
گۆرانی بۆ کوڕ و کیژی
دەست لە ملانی، جێ ژوان دەڵێی
تۆش وەکو من
بەرەو چاوەی عیشقی پیرۆز
هەنگاو دەنێی

***

ئەی تیشکە بریندارەکە
ئاوا نابم.. ئاوا مەبە
گۆرانی
باڵی خۆی هەیەو
نمە بارانی پاییزەش
تەڕی دەکا
سەما
لق و پۆپی هەیە و
کولووە بەفری زستانەشی
لەسەر دەڕوێ

گریان
کەزیەی خۆیی هەیەو
شنە بای وەشتی بەهاران
بۆی دادێنێ
خەندە
ساباتی خۆی هەیەو
شیعر دێت و هاوینان لە ژێریا
دەنوێ
نیشتمان
هەنگی خۆی هەیەو
بە هەنگوین دزەوە، دەدا
گەرچی دەیشزانێ
دەمرێ

***

دوای کازیوەی خەونەکانم
تیشکی بریندارێت و
من ڕازیم پێت
با تیشکێکی بریندار بی و
ئاوا نەبی
چونکە بێ تۆ:
بەفر لەسەر گیای سەر سنگ و سەروسیمام
دەبارێت و ناچێتەوە
چونکە بێ تۆ
ڕەشەبا لە بن نینۆکی پەنجەکانم
دەزێ و دەژی و گەورە دەبێ
ئەی تیشکە بریندارەکە
خۆشمان دەوێی.. ئاوا مەبە
گیانی من بێ تۆ:
داری بێ گەڵاو
خوشکی بێ براو
زەوی بێ گیایە
لێوی من بێ گۆرانیی تۆ..
هوزاری بێ دەنووک و
کۆتری بێ باڵ و
سۆفی بێ خوایە
ڕازیم پێت و ئاوا مەبە
چونکە بێ تۆ:
بەڵام هێشووی خەم دەگرێ
باڵایشتم لێ نزیک نییە
پەل و لاسک و لقەکانم
خۆی پێ بگرێ

***

دەست و پەنجەکانت نەرزێ
ئەو گوڵە مێخەکەم بۆ بدە
لەرەزی قژە خاوەکەی
ئەم شیعرەم بۆ بپرژێنە
لە گەردنە هەتاوەکەی
ئەم شیفۆنی سۆزەم بکە
بە پەردەی سەر کەژاوەکەی
دەست و پەنجەکانت نەرزێ
چەندە ناسک و نەرم و نیانن
کە باڵە فرەی ئاشتییە!
چەندە بەهێز و پڕ ووزەی گیانن
کە بەستەڵەکی
هەقە وەسێنی
دۆستی دۆستییە!
من لە بەردەم کەژاوەکەی
گلام و
چاوی پڕ نازی
شیرینەکەی
خۆمم
نەدی...
دەست و پەنجەکانت نەرزێ
بەو قەڵەمی تیشکی دەستت
لەسەر چیاکان بنووسە:
تا ـ سەگی هەوشار ڕاونەکەی
ئاگەیتەلای
شەمی ڕازاوەی ژێر دەوار
تا ـ لە ڕێی قەتاری شیرین
هەموو عەمرت، بە با نەدەی
ئاگەیتە لای کەژاوەکەی
چاو- ئاڕێژی
بە دیدەنی
پەلکە زێرینەی
باڵا لاوەکەی

***

کێ دەڵێ: چیا دڵی نییە!
کێ دەڵێ: چیا سنگی گەرم نییە!
کێ دەڵێ: بەیتی دڵداریی
دێهاتییێکانی بیر نییە!
کێ دەڵێ: ئەو پیر دەبێت و
عیشقی لەبیر دەچێتەوە!
من خۆم
پیرەمەگرونم دی
کۆرکم دی
قەندیلم دی
بووکی بەفریان لە ئامێزنا و
هێندەیان ماچ کرد و گوشی
هێندە چیرۆکی
عیشق و سووتانیان بۆ گێڕانەوە
هەتاوەکو توانەوە
هەتاوەکو بوونە ڕووبار
من خۆم دەم دی
من خۆم دەم بیست
گەرای ماسیی نوێیان دەبرد
بۆ ئەو گوندەی
خراوەتە ئەودیو دیواری
سەدەی بیست

***

**کاتێک بەرەو هەوار دەچی و**
**لە زمانی باران دەگەی**
**تیژ ڕەو دەبی**
**خەم .. جارێ تر**
**بەتۆزی پێی ئەسپەکەتدا**
**ناگاتەوە**
**قەڵبەزەی جۆگە خوڕڕەکانی ڕێ**
**لاسایی چوستیی**
**سواری پێکەی تۆ**
**دەکاتەوە**
**دارکاژی کەنار ڕێگاکان**
**کڕنووش دەبەن**
**بۆیاڵی هەڵچوو و**
**کلافەی کلکی**
**ئەسپە سپییێکەت**

دەگەیتە کەنار چیاکە
کۆشکە زەووت کراوەکەت
لە لوتکەیە
تاڤگەیەکی چوڕڕی سپیت
سەر بەرەوژوور
بەرەو لوتکە
هەڵ دەقوڵێت
تاوێرە بەرد
لێت دەدات و
دە گلێیە خوار
بەرەو بەندەن
بەلام
تۆ پشتی ئەسپ و
لۆقی ئەسپت پشتی زەوی
بەرنادەن
دەبیتەوە:
تاڤگە چوڕڕە سپییێکە
هەڵ دەقوڵێتەوە
سەر لەنوێ
بەرەو لوتکە

مارت ١٩٨٠

**پەلکە زێڕینەش نامۆ دەکەن!**

**-دووەم-**

**خاتوونێکی تەنیا**
**وا لە گیانما**
**دڵی کردووم بە ئاوێنە و**
**خەونەکانم بەشانە**
**سەدان ساڵە چاوەڕوانە:**
**کابرای پۆستە**
**نامەیەکی بۆ بهێنێ**
**لە دراوسێکانم وایە**
**ئەم خاتوونە تەنیایە**
**بەبێ هوودە چاوەڕێیە و**
**هەرگیز نامەی بۆ نایە!**

نامەکە لای کابرای پۆست-- ە
بەڵام گیانم
بەبێ ئاڵا و ناونیشانە
خاتوونێکی تەنیای تیایە
دڵی کردووم بە ئاوێنە و
خەونەکانم بەشانە
***

خاتوونێکی تەنیا
وا لە کۆشکی شیعرەکانما
کراسە ئاودامانەکەی بینایییمە
هیوای کردووم بە فەقیانە
بە سۆزم چاوی ڕشتووە
هەناسەی کردووم
بە مێخەك بەند و ڕێحانە
بە ڕاڕەوی کۆشکەکەدا
دێت و دەچێ
جار نەجارە، دڵم لە کەمەری
دەخشێ
لە دراوسێکانم وایە:
ئەم خاتوونە تەنیا یە
بەبێ هوودە چاوەڕێیە و
سوارەکەی ناگەڕێتەوە
سوارەکە.. نا
بەڵام ئەسپەکەی دێتەوە
لاوێکی خوێن گەرمی تر
سەر لە نوێ هەڵ دەگرێتەوە
ڕانك و چۆغەی زەردەخەنە
دەکا بەبەر دێڕەکانما
سەر بەخۆ..
خۆی دەکاتەوە بە ویژدانما
بۆ لای ئەو خانمە تەنیایەی
وا لە کۆشکی شیعرەکانما
***

ئەم خاتوونە:
ئەسپی گەواڵە هەورێکی قەنەووزی
بۆ سەفەرەکەی خواستووە
لە شاعیرێك
کە وەکو خۆی تەنیایە



ئەم خاتوونە:
تۆوی کچۆڵەیەکی چاو ڕەشی
لە داوێنایە
توێشووی سەفەری :
بۆنی هەناسەی دار گوێز و
قاسپەی.. چیایە
لە ناوەند جەنگەڵێك گورگا
بۆ مەزاری
کاذییێکی زیندوو.. وێڵە
خەڵکی دەڵێن: گورگ دەیخوا
بەڵام: نا
دەگاتە کانییێکەو
خۆی لێ دەشوا
کچۆڵەکەش

وەك چەپكێك كام
لە داوێنی دێتە خوارێ و
تێكەڵ دەریای ژیان دەبێ
باران:
بۆی دەبێ بە قوومات
نێرگز:
دەبێ بە گوارەیی و
خۆر:
بۆی دەبێ بە جۆلانە
پەلكە زێرینە:
قوربانی دەبێ و
خۆی بۆ دەكا بە، پاوانە
هەی باران بارانە
باران.. بارانە
شاعیر، ئەسپەكەی،
دەكا بە باربووی
ئەم كیژە جوانە

نیسانی ١٩٨٠

## چەكمەجە

كە تۆم لابووی، ئاسمان قوببەیێكی شینی
ئاوالا بوو.
خۆر دەرگا بوو..
كرایەوە و چوومە ناوەند جیهانێكی ئەفسانەیی:
شەقام دەڕوێ. گوڵ دەفڕی، درەختی جوانی پەمەیی
قۆڵیان دەكرد بە قۆڵم دا، وەك ئاشنای شیعرەكانم
یەكێك دەیووت:
بەیارمەتی، ئیمزایەكتم دەوێ لەسەر لقەكانم.
یەكێك دەیووت:
لە ژێر سێبەرما دانیشە، تۆی گەواڵە شیعری
گەشی بەهارم.
ئەوی تریان، ڕەگێكی خۆی دەردەهێنا
دەیووت:
بیبە، ئەمەیە ئەدرێسی پوستەو جێو مەكانم
لە پڕ ماڵ ئاواییت كردو كەڕۆیشتی
فڕێ یان دامەوە زەوی.
بینیم ئاسمان، دیوارێكی قەترانی‌یەو ئەستێرەكان
دەسكی چەكمەجەی هەنسكی
بۆ خەوی دیدار دەگەڕام
هەركامیان ڕادەكێشا
دڵێكی تیا بوو.. دەئێشا.

١٩٨٧/١٢/٧



## نموونەی وتارو لێکۆڵینەوە

# ئەو گیاندارە گوناهەی ناوی ئەدەبی کوردییە

شەوێك لەم شەوە پاییزانەیەی شاری سلێمانیدا، رازێك لە دڵمدا چەکەرەیکرد، شیعر نووسی کورد زۆر بەختەوەرو زۆر کڵۆڵیشن.

شیعرنووسی وڵاتانی تر، دەردەکەی (سیزیف) بە دەست شیعرەوە دەچێژن و ئینجا چەند دێرێکیان لە رۆژنامە یان گۆڤارێکدا بۆ بڵاودەکەنەوە.

هەر لەگەڵ بەرچاوی خوێندەواران کەوت، ئیتر وەك کارەساتێکی مەزن روویدابێت و دۆست و هاورێ و ناسیاوان " پەیتا پەیتا تەلەفۆنی بۆ دەکەن و دەچنە لای بۆ پیرۆزبایی. نووسەرەکەش هێندەی تر هەست بە لێپرسینەوە دەکاو گوێ بۆ ئامۆژگاری و رێنمایی و سەرنجی شارەزایان و لە خۆی پێشتر رادەگرێت، باوەش بۆ هەموو رەخنەیەك دەکاتەوە تا وەك پەیژە بەوانەدا سەربکەوێت و خۆی بپارێزێت لە کەوتن و خلیسکان. خاکی تر دەبێت و ساکار خۆی دەنوێنێت و هەوڵدەدات خۆی پێبگەیەنێت.

هەتا بتوانێت بەردەوام سەرکەوتن و شادی و رێزی خۆی بپارێزێت. هەتا بتوانێت شاهیدی سەردەم و هاوبەشی بیرو ویژدان و سۆزی گەلەکەی بێت.

تەنانەت لە یەکێك لە گفتوگۆکانماندا" مامۆستام مارف خەزنەدار" وای بۆ باسکردم کە گەلێك لە رۆژنامانی وڵاتانی یەکگرتووی سۆڤێت، بەرێوەبەرانی ئەو رۆژنامانە خۆیان ئاهەنگی پێناسین و پیرۆزبایی رێکدەخەن بۆ ئەوانەی بۆ یەکەم جار بەرهەمیان بڵاودەکرێتەوە.

کەچی لای ئێمە: شەممە شیعرێك دەخوێنێتەوە، یەکشەممە دوو، سێ پێکی دەکات بە سەردا. دووشەممە.. خێسە لە دەوروبەری خۆی دەکات. سێشەممە لەبەرخۆیەوە قسەدەکات. چوارشەممە پێش ئەوەی قسەبکات ماسولکەکانی دەموچاوی دەهێنێت و دەبات" گوایە قسەکە دەجوێت" پاشان دەیکات. پێنج شەممە قەڵەم و کاغەز رادەکێشێت، شەست جگەرە دەکێشێت و شەش دێر شیعر دەنووسێت. هەینی کەس نەماوە بیناسێت و بۆی



نەخوێندبێتەوە. کە شەممەی ئایندە دێتەوە. لەناو برادەرانیدا خۆی گرژدەکات و گلەیی ئەوە دەکات کە گۆڤارو رۆژنامەکانمان شیعرەکانی بڵاوناکەنەوە. گلەیی لە دەوڵەتیش دەکات کە رێزی شاعیران ناگرێت.

دیارە، ئەوەی دەیبینین بڵاوکردنەوەی بەرهەم لە گۆڤارو رۆژنامەکانی ئێمەدا زۆر ئاسانە، بۆیە هەر مانگێك و دوو مانگ نابات، هیچ نەبێت نیوەی شیعرەکەی لە پۆستەی خوێندەوارانیدا بڵاودەبێتەوە، ئەگەر یەکسەر هەمووی بۆ بڵاونەکرابێتەوە، بە هۆی داوەتی بارێکەوە بۆ خاوەن رایان لە بڵاوکردنەوەدا، یان دیارییەکی باش.

ئینجا وەرە بیبینەوەو گوێی لێبگرە. خۆی فوودەوە، سنگی چەند گرێیەك هاتووەتە پێشەوە. لە هەر کوێیەك دابنیشێت قسە بە سەرپەرشتیی رۆژنامەو گۆڤارەکان دەڵێت، چونکە وشەیەکیان بۆ گۆریوە یان هەڵەیەکیان بۆ راستکردووەتەوە.

ئەم وای دەردەخات کە شیعرەکەی زۆر مەزنبووەو ئەو دەستکارییە تێکیداوە، جارجاریش لەبەرخۆیەوە بە فیزێکەوە دەڵێت:

-کاکە ناهێڵن لاوان پێبگەن، دوژمنایەتییان لەگەڵ شیعری نوێدا هەیە. ئەی چۆن..! کە نەهێڵن بە زۆرە..؟! خۆ بە زۆر نییە..!

لەبەرخۆمەوە ئەم دیمەنانەم دەهێنایە پێشچاو، نووسەری کوردم بە بەختەوەر دەبینی، لە ئاسانیی ناو دیتنەوەی خۆیدا، لە بەرهەم

بڵاوکردنەوەو کتێب چاپکردنیشدا. لە هەمان کاتدا کلۆڵییشم دەبینی، چونکە بەو ئاسانی ناو دیتنەوەو بەرهەم بڵاوکردنەوەیە ملی دەشکێت. تاکوتەرایان نەبێت.. هەتا سەر بڕناکەن. ئەو شێوە سانایە تووشی غرووریی دەکات. چاوی بەرپێی خۆی نابینێت. گوێ لە سەرنج و ڕەخنە ناگرێت و بە جۆرێك لە دژایەتیی دەزانێت. سێ-چوار کەس دەیناسن کەچی لاف بەناوبانگی و مەزنی لێدەدات.. لە بچووکترین وریاکردنەوەو ڕاوەشاندنیدا تووشی خۆخواردنەوەو نامۆیی و ڕەشبینی دەبێت. جگە لەوەی لە ناوەوە خۆی بە ئاراگۆن و مایکۆفسکی دێتە پێشچاو، بەڵام بە غەدرلێکراوی..

کاشکا وەك وڵاتانی شارستانی، لای ئێمەش ئەوەی بە ڕاستی نەی سەلماندایە کە شاعیرە یان نووسەرێکی بە توانایە، شتی بۆ بڵاونەکرایەتەوەو نەخەڵەتێنرایە، چونکە ئەوانە هەندێك هۆی کاتی پاڵیان پێوەدەنێت بنووسن. ئیتر ئەو هۆ کاتییە بیری سیاسیی خۆی بێت و بیەوێت دەریببڕێت و نووسینەکە بکا بە کەرەستەی خەباتەکەی، یان کۆمەڵایەتی بێت، وەك دڵداری، نووسینەکە بکات بە کەرەستەی خۆشەویستی.

ئەوەی یەکەم کە لە سیاسەتەکەدا قووڵبووەوە، یان وازی لێهێنا لە هەردوو حاڵەکەدا لە بەرهەم بەخشینی ئەدەبیدا کزدەبێت (لەبەر نەپەرژان) و وازدەهێنێت.

ئەوەی دووەمیشیان بگاتە دەستگیرانی یان وازی لێبهێنێت، لە هەردوو حاڵەکەدا واز لە مەسەلە ئەدەبییەکە دەهێنێت، مەگەر بە دەگمەن هەیانبێت بەردەوامبێت.

ئەوانە کە هۆ کاتییەکانیان نەماو وازیان هێنا، ئینجا بڕوانە حاڵیان کە دۆستان و خەڵکانی تر پێیان دەگەن و لەبەرەوڕوو بوونەوەدا لێیان دەپرسن:

–ئەرێ چییە.. هیچت دیارنییە..؟

–دەڵێی لێچوویتەوە..

–جەناب ئێوەش وشکتان کرد..؟

–هەر ئەوەندەو هیچی تر..؟ ،..تاد.

وا زاندەکەم تێکشکان و هەست بە ناسۆریکردن و هەست بە پلیشانەوەکردن ئەو ساتانەیە، ئەو ئەنجامە هەموو خۆشی و خۆ بادان و شانازییەکانی لە لووت دەردەهێنێتەوە.

پێویستە ئەوەش بڵێم: ئەم مەسەلەیەی لاوانمان و هەوڵدانیان بۆ ناوی خۆدیتنەوە. دەیەها هۆی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی هەیە، چ بۆ سەلماندنی خودی خۆو نەتەوە، چ بۆ.. بۆ.. تاد.

ئەم باسە شایانی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیە، شایانی نامەی دکتۆرا لەسەر نووسینیشە، چونکە هەروا ئاسان و ساکار نییە ، سەدەها لك و جەمسەرو گۆشەی هەیە، باخوێندەوار وانەزانێت" من بە گاڵتەجاڕی ئەم مەسەلەیە دەردەبڕم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

کاشکا لاوانمان ئەو وزەیەی خۆیان لە بواری تردا دەخستەگەڕ. کاشکا لێپرسراوی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش نەختێك دەستیان دابگرتایە.. بە مەرجێك پسپۆڕیی بابەتیی بەرهەمی لاوان هەڵبسەنگێنێت، چونکە لەو لاوانەدا، تیایاندا هەیە شایانی دەستگرتن و هاندان و پێشخستنە، گەرچی لە ژمارەی پەنجەی دەست تێناپەڕن. لە کاتێکدا لە ماوەی دوو مانگدا بە هۆی کۆمەکی هەندێك لە دۆست و برادەرانەوە سەرژمێرییەکی ئەو کەسانەم کرد کە خۆیان بە شاعیر دەزانن و شیعر دەنێرن بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان و لە پۆستەی خوێندەواراندا وەڵامیان دەدرێتەوە. واتا بەس ئەوانەیان کە جورئەت دەکەن بینێرن ژمارەیان دەگەیشتە (٣١٦) سێسەدو شانزە شیعر نووس، لە کاتێکدا ئەم گەلی کوردە هەمووی شەش شاعیری بیر پێشکەوتووی خێرخوازی هەبێت سەروزیادیەتی.

لە ئەنجامدا ئەوەم بۆ ڕوونبووەوە کە لەوان کلۆڵتر ئەو گیاندارە بێگوناهەیە کە ناوی (ئەدەبی کوردی)یەو (٣١٦) کەسی بە جورئەت داوادەکەن جڵەوگیری بن و خاوەن ماف بن بە سەرییەوە(*).

وا تێبگەم ئەم باسە سۆراخکردنی گەرەکە. چارەسەر بۆ دانانی پێویستە. ئەم ئەرکەش دەکەوێتە سەرشانی پسپۆڕان و لێپرسراوانی دەزگاکانی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەو تۆمارکردن.

وتارو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی هۆشیارکەرەوەو ڕێنماییکردنی پێویستە، بەڵام نەك وەکو ئەو چارو وتارانەی شەوێك لە شەوانی مانگی نۆیی ئەمساڵدا" گوێم لە ئیستگەی کوردیی بەغدا گرت، کەسێك داوای لە بەڕێوەبەری پرۆگرامێك کردبوو کە گۆشەیەك تەرخان بکات بۆ ئەوەی گوێگران فێری شیعر نووسین بکرێن، کەچی ئەویش پانەوپان لە وەڵامیدا وتی:

پێشنیارەکەت زۆر جوانە، داوا لە لێپرسراوان دەکەین ڕێگامان بدەن و جێبەجێی بکەین.

---

*دوای بڵاوبوونەوەی ئەم وتارە، لەهۆڵێکی شیعر خوێندنەوەدا، چەند لاوێك کەوتنە گفتوگۆو پرس. یەکێکیان زۆر بەگەرمی باسی ئەوەی دەکرد کەتەمەن هیچ گرنگ نییەو تاقیکردنەوەو کەڵەکەبوونی هیچ نییە، ئەوەتا مایکۆفسکی لەتەمەنێکی زۆر کەمەوە توانیی ئەوەو ئەوە بکات..تاد.

زۆری لەسەر ڕۆیشت، لاوەکانی تریش پشتیان گرتبوو، ناچارمام نەختێك توند پێی بڵێم:

لەهەموو وڵاتانی سۆڤێتدا، لەماوەی (٥٠) ساڵدا یەك مایکۆفسکی هەڵکەوت.. تۆ بڵێیت لەم کوردستانە بچکۆلەیەی عیراقدا (٣١٦) مایکۆفسکی هەڵبکەوێت..؟! ئەگەر وەها بێت دەبێت وڵاتەکەمان ناوبنێین: مەکینەی شاعیر هەڵهێن. ئەوسا بزانە شێخ ڕەزا وتەنی: دەبێتە چ حەشرێکی نێرەکەر لەم حوجرەدا.

## یاخیبوون و ئیلتیزام

چیرۆکی ئەم وتارە:

خوێنەری ئازیز

پێش ئەوەی بچینە لای وتاری (یاخیبوون و ئیلتیزام)، دەقە بلاوکراوەکەی لە گۆڤاری (بەیان)دا، تۆماربکەین، پێویستە چیرۆکەکەیتان بۆ باسبکەم، چونکە زۆر بە پێویستی دەزانم و سوودی زۆرە بۆ رۆژنامەگەریی کوردی و رەوتی رەخنەی کوردی، جگە لە حاڵەتی وەسیقەییەکەی خۆی.

لە بەهاری (١٩٧٤) بە دواوە، زۆربەی نووسەران لە گۆرەپانی نووسین و رۆژنامەگەریی کوردی دوورکەوتبوونەوە، ساردییەك گۆرەپانەکەی داگیرکرد. منیش لە پاییزی هەمان ساڵدا رەخنەیەکم دەربارەی دیوانی (تاریك و روون)ی هێمن-ی شاعیر نووسیبوو، لە پێنج ژمارەی (هاوکاری) دا بلاومکردنەوە، واتا بە پێنج ئەڵقە لە (١٩٧٤/١١/٢٢) تا (١٩٧٤/١٢/٢٠) ئەو زنجیرە وتارە گۆمە وەستاوەکەی شڵەقاندو بووە گێرمەو کێشەیەکی جەنجاڵ و گەلێك نووسەر هەڵیاندایە. زۆربەی هەرە زۆریشیان زۆر توندوتیژ دژم بوون. گرنگ ئەوە نەبوو، بەڵکە ئەوەبوو خوێندەواران رۆژی دەرچوونی رۆژنامەی (هاوکاری) لەبەر نامەخانەکان کۆدەبوونەوە تا بزانن من چیی تازەم وتووەو چ قسەیەکی تازەشم پێ وتراوە، بە تایبەتی ئەم حاڵە بە خێر گەرایەوە بۆ (هاوکاری) و فرۆشتنی زۆربوو. لێپرسراوی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی کوردیی (ئەوسا) جەمال بابان بوو، دانابوو لە بزواندنی چاپەمەنییەکانی دەزگای ناوبراودا. جار نەجارە هاتوچۆم دەکردو لەگەڵ نووسەران دا باش گونجابوو.. سروشتی کارەکەی خۆی چاك دەزانی.

مەسەلەی گێرمەو کێشەی وتاری ناوبراو تا شوباتی (١٩٧٥)ی خایاند، پاشان ناوبژیکراو نووسەرانی نوێ (واتا تازە داخلبوو بە مشتومرەکە) وتارەکانیان راگیرا لە بلاوکردنەوە دەنا سێ-چوار مانگێکی تریشی دەخایاند.

ئاش بەتاڵی هات بە سەردا. خەڵکی و نووسەران کاسی ئەو کارەساتە بوون. بازاری چاپەمەنی ساردبوو، رۆژێك لە رۆژانی مانگی پێنجی (١٩٧٥) بوو یان سەرەتای مانگی شەش بوو، بە تەواوی لە یادم نییە، کاك جەمال ناردی بە شوێنمدا، چوومە لای و کەوتینە گفتوگۆی ئەو بازار کەسادییەی چاپەمەنی، پاشان کە بینیی منیش لەو بە پەرۆشترم بۆ تین بەخشین و گەرمکردنەوەی، داوای لێکردم بە وتارێك یان هەر شتێك خۆم بە چاکی دەزانم فەرتەنەیەکی لەو جۆرەی فەرتەنەکەی تاریك و روونی ناو هاوکاری، لە گۆڤاری (بەیان )دا بۆ بنێمەوە، بەڵکە نووسەران هەڵ دەدەنێ و گەرمو گوری بکەوێتەوە گۆرەپانەکە.

پێشنیارەکەیم بە دڵبوو، وادەی دامێ بلاوی بکاتەوەو وادەم دایە بینووسم.

گەرامەوە شوێنی خۆم-ئەوسا کارم لە بەغدا بوو-بیرم لە خرۆشاندنی مەسەلەیەکی فیکری کردەوە. زۆری نەبرد بە شێوەیەکی ئیستیفزازی کە زۆر لایەن لەسەری بێنە جواب و مشتومرەکەی گەرم بێت، وتاری (یاخیبوون و ئیلتیزام)م نووسی. بردم و بۆ بەرێوەبەری دەزگام خوێندەوە. بیرمە وتی: با کاك حەمیدیش واتا (حەمید عەزیز) گوێی لێبێت. پاش خوێندنەوەی رایان وابوو کە توندوتیژەو دەشێت لەسەر من و لەسەر ئەوانیش بکەوێت.

تەنیا یەك برگەم لەبەرچاویان لێ دەستکاری کرد و وتم:

مەبەستی ئێمە راکێشانی نووسەرانە بۆ گفتوگۆ و گەرمکردنی گۆرەپانەکە، دەنا من مەبەستم نییە بکەوێت لەسەرم یان نەکەوێت، چونکە بە درێژایی ساڵەها خوێندەواران رای من دەزانن و بەرهەمی زۆری منیان دیوە، جگە لەوەی من خۆم دەزانم لەو وتارەدا چیم وتووە.

تەنانەت چاك بیرم دێت بە (حەمید عەزیز)م وت:

ئامادەم لە پێناوی ئیستیفزازکردنی نووسەرانداو هاندانیان بۆ نووسین گفتوگۆیەکی (بیزنتییانە) و (سەفسەتە) یان لەگەڵ بکەم.

سەیری لێهات..! وتی: چۆن..؟

وتم: حەزدەکەیت دەنووسم (باشترین ئیلتیزام، ئیلتیزامە بە بێ ئیلتیزامییەوە) دەستیان کرد بە پێکەنین، وتیان: سوعبەتەکە گەرم مەکە. بە هەرحاڵ وتار رۆیشت و لە ژمارە (٢٧)ی (بەیان)ی تەمموزی (١٩٧٥) دا بلاوبووەوە.

ئێستا دەقی وتارەکە بلاودەکەمەوە، بە پەراوێزی رۆشنکارییەوە، بۆ ئەوەی بە ناوی تێنەگەیشتنەوەو بە بیانووی پووچەوە پاشقول نەگیرێت و ترش و پیازی پێوە نەخورێت، خوێنەرانی هێژا ئەوە چیرۆکی نووسینی ئەم وتارەیە پاشان ئەوەشتان بۆ تۆماردەکەم کە (شاخ ژانگرتی.. کەچی مشکی بوو).

### دەقی وتاری یاخیبوون و ئیلتیزام

مرۆڤ لەو سەردەمە کۆنینەوە کە بۆ سوودی خۆی دەست و بیری بەکارهێناوەو لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا کەوتەگەر، پاشان بە گوێرەی قۆناغەکان، پێشکەوتنی خۆی گورج و گۆڵ ترکرد. تەنانەت کەوتە دەستکاریکردنی سروشت و گۆرینی ئەو سروشتە بۆ سوودی خۆی.

نزیکترین راستی کە دەستگیرمان بێت لەو مەسەلەیەدا (مەلەسەی نەشونماو پێشکەوتنی مرۆڤ-النشوء والإرتقاء) ئەوەیە کە مرۆڤ هەر شتێك لە هۆشیاری و وریاییەوە بیکات بۆ سوودی خۆیەتی و بەس.

تەنیا سوودی خۆی، ئیتر سوودەکەی زوو دەستگیربێت یان درەنگ، گرنگ ئەوەیە مەسەلەکە لە پێناوی سوودی خۆیدابێت.

بە گوێرەی بۆچوونی ئێستای مرۆڤ، دوو جۆر سوود هەیە:

یەکەمیان: سوودی گشتیی مرۆڤ. ئەم جۆرە سوودە مۆرکی چینایەتیی پێوە نییە، واتا لە سەرەتادا[١] هەموو چینەکانی مرۆڤ ئارەزووی دەکەن. ئەگەرچی لە ئەنجامدا دەچێتە خشتەی دووەمی سوودەکانەوە، واتا مۆرکی چینایەتی وەردەگرێت[٢].

دووەمیان: سوودی تایبەتیی مرۆڤ[٣]. ئەم جۆرە سوودەیان مۆرکی چینایەتیی بە زەقی پێوە دیارە، لەبەر ئەوە هەر لە سەرەتادا هەوردا دەبێتەوەو یەکسەر (ئەو چینەی سوودەکە تایبەتە بە خۆی) سوودەکە بنیات دەنێت، چینەکانی تریش کە سوودی ئەو چینە بنیاتنەرە[٤].. زەرەریانە. بەرهەڵستی دەکەن.

گرنگ ئەوەیە هەموو سوودێك[٥] لە خزمەتی مرۆڤدایە ئەگەر بە گشتی هەموو چینەکانی کۆمەڵمان مەبەست بێت و بە هەموویان بڵێین مرۆڤایەتیی ئەم زەمینە. مرۆڤ لەو سەردەمەوە، کە سەرمایەکەی جاریێ دەستی و ئەقڵی بوو، واتا لە ناو سروشتی ئەوسای زەمین و گەردووندا. هەرچی زادەی سروشتەکە بووبێت، مەرج نەبووە لەگەڵ سوودی ئەمدا گونجابێت، بۆ نموونە کانیاو تەقیوەتەوە، لەگەڵ سوودی ئەمدا بووە، بەڵام بروسکە سووتاندوویەتی لەگەڵ سوودی ئەمدا نەبووە. ئەوە لەلایەن سروشتەوە، بەڵام لەلایەن خۆیەوە، چی بە زادەی دەست و ئەقڵی خۆی کردبێت. لەگەڵ سوودی خۆیدا و لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا بووە. تەنانەت ئەگەر دەست و ئەقڵی کارێکیان کردبێت بە نییەتی سوود لێوەرگرتن لە ئەنجامدا زەرەری بووبێت. گرنگ ئەوەیە هەر بە سوود دەژمێردرێت. مادام سوودی ئەوەی لێوەرگرتووە جارێکی تر نەیکات، یان هەوڵبدات جارێکی تر ئەو بەشە خراپییەی تیادا نەهێڵێت" کە بووەتە هۆی زەرەرەکە.

کەواتە" چی زادەی دەست و ئەقڵی مرۆڤە" بۆ سوودی خۆی و لە پێناوی بەرژەوەندیی مرۆڤ خۆیدا بووە. بە گوێرەی ئەو قۆناغەی تیایدا ژیاوە، یان دەژی.

باسی قۆناغمان کرد، واتا سوودی مرۆڤ چ جۆری یەکەمیان و چ جۆری دووەمیان کە باسمان کردن، شتێکی نیسبییە، لە قۆناغێك تا قۆناغێکی تر، زیادو کەم دەکات، یان زایین و فەوتاندنی تیادا دەبێت.

بۆ نموونە لە قۆناغێکی ژیانی مرۆڤدا، باوەڕی ئایدیالی زا[٦]، وردە وردە وەك باوەڕی ئیسلامی لە سەرەتادا بنجی[٧] داکوتا، لەو قۆناغەو چەند قۆناغانەی ژیانی ئادەمیزاددا بۆ چارکردنی گەلێك مەسەلە سوودێکی زۆری هەبوو. ئیلتیزامکردن بەو باوەڕەوە لە بەرژەوەندیی مرۆڤدا بووە لەو قۆناغەدا، بەڵام ئایا کاتێك زانست پێشکەوت و فەیلەسووف و زانایانێکی دیاریکراو بە هۆی زانستەوە هەموو شتێکیان گەڕاندەوە سەر مادده، وە عەلمانییەت بەرپابوو.. ئایا بەرژەوەندییان بە گوێرەی قۆناغی نوێ لەو ئیلتیزامەدا مایەوە..؟ بێگومان نا، بەڵکە زیانی هەبوو. ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی مرۆڤی سست دەکرد.. ئەگەر هەموو ئەو خەڵکە وەك قیرو بنێشت بە ئیلتیزامەوە بنووسانایە[٨].

کەواتە لێرەدا یاخیبوون لەو ئیلتیزامە بووە پێویستییەکی مێژوویی، لە پێناوی پێشکەوتنی مرۆڤدا. واتا لە پێناوی سوودی مرۆڤدا.

تا ئێرە:

١-هەموو شتێك زادەی بیری مرۆڤ و دەستی مرۆڤ بێت، پێویستە لە پێناوی سوودی مرۆڤدا بێت و لە خزمەتی بەرژەوەندیی مرۆڤدا بێت.

٢-سوود، نیسبییەو بە گوێرەی قۆناغەکانی پێشکەوتنی مرۆڤ.. زیادی و کەمی و زایین و فەوتاندن بە خۆیەوە دەبینێت.

٣-"ئیلتیزام" نیسبییەو، پێویستە ئەمیش مادام زادەی مرۆڤ خۆیەتی و بۆ سوودی خۆی هاتووەتەکایەوە، شتێکی پەرستراو نەبێت و نەبێتە بەربەستکردنی پێشکەوتنی مرۆڤ. یەعنی نەبێتە هۆی زیانبەخشین بە مرۆڤ، بەڵکە گەر سوودی لێببینێ وەك هەر شتێکی کاتی بیگرێت[٩]، دەنا لە (زەرەرمەندیتی) دا تووڕی هەڵدا.

٤-یاخیبوون، لە هۆشیارییەوەو بە گوێرەی پێویستییەکانی مرۆڤ، مێژوو فەرزی دەکات و پێویستییەکی مێژووییشە. واتا ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی مرۆڤ دەیسەپێنێت بەسەر ئەوانەدا کە

---

١-لە سەرەتای تەمەنەوە تا مێردمنداڵی یان قۆناغی خۆ بەدەستهێنان.

٢-وەك قوتابییان، سەرەتا چین و توێژی هەمەجۆرن، بەڵام کە پێدەگەن و دەکەونە کۆڕی ژیانەوە، کاسب یان فەرمانبەر دەبن، ئەوسا ئینتیمای چینایەتییان بە دیاردەکەوێت.

٣-بۆیە تایبەتی پێ دەڵێم، چونکە بە بڕوای من کە مەسەلەکە (لە هۆشیارییەوە دەبێت) وەك لە سەرەتادا لێی دووام. مرۆڤ لە چینەکەی خۆی تەجرید ناکرێت و هەر بەرژەوەندییەکی چینایەتیی هەبێت لە هەمان کاتدا بەرژەوەندیی تایبەتییشی بۆ خودی خۆی دادەنێت.

٤-مەعلوومە کە چینی بنیاتنەر (کرێکاران) و لە زێدەبایی ئەرکی ئەوان چینانی بەرەوژوور دەخۆن و پشوودەدەن و ژین ناوریشمین دەبن.

٥-مەبەست لە هەردوو سوودی باسکراوە-لە پەرەگراف پێشتردا-واتا سوودی گشتی و سوودی تایبەتی. تا خوێندەواری ساکار خراپ تێی نەگات، ئەگەرچی لە باری چینایەتییشەوە لەوەوبەر باسمان کردوون.

٦-مەبەستمان لە هەموو جۆرو قاڵب و ناوەکانی باوەڕی ئایدیالییە لە مێژووی ئەشونمای بیری مرۆڤدا، نەك هەر تەنیا یەکێکیان.

٧-چونکە لەو قۆناغی جەهالەتەدا، پێشکەوتنخوازی خۆی سەلماند، لە کچ زیندە بەچاڵکردنەوە. لە کێویەتییەوە بۆ شارستانێتییەکی بەرفراوان. شارستانیی ئیسلامی.

٨-ئاشکرایە لەم بەشەدا مەبەستمان لە ئیلتیزام، ئیلتیزامی فەلسەفییە، نەك ئیلتیزامی شەپۆل و ئیتیجاهاتی جۆر بە جۆری فەلسەفەیەکی دیاریکراو، یان پارتێکی مەعلوومە.

٩-ئاشکرایە مەبەست لە (کاتی) لێرەدا (قۆناغی)یە، پێشتر باسکراوە.

هۆشیارو چاوکراوەن و هەردەم لەو نوێیانە دەگەڕێن کە سوودی زیاتری مرۆڤی تێدایە.

٥-کە ئیلتیزام نیسبی بوو، واتا قاووغێکی نەگۆڕراو (ثابت) نەبوو، مرۆڤیش شلە نییەو بچێتە ناوییەوە تا بە گوێرەی قەوارەی ئەو قاووغە دەقبگرێت و نەگۆڕرێت، بەڵکە مرۆڤ روبارێکە هەردەم دەڕواو دەگۆڕێت و لکی لێ جوودا دەبێتەوە، هەروەها لکی نوێی دێتە سەر[١٠].

***

بە بڕوای من ئەوە راستیی ئەو کێشەیەیە" کە لەساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩)وە تا ئێستا گۆڤارو رۆژنامەو کتێبە کوردی و عەرەبییەکان لەم عیراقەو لە دەرەوەی ئەم عیراقە پێوەی خەریکبوون. هەریەکە بەلایەکدا رایدەکێشێت و هەر کۆڕو کۆمەڵە بۆ بەرژەوەندیی خۆی بە جۆرێك لەسەر سفرەی رۆژنامەو گۆڤارەکان رایدەخات. دەنا وەك من لێی حاڵیبووم و ئەگەر لێم بپرسن ئیلتیزام بە چی تێگەیشتوویت..؟ دەڵێم:

ئیلتیزام ئەوەیە" راستگۆبیت لەگەڵ ناخی خۆتداو شتێك نەڵێیت کە باوەڕت پێی نەبێت و کارێك نەکەیت کە بزانیت سوودی مرۆڤی تێدا نییە.

ئینجا بۆ مەسەلەی یاخیبوونەکە" یاخیبوون بە پێویستیی ئەم سەردەمە گورج و گۆڵە دەزانم.



١٠-پێویست بوو وتارەکە لێرەدا دوایی بێت، بەڵام دوای ئەوەی سەرنجی خوێنەرانم بۆ چیرۆکی ئەم وتارە راکێشا، هەستدەکەن کە لەمە بە دواوە، شێوەی ئیستیفزازو شەڕفرۆشتنم بەکارهێناوە.

ئەم سەردەمەی کە پێشکەوتنی مرۆڤ ئەوەندە خێرا بووە، ئەمڕۆی.. دوێنێکەی رەتدەکاتەوەو پێویستە سبەینێ.. ئەمڕۆی رەتبکاتەوە..

بە بڕوای من" ئەم سەردەمە، سەردەمی رەتکردنەوەو یاخیبوونی بەردەوامە لە هەموو کۆن و رزیوو.. بێکەڵك و.. بۆنکردوو و سستێك، کە وزەیان تێدا نەماوە.

ئەم سەردەمە سەردەمی توحەفیات کۆکردنەوە نییە، میللەتێکی نەگبەتی وەك ئێمە هێشتا ئەلفوبێ نازانین کەچی خەریکی کۆکردنەوەی فۆلکلۆرین، وەك هیچ نەمابێت و ئیتر هەموو پێویستییەکانی ئەم سەردەمەمان جێبەجێکردبێت[١١].

نەهامەتیی میللەتەکەی ئێمە لەوەدایە کە هێشتا گوندەکانی کوردستان بەخەنجەر گێرەدەکەن، کەچی رۆشنبیرانمان دەچن وێنەی دەگرن، لەبەرئەوەی فۆلکلۆرەو نەفەوتێت. وەك جووتیارە کوردەکان ئەمەندە پێشکەوتبن، پێویستییان بە سروشتیش نەمابێت و خاوەنی ئامێری بارانی دەستکردبن.

خوێنەری خۆشەویست.. ئەمەش مەسەلەیەکە پێویستیی بە گفت و لفت هەیە. ئەگەر بەستەری مێشکی رۆشنبیرانمانی پێ بتوێتەوە.

ئەوەندە بزانن ئەم سەردەمە، سەردەمی لاقاوی غەزەبە لەکۆنینە. سەردەمی یاخیبوون و رەتکردنەوەیە. سەردەمێکە ئەگەر (کورەکەم) منی باوکی رەت نەکردەوە" بە یاخیبووی راستەقینەی مەزانە. بە رۆشنبیری چەرخی خۆی مەزانە، بیخەرە جامخانەی مۆزەخانەوە.

***

### دوای بڵاوکردنەوە چی روویدا..؟

کۆمەڵێك وتار لە وەڵامی ئەو وتارەمدا بۆ رۆژنامەی هەفتانەی (بیری نوێ) چوو بوو. وەك کاتی خۆی هاوڕێیانی ئەوێ پێیان وتم" زۆربەی دژم بوون و هەندێکیشیان هەر بە جنێوی رووت وەڵامیان دابوومەوە. تا دەهات وتارەکان زۆرتر دەبوون، بەڵام بەڕێوەبەرانی ئەوێ ئەو دەرگای گفتوگۆیەیان نەکردەوەو لە یەکێك لە ژمارەکانی بیری نوێ دا وتیان" ببوورن کە ئەو وتارانە بڵاوناکەینەوە، تکامان وایە وەڵامەکانتان بۆ ئەو شوێنە بنێرن کە وتارە ئەسڵییەکەی لێ بڵاوکراوەتەوە، واتا بۆ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی.

---

١١-ئەمە یەکێکە لەو را ئیستیفزازییە ئاشکرایانە. زۆر زەق شوێنی گرتووە لە وتارەکەدا، چونکە کاتی نووسینی من خۆم سێ ساڵ بوو فۆلکلۆرم کۆدەکردەوە. جگە لەوەی لە هەموو محازەرەکانمدا لە بەشی کوردیی زانستگای سلێمانی (١٩٧٤) و لە بەشی کوردیی زانستگای بەغدا (١٩٧٥-١٩٧٦) گرنگیی زۆرم دەدا بە ئەدەبی فۆلکلۆرو هانی قوتابییانم دەدا دەربارەی.

بە وەڵامێکی لەو جۆرە خۆیان ڕزگارکردو بەرەوڕووی گۆڤاری (بەیان)یان کردنەوە.

دەزگای ناوبراویش کۆمەڵێکی زۆر وەڵامی بۆ هات. بە هەر سێ دیوی (جنێو، لایەنگیریکردن، ناوبژیکردن)، بەڵام گەلێکیان بە لایەنی مەسەلەی میتافیزیکی و ماتەری و کێشەی ئەو دوو فەلسەفەیەدا بە شێوەیەکی زەق یان نا بابەتی ڕایانکێشابوو. بۆیە بەڕێوەبەرانی (بەیان) سڵەمینەوە-لەو کاتەشدا ناهەقیان نەبوو.. کێوی ئەو هەموو وەڵامانە ژانگرتی و تەنیا یەك مشکی بوو..!

ئەوا بۆ مێژوو، بۆ ئاستی ڕەخنە، بۆ پلەی زانستی ئەوانەی خۆیان بە ڕەخنەگر دەزانن و دە مامۆستاییێنن بەسەر ئەدیبان و شاعیران و هونەرمەندانەوە. بۆ ویژدانی ئاستی ڕۆشنبیریی کوردی، پاشان بۆ هەناسە ساردیی دۆخی ڕۆژنامەگەریی کوردیی. ئەو تاکە وەڵامە کت و مت وەك خۆی دەقەکەی تۆماردەکەم.

دیارە لە شوێنی خۆیدا پەراوێزی وەڵامی خۆم یان سەرنجی ڕۆشنکاریی دەربارەی دەنووسم.

**ئاوارەبوون و غەزەلێك**

بە هەر کەسێك بڵێیت: (قەت لە دنیادا نەبوو..) خێرا بۆت تەواودەکات و دەڵێت: (بێجگە لە ناخۆشیی بەشم)

(مات و داماو پەشێوو بێ کەس و چارە ڕەشم) بۆیە زۆر بە پێویستم زانی لە ڕەخنەو لێکۆڵینەوەیەکی ساکاردا، ئەو غەزەلە نازدارەی (هێمنی کوردستانی) بگرمە ئامێز، بەڵام کام هێمن..؟

ئەگەرچی ڕاست نییە ڕەخنەگر نازناو بدات بە ڕەخنە لێگیراو، بەڵام لەبەر ئەوەی نازناوی (ئاوارەیی) ئەگەر نیشانێك بێت، خەڵکی کوردستان لە بەرۆکی مامۆستا هێمن زیاتر بە هیچ بەرۆکێکی تری ڕەوا نابینن. بۆیە لێرەدا، لە وەڵامی-کام هێمن-دا دەڵێم: شاعیرە ئاوارەکەی کوردستان، کە وتمان مامۆستا هێمن، مانای وتوومانە: ئاوارە بوونێکی بەردەوام. دەربەدەرییەکی درێژخایەن، کۆمەڵێك ئازاری دەوران دیتوو. وزەیەکی لە بن نەهاتوو، هیوایەکی ڕەگ داکوتاوو دڵێکی هەمیشە گەش[١٢].

یەکێك لە هەلە گرانبەهاکانی ژیان، ناساندمی بە مامۆستای خۆشەویستم، دوای ئەوەی وەك دۆستێك ناسیم و لە دڵی نزیك بوومەوە، تێگەییم مامۆستا (مەبەست هێمن-ە). تەنیا[١٣]:

---

١٢-با ئاگاداربین (دڵی گەش) مەبەستی دڵی پڕ هیوا دەگەیەنێت با خاوەنەکەی دڵخۆشیش نەبێت، (دڵی خۆش) جیاوازە، چونکە ئەو برادەرە کوردی زانانە وایان دایە قەڵەم.

١٣-ئاگاداری وشەی (تەنیا)بن، کە تەنیا شاعیری زرم و کوت و سیاسەت نییە، بەڵکە شاعیری غەزەل و وەسف و دڵداری و .. تا دواییشە. واتا من نەفیی ئەوەم نەکردووە کە هێمن شاعیری نەتەوایەتی و شیعر نووسی سیاسی نییە، بەڵکە وتوومە: تەنیا هی ئەوەیان نییە. هی ئەمەشیانە. کەچی کردیان بەو هەرایەو لنگەو قووچ ڕایەکانی خۆمیان پێ دەفرۆشتمەوە.

"گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن"

"قەت لە دەست ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن"

نییە، بەڵکو پەپوولەیەکی هەست ناسکی شەیداو دڵدارە. بە لێوی: جوان و شیرین و نازداری" نازدارانی ئەم کوردستانە جوانەوە.

لە دێرەکانی دامێن دا هەوڵدەدەین، شاعیرە عاشق و ئاوارەکەی کوردستانی ئێران، لە غەزەلی فرمێسکی گەشدا ببینین.

جۆری کاتی دانانی غەزەلەکە:

لە ڕۆژانێکی ساڵی (١٩٤٨)، شاعیر دەست بەسەر بووە، لە گوندێك بە ناوی (شیلاناوێ) سەرەڕای هەموو ئازارەکانی ساڵی (١٩٤٧)[١٤]، لە کۆمەڵێك ئازاری تریشدا ژیاوە "وەکو لە خۆیم بیست" تەنانەت چوونێکی بۆ باخچەو کێڵگەکانی دەرەوەی گوندی شیلاناوێ، وای پێویست کردووە کە چەندین کەس بە گەواهی بگیرێت و ئاگاداری بن، کە دێتەوەو تووشی هەرایەکیان ناکات.

لەو بارە نالەبارەدا، ئەم غەزەلە دروستبووە، کە هەموو سەربەستییەکی شاعیر، بەندی چەندەها ڕست زنجیر بووە، واتا: ئەو کاتەی ئەم غەزەلەی داناوە، تەنگانەترین کاتی دوای نالەبارترین چورتم بووە[٢].

کەچی وەك دەبینین، ئەو هەموو ژان و ئازارانە کارناکەنە سەر ئومێدی شاعیرو باوەڕو توانای نا لەقێنن، هیچ تەڵزمێك لە درەختی بڕواو هیوای شاعیر نەبووەتەوەو ڕەشبین نییە، بە پێچەوانەوە هاوار دەکات.

کوشتمی و شەشخانی ئومێدی لە من گرتن حەریف

---

(١٤) و (٢)-وەك لە ڕستەکاندا دیارە، بە ئاشکرایی ئیشارەتم بۆ بارودۆخی بابەتی-ئەو سەردەمی دانانی شیعرە کردووە. کە ڕووخاندنی کۆماری مەهابادەو ئەو چورتمە گەورەیەیە کە تووشی نەتەوەی کورد بووە. کەچی برادەر کەریمی حوسامی زیاد لە ئەڵقەیەکی ڕۆژنامەی هاوکاریی بۆ ئەوە تەرخان کرد، کە تێم بگەیەنێت ئەو مێژووانە یانی چی..؟ ناوبراو هێندەش غەشیم و جاهیل نییە لە کوردی تێ نەگات. وەلێ لە-ژێر پەردەی وەڵامی من و تێگەیاندنی منەوە، پروپاگەندەیەکی خەست و خۆڵی بۆ پارتەکەی کرد. لە خوێندەوارانی ساکاریشی گەیاند کە من بێ خەبەرم لە مێژووی ئەشونمای هۆشیاریی نەتەوەکەم.

٣-لای تاوڵەچییان باوە، کە کەسێك شەشخانی لێ دەگیرێت دەڵێن: ئا تەزبیحێکی بدەنێ، واتا با خۆی مەشغووڵ بکات، چونکە ئیتر نابێت دەست لە زارەکەوە بدات، بەڵام ئەمە تاوڵە نییەو شیعرە.

شەشخانی تەختە تاوڵە پوول نییەو شەشخانی-ئومێد-ە. بۆیە شاعیر بۆی هەیە دەست لە زارەوە بدات، واتا مۆر (زار) هەڵبدات. بە تەمای دوو شەشێکیش بێت کە لە دوو شەشی مۆر گەورەترە و دەشێت ڕزگاری بکات. لە پەرەگراف ناو وتارەکەمدا دەربارەی ئەو بەیتە بە ڕەوانی ئەم بۆچوون و ڕایەی خۆم نووسیوە. با شاعیر بێهودەیی بڕوانێتە یارییەکە، بەڵام مادام دەستی دەگاتە زارو هەڵیدەدات، مانای ئەوەیە لە ئاسۆدا بە تەمایترووسکەی هیوایەك هەیە.

دەشێت ئەمەی لە (سیزیف)ی (کامۆ) وە وەرگرتبێت. مادام ئەویش دەتوانێت بەردە گلۆربووەکە هەڵبگرێتەوەو قاچی لە سنگی چیا گیربکاتەوەو بە هەورازدا بەرەو لووتکە سەر لە نوێ بڕواتەوە.

مۆرە هەڵداوێم و بێ هودە، بە تەمای دووشەشم[٣]

کێش و قافیەی غەزەلەکە:

غەزەلەکە لە نۆ بەیت پێکهاتووە، قافییەکەی (شم)ـە، کە بە کۆمەڵێك بزوێنی وەك (ـە) بەستراوە بە پاشکۆی دێرەکانەوە. شاعیر لە پێناوی پاراستنی رێك و راستیی قافییەکە، ئامادە بووە هەردوو وشەی "مەهوەشم-وەك مانگ"، "قەرقەشم-گیروگرفت" بەکاربهێنێت، با کوردییش نەبن.

کێشەکەی بە گوێرەی "سیلاب-کەرت"ـی کوردی، (١٥) کەرتە، بە گوێرەی عەرووزی عەرەبی: بەحری-کامیل-ەو لە: (موتەفاعیلون، موتەفاعیلون، موتەفاعیلو) پێکهاتووە.

غەزەلەکە بە گشتی:

لە بەیتی یەکەمدا، شاعیر خۆی پێشکەشی خوێنەواران دەکات کە لە چ حاڵێك دا رێبواری ئەم دنیایەیە:

قەت لە دنیادا نەبوو، بێجگە لە ناخۆشیی بەشم

مات و داماوو پەشێوو بێ کەس و چارە رەشم[١٥]

وەسفی گۆرانی ئەمر دەکەین گوایێ توانیوێتی لە (بەیتێك)دا، پێنج سیفەت و مەوسووف کۆبکاتەوە "قژکاڵی، لێوئاڵی، پرشنگی نیگا کاڵی، کچی جوان، سەر گۆنا نەختێ ئاڵ" بۆیە لێرەدا من زۆر بە ئاسانی بۆم هەیە بڵێم: مامۆستا "هێمن" لە (نیو بەیت)دا پێنجی کۆکردووەتەوە، ماتی، داماوی، پەشێوی، بێ کەسی، چارە رەشی"[١٦].

بە جیاوازیی ئەوەی گۆران بۆ (جوانە بێ ناوەکەی)و ئەم بۆ ئاوارەییەتیی خۆی بووە، دیوی ناوەوەی ناخێکی لێدراوی برینداره، نەك دیوی دەرەوەی جوانێکی بینراو.

لە بەیتی دووەمدا، شاعیر ژیانی خۆیمان بۆ دەکات بە دوو بەشەوە:

سەردەمێك ئاوارە بووم و ماوەکیش دەس بەسەر

قەت نەم دی رووی ئاسوودەگی هەر تووشی گێرەو قەرقەشم[١٧]

ئەو بەشەی سەربەست بووە، تەنها بەوە سەربەست بووە کە دوور بووە لە دەستی پاسەوانەکان، دەنا راکردوو و ئاوارەو وێڵ بووە. تا چنگ دڕندە کۆنەپەرستەکان نەکەوێت، ئەو بەشەی تریان کە تیایدا راکردوو و نەبووە، دەست بەسەر بووە لە شوێنێکدا، تەنانەت ژمارەی هەناسەکانی جێی شك و راپۆرت لەسەر نووسین بووە، دیارە کە ئاسوودەیی لە هیچ بەشێکیاندا چنگ ناکەوێت.

لە هەردوو بەیتی سێیەم و چوارەمدا، دەستووری هەموو غەزەلێکی کلاسیکی، لەسەر باسی حاڵی خۆی دەڕوات:

دابی کوردی وایە: کەس لاگیری لێ قەوماو نییە

بۆچی سەرکۆنەی بکەم، لێم زیزە یاری مەهوەشم

تیغی بێ مەیلی و جەفای ئەو نازەنینە دڵڕەقە

جەرگی لەتکردووم بە جاریّ، ئەنجنیویە سینەشم

بەڵام لە بەیتی پێنجەمدا، وەك لە پێشەوە وتم، سەرەڕای هەموو ئازارەکانی، کە وەك گرتنی شەش خانی ئومێدەو بە گوێرەی (تاوڵە) تەنانەت دوو شەشیش رزگاری ناکات[١٨]. ئەم بە پێچەوانەی شاعیرە کلاسیکییەکانی پێش خۆیەوە، گرتنی شەشخانی بە نموونەی نا ئومێدیی بەکار نەهێناوە، بەڵکو ئەم دەڵێت: ئەگەرچی هێنانی دوو شەش بێ هودەیە، بەڵام من هەر بە تەمابم، وەك بڵێت: لە زارەکەدا لە دووشەش زیاتر خەڵق دەکەم، بۆ رزگاربوونم، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئەوپەڕی هیوابوونە بە دواڕۆژ..

کوشتمی و شەش خانی ئومێدی لە من گرتن حەریف

مۆرە هەڵداوێم و بێ هودە بە تەمای دوو شەشم[١٩]

ڕەنگە یەکێك کە ئەم هیوا زۆرە دەبینێت، شك بکات لەوەی شاعیر خاوەنی ئازارو خەمی خۆی و کوردستانەکەی بێت. وەك شاعیر بەم شکەی زانیبێت، بە شێوەیەکی سەلیقەیی دەگەڕێتەوە سەر باسی خەمەکانی و دەڵێت: ئەو خەمەی من خاوەنیم، ئەگەر دابەشی بکەم بەسەر هەموو خەڵکی شاردا بێگومانبە لەوەی ئیتر

---

١٥-لە وەڵامدا ئیشارەتیان بۆ ئەوە کردبوو کە ئەم غەزەلەم لە حەسەن زیرەك وەرگرتووە دەنا ئەو (قەت)ـەی سەرەتای لەگەڵ نییە. لە وتارانی دوای ئەمەدا، کاتی خۆی نووسیم کە بە خەتی هێمن خۆی لەلامە. ئەوە هیچ، بەڵام ئایا بە بێ ئەو-قەت-ە شیعرەکە لەنگ نییە..؟

١٦-لە وەڵامی ئەو رستەیەمدا وتیان: هیچ گرنگ نییە، چونکە ئەو پێنج سیفەتە هەمووی یەکەو هی حاڵەتێکی تایبەتیی کەسێکە.

بەو تەرازووە چەرمینەی ئەوان دەشێت منیش بڵێم: ئەوەی گۆران-یش گرنگ نییە، چونکە هەمووی یەکەو وەسفی سیمای کچێکە، هەمووی یەکەو هی جوانیەتیی تایبەتیی کەسێکە، بەڵام ئایا ئەدەب و هونەر وەها جەڵەبی هەڵدەسەنگێندرێت..؟

١٧-ئەم رەخنەیەیان لە جێی خۆیدا بوو، کە (قەت)ـی سەرەتای نیوەی دووەمی بەیتەکە زیادەیە، چونکە با هێمن بە دەست و خەتی خۆی شیعرەکەی بۆ من نووسیبێت و پێشکەشی کردبم، دەبوو بە سەرمدا تێنەپەڕێت و بمزانیایە کە ئەو (قەت)ـە زیادەو دێڕە شیعرەکە لە ڕەوتی کێشەکە دەردەکات و دەیکاتە (١٦) کەرت لەبریی (١٥).

١٨-زۆر بە ئەدەبەوە لە وەڵامدا بۆیان نووسیبووم کە: من نەك ئەدیب و شاعیر نیم، بەڵکە لە تاوڵەش نازانم، بۆ..؟ چونکە نەمزانیوە کە شەش خان گیرا دوو شەشیش بە فریای ناکەوێت..!!

١٩-وەك لە پێشەوە لە پەراوێزدا نووسیم: من وەها بۆ مانای ئەم بەیتە دەچم، ئەگەر مەسەلەکە سیزیفیش بێت، لەو بێ هودەییەشدا تروسکەی ئومێدو هیوایەکی نادیار بەدی دەکەم. لە ئەنجامی شیکردنەوەیدا، ئەو بەیتە بە نموونەی هیوابوونێکی زۆر دەزانم. دیارە باسی شیعر دەکەم، نەك تاوڵە.

کەسیان دەرفەتی نەك پێکەنین، بەڵکە زەردەخەنەشیان نابێت و خەندە نابینی لەسەر لێوی کەسیان. واتا: خەمی من ئەوەندەیە هەموویان توانای هەڵگرتنیان نەبێت.

زەردە نابینی لەسەر لێوی کەسێ لەم شارەدا
گەر خەم و دەردی دڵی خۆمیان بەسەردا، دابەشم
کەواتە:
خۆشەویستی گۆشەکەی تەنیایی هەر ئەژنۆ کەمە
بۆیە ڕۆژو شەو، وەها گرتوومەتە ناو باوەشم

دیارە لەو کاتانەدا کە ڕژێمێکی کۆنەپەرست و ڕزیو" ئازادیخوازێك دەست بەسەر دەکات لە کونجێکدا، بەڕێوەبەرانی ئەو ڕژێمە، خۆشییان لێدێت، ئەو کەسە بە ڕەنگ زەردی و ڕووخاوی و بێ وزەیی و کەم باوەڕی ببینن. شاعیر بۆ بەربەرەکانیی ئەم ئاواتە لە دڵی یاساوڵەکاندا، دیمەنێکی شیعریی زۆر نایاب و پوختەو نازك بەکاردێنێت. کە بۆ نەهێشتنی زەردە بەسەر ڕوویەوە، سوپاسی فرمێسکە خوێناوی و گەشەکانی دەکات، کە دەم-دەم بە فرمێسکی ئاڵ ڕووە زەردەکەی ئارایشت دەکەن و نایەڵن دوشمن هەست بە زەردیی ڕووی بکەن و پێکەنینیان پێی بێت.

نایەڵێ دوشمن بە ڕەنگە زەردەکەی من پێبکەنێ
تا دەمی مردن ئەمن، مەمنوونی فرمێسکی گەشم

لە دوا بەیتدا، بە سۆزێکەوە دڵسۆزیی خۆی بەیان دەکات و لە بۆتەی خەباتدا، خۆی بە زێڕێکی بێ خەوش دەزانێت، کە پێویست بە تاقیکردنەوەو محەك لێدان ناکات. ڕەنگە زۆرتری ئەمەی بۆ ئەوە گوتبێت کە هەبووبێت بە چاوی شکەوە تێی ڕوانیبێت.

دەڵێم ڕەنگە[٢٠]، ئەگینا بە ڕای من: شاعیر-ڕژێمێکی-کوردی- دەست بە سەری نەکردووە تا بڵێت:

"کوردە موحتاجی محەك نیم"

شاعیرێکی ڕاست و یەك ڕووم و فیداکارو نەبەز
کوردە موحتاجی محەك نیم.. زێڕی بێ غەلل و غەشم

وەك لە باسەکەی ڕابردوومانـدا دەرکەوت و ساڵی وتنی (١٩٤٨)ـە، ئەم غەزەلە سەر بە قوتابخانەی کلاسیکیی نوێیە.

هیوادارم ئەوەندە بەس بێت و ئەم باسەش وەك سەرباسی- غەزەلێکی نایاب-قبووڵ بکرێت[٢١].

خوێنەری ئازیز.. ئەو وتارەی من (شل و شەوێقەو پەسەندکردن و بە باڵا بڕینە)، بەڵام هەر لە هەمان وتاردا کەوا بە من وتراوە، وتەر کەکەریمی حوسامی یە خۆی ئەم مەدحانەی بۆ هێمن نووسیوە. ئەوانەی خۆی.. بە پەسەندکردن و بە باڵا بڕین و تاریفی نابەجێ دانەناوە. ئەمەش دەقی ستایشەکەی خۆی بۆ هێمن:

"دەتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم لە بارەی کێش و قافییەوە. کەم شاعیری کورد، گەیاندوویەتییە شاعیری بەرزی ئێمە هێمن کوردستانی"..

"مامۆستا هێمن شیعری بەرزو تەڕو پاراوی هەیە، کە لەگەڵ شیعری شاعیرە مەزنەکانی دنیا بەرامبەری دەکەن و بە ڕاستی جێگای شانازین".

تیپە گۆڕکێی وشە لە زمانی کوردیدا

هەر وەك هەندێك لە زمانانی تر، لە زمانی کوردییشدا هەندێك وشە هەن، بە دوو جۆر دەوترێن، جۆری وتنەکەی، مەبەستمان لەوەیە، کە بە دوو شێوە تیپەکانی ئەو وشەیە پاش و پێش و جێ گۆڕکێ دەکەن لە ناو خۆیان دا.

لە زمانی عەرەبیش دا، ئاگاداری ئەوە هەم، کە ئەم تیپە گۆڕکێ یە هەیەو بنکەی گراماتیکیی تایبەتییان بۆ داناوەو پێی دەڵێن: (إعلال، إبدال، قلب).

بۆ نموونە: ئەگەر وشەیەك تیپێکی لێ لابرابێت و تیپێکی تری خرابێتە جێ، پێی دەڵێن: ئیعلال.

ئەگەر وشەیەك تیپێك یان زیاتری لابرابێت و تیپی تر جێیانی گرتبێت، ئەوە پێی دەڵێن: ئیبدال.

خۆ ئەگەر وشەکە هەڵگەڕابێتەوەو بە پێچەوانەوە بوترێت، وەك لە دیالێکتی عەرەبیی میسردایە (زواج-زەواج) دەڵێن: (جواز- جەوان) ئەوە لەم حاڵەدا پێی دەڵێن: قەلب.

---

٢٠-لەسەر ئەم (ڕەنگە)یە دنیایان هەڵگرت و دانایەوە، وەك لەم سەردەمەی ئێستاشدا، ئەو دواکەوتووە ترسنۆکانە کەمن، کە ئازایەتی و بە جەرگیی لە یەکێك بەدی دەکەن، دژی زوڵمی ڕژێمێك، لە تاوی ترسنۆکی و دواکەوتوویی خۆیان دەڵێن: پیاوی خۆیانە دەنا چۆن دەوێرێت..؟!

٢١-خوێنەری ئازیز، لە هەڵسەنگاندن و وەڵامدانەوەی ئەم وتارەمدا-کە تۆ ئێستا لە خوێندنەوەی بوویتەوەو دیارە ڕای تایبەتیی خۆت دەبێت دەربارەی-کەریمی حوسامی لە هاوکاری ژ:٢٤٠ی ڕۆژی (١٩٧٤/١١/١)دا زۆر بە ئەدەبەوە نووسیبووی:
"لێکدانەوەکەی زۆر شل و شەوێقە"
"بەر پەڕەی هەلاجی داوەو شی کردۆتەوە"
"ئەوەی کاك دڵشاد لەسەر ئەو غەزەلەی نووسیوە. نەك هەر ڕەخنە نییە، بەڵکو هەمووی پەسەندکردن و بە باڵا بڕینە".

ئێمەش لەم وتارەدا هەوڵدەدەین، بۆ هەندێك بنکە بگەڕێین، کە بە گوێرەیان ئەو وشانە تیپەکانیان جێ گۆڕکێ و ئاڵ و گۆڕ دەکەن، بەلام پێش چوونە باسەوە، پێویستە دوو تێبینی بدەم:

یەکەمیان: ئەو نموونانەی لەم وتارەدا هەن، نزیکی سێ ساڵێك دەبێت لە نێوان و گەشت و گەڕانم دا لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستان تووشم بوون و بەردەوام تۆمارم کردوون، واتا هی یەك شێوەی زمانی کوردی نین، بەڵکە بەچکە شێوەشی تێدایە.

دووەمیان: ئەم وتارە دەسەلاتی ئەمڕۆی منەو لەمە زیاتر شارەزا نیم، جگە لەوەی مەیلی زمانەوانیم نییە. بۆیە دەشێت وەك من ئەمەم لێ هەڵکڕاند. کەرەستەو سەرەتایەکی باش بێت بۆ شارەزایەکی زمانەوان، کە زانستانە ترو پوخت تر لێوەی بدوێت، چونکە دڵنیام-باسەکە لەمە زیاتر هەڵدەگرێت و گرنگە، ئەگەرچی وا تێبگەم ئەمە یەکەمجارە بەم شێوەیە لەم بابەتەوە بە چاپ بگەیەندرێت.

ئەوەندەی من پەییم پێ بردبێت، ئەو وشانەی تیپە گۆڕکێ دەکەن، چوار گرووپن (زۆر ئاساییە وەهاش نەبێت) هەتا توانای من بەم شێوەیەن:

گرووپی یەکەم:

دوو بەشە:

١-ئەو وشانەی خاوەنی یەك تیپی بزوێنن، واتا یەك برگەن و بە پێچەوانەی تەواوەوە دەوترێن..

وەك: زیخ-خیز، کن-نک، قەت-تەق، قەد-دەق، سەرکەوین-رەسکەوین

٢-ئەو وشانەی خاوەنی دوو تیپی بزوێنن، واتا دوو برگەن و دواییان بە تیپێکی بزوێن هاتووە، ئەو تیپە بزوێنەی دووەمیان کە برگەی دووەمیانی دروستکردووە" لە جێی خۆی دەمێنێتەوە، بەلام تیپەکانی تر بە پێی یاسای خاڵی یەکەم بە پێچەوانەی تەواو دەوترێن.

وەك:

رەزا-زەڕا، وەڕی-ڕەوی، فڕی-ڕڤ

ئەنجام: کەواتە گرووپی یەکەم دوو بەشە:

بەشی یەکەم: پێچەوانەی تەواو لە تیپە گۆڕکێدا.

بەشی دووەم: پێچەوانەی ناتەواو.

گرووپی دووەم:

دوو بەشە:

١-ئەو وشانەی لە دوو برگە پێکهاتوون:

برگەی یەکەم وەك خۆی دەمێنێتەوە، بەلام برگەی دووەم بە پێچەوانەی تەواوەوە دەوترێت.

وەك:

بەفر-بەرف

توفل-تولف-تیفل (طفل، ع)

رویع-روعب (ربع، ع)

دەفع-دەعف (دفع، ع)

جوێن-جنێو

جنێم-جمێن

٢-ئەو وشانەی دوو برگەو زیاترن و دوایین برگەیان بە تیپێکی بزوێن هاتووە:

ئەمانەیان برگەی یەکەم وەك خۆی دەمێنێتەوە، هەروەها بزوێنی دوایین برگەش لە جێی خۆی دەمێنێتەوە، هەرچی دەشمێنێتەوە لەم نێوانەدا بە پێچەوانەی تەواو دەوترێن.

وەك:

قۆپچە-قۆچپە

تەرزە-تەزرە

تەنیا-تەینا

دیژلەمە-دیژمەلە

جومعە-جوعمە

گریا-گیرا-گیریا

فانیلە-فالینە

شەپقە-شەقپە

فاتیحە-فاحیتە

مێرووڵە-مێلوورە.

ئەنجام:

کەواتە گرووپی دووەم دووبەشە:

بەشی یەکەم: فرە برگەی پێچەوانەی تەواو لە تیپە گۆڕکێدا.

بەشی دووەم: فرە برگەی پێچەوانەی ناتەواو لە تیپە گۆڕکێدا.

گرووپی سێیەم:

دوو بەشە:

١-ئەو وشانەی دوو بڕگەو زیاترن و مەرج نییە دوایین تیپیان بزوێن بن، دوو تیپی سەرەتای وشەکەو دوو تیپی دوایینەی وشەکە وەك خۆیان و لە جێی خۆیان ناجوولێن، بەڵام ئەو تیپانەی دەکەونە نێوان ئەم چوار تیپەوە بە پێچەوانەی تەواو دەوترێن.

بۆ نموونە (دەروێش) دوو تیپی یەکەم (دە) لەگەڵ تیپی دوایینە (ێش) وەك خۆیان و لە جێی خۆیان دەبن، ئەو تیپانەی لە نێوانیاندا دەمێننەوە (رو) بە پێچەوانە تەواو دەوترێن (ور)، بەم پێیە (دەروێش-دەورێش)، (تەزبیح-تەبزیح).

وەك:

بێ لەزەت-بێ زەلەت

دەروێش-دەورێش

هەوراز-هەرواز

سوعبەت-سوبعەت

دەعوەت-دەوعەت

ئەنواع-ئەوناع

هێتلەر-هێلتەر

مەمنوون-مەنموون

مەشغووڵ-مەغشووڵ

مەژغووڵ، مەغژووڵ.

٢-ئەو وشانەی دوو بڕگەو زیاترن و مەرج نییە دوایین تیپیان بزوێن بن، وەك خاڵی یەکەم دوو تیپی سەرەتایان و دوو تیپی دواییشیان لە جێی خۆیان دەمێننەوەو ناگۆڕێن، بەڵام تیپەکانی نێوان ئەو چوار تیپیە بە پێچەوانەی ناتەواو دەوترێن، واتا بە شێوەیەکی نارێك جێی خۆ دەگۆڕن.

وەك:

رانەوەستی-راوەنەستی

موتەحیدە-موحەتیدە

یەکجاری-یەجگاری

مەکتەبلی-مەتکەبلی

فەخفووری-فەفخووری

جیاوازی-جوایازی-جوایزی

چەندەوەر-چەوەندەر

مەخسەرە-مەسخەرە

دەژمێرێ-دەمژێرێ

ئەنجام: کەواتە گرووپی سێیەم دوو بەشە:

بەشی یەکەم: فرە بڕگەی ناوەندە پێچەوانەی تەواو لە تیپە گۆڕکێدا.

بەشی دووەم: فرە بڕگەی ناوەندە پێچەوانەی ناتەواو لە تیپە گۆڕکێدا.

* * *

گرووپی چوارەم:

ئەو جۆرە وشانەن کە لە جێگۆڕکێی تیپەکانیاندا ئەو سێ یاسایەی لە سێ گرووپەکەی پێشوودا باسمان کردن" نایان گرێتەخۆ.

من لێرە لە ژێر گرووپی چوارەمدا دایاندەنێم و ناویان دەنێم (شاز). دەشێت شازیش نەبن و ئەمانیش یاسای تایبەتیی خۆیانیان هەبێت، بەڵام وەك لەسەرەتادا وتم: من ئەمە ئیشم نییەو نامەوێت لەوە زیاتر خەریکی ببم، بۆیە وا نموونەکان وەك کەرەستە دیاریدەکەم و لێی دەگەڕێم بۆ شارەزایان.

نموونە:

ئاسانی-ئێسایی-سانایی

سەرین-سەنیر

نوارین-روانین

قەشار-شەقار

ژماردن-مژاردن

پشقل-قشپل

فەقەت-تەفەق

شەرواڵ-شەڵوار

خەدیجە-خەجیجە

پەترسبۆرگ-پەتریپۆت

ئەمەریکا-عەمەلیقا

رووسیا-عەرووسیا

دیارە ئەو چوار نموونەیەی دوایی لە شێوەدا بە هۆی نارەحەتی و بیانییان دەستکاری دەکرێن، بەڵام من هەر لە نموونەکاندا نووسیمن نەوەکو لێکۆڵەرەوە لێیان بێئاگا بن.

من دەزانم ئەمانەش یاسایەك دەیانگرێتە خۆ وەك ئەوەی هەندێکیان دوو تیپی دواییان وەك خۆیان دەمێننەوەو ئەوانی تر بە پێچەوانە دەخوێنرێنەوە، وەك (شەقار) دوو تیپی دوایی (ار) وەك

خۆیەتی و (شەق) دەبێت بە (قەش) واتا پێچەوانە دەبێتەوە. بەم پێیە (شەقار) دەبێت بە (قەشار).

یان یەك تیپی دوایی دەمێنێت و ئەوانی تری پێچەوانە دەوترێن وەك (پشقل) دەبێت بە (قشپل)، بەلام وەك روونمکردەوە ئەم



دیاردەیە سەرنجی راکێشاین و لە سەرمان نووسی. دەنا کاری ئێمە نییە، تەنانەت کاتی گواستنەوەی بۆ ئەم کتێبە بە هەندێك دەستکارییەوە زۆر لێی وەرس بووین. بەهەر حاڵ لە دەستمان دەرچوو. هیوادارین ئەم هەوڵە ساکارە سوود ببەخشێت بە دڵسۆزانی پسپۆڕ و زمانەوانیی کورد بۆ خزمەتی گەل و زمانە سازەکەی. بە ئومێدی سەرکەوتن و سەرفرازیی هەموو خێر خوازێکین.

**لە ئێوارەی مەزاتخانەیەك دا**

مەزاتخانەیەکی گەورەبوو[*] دەنگە دەنگ و هەیت و هووتی خەڵکانی ناوی. ژاوەژاوی حەمامی ژنان ئاسای نابووەوە. کەس نەی دەپەرژایە سەر کەس.

ئەو بارە ناسازە کارێکی وەهای کردبوو" گەلێکیش لەوانەی کە هەرگیز نەیان قیژاندبوو. لە ناچاریدا بۆ ئەوەی کەسانی تر گوێیان لە دەنگیان بێت" کەوتبوونە قیژە قیژ. دیارە ئادەمیزاد کە کەوتە قیرەو نەڕڕە" ئیتر نەزاکەت لە دەنگیدا نامێنێت. مۆسیقا لە گەروویدا دەخنکێ. هێمنی لە وەستان و گشت ئەندامیدا دەمرێت.

لە پڕ وا دێتە پێش چاوت، کە بە دەست و سەرو شان و قاچ خەلەمە دەکات و کەف دەچرێنێت و قژی خۆی دەرنێتەوە.. لە پڕ هەموو دەنگەکان لە یەك دەچن و تێکەڵدەبن. قسەی یەك دەجوونەوەو تا دەبێت بە شەڕو هەڵلاو دەقەومێ. وەك یەك لە یەکتر دەدەن. پێکەوە شەکەت دەبن. ئینجا وەك یەك جنێو دەدەن. وەك یەك پەل دەهاون. وەك یەکیش هەر یەکە لە ئاستی خۆوە، خۆ بە خاوەن دەستی باڵا دەزانن لە هێرشبردن و خۆ سەلماندندا. کەسیشیان سەلماونین خۆ بە خاوەنی یەك مەسەلە دەزانن و مەسەلەش لە ئارادا نییە.

پاشان بۆ پشوودان لە بن دیواری مەزاتخانەکەدا دادەنیشن و پشت دەدەن بە دیوارە وەرسەکانییەوە، خێسە لە یەکتر دەکەن و هەر یەکەیان لە (خود)ی خۆیدا خۆی بە پاڵەوانی ئەوانی تر دەزانێت.

کە ئاشت و گونجاویش بن، هەر یەکێکیان بڵێت:

–ئای کە پشتم دێشێت.. نازانم دیاردەی چییە..؟

ئەوی تر بە پەلە دەڵێت:

–تۆ قەیناکە، من قۆڵم وێرانە..!

یەکێکی تر فریادەکەوێت و دەڵێت:

–ئێوە بە هەر جا، من سەرم دوو لەت دەبێت..!

–ئێوە بە هەر حاڵ، من چاوم خەریکە دێتە دەرەوە..!

–..تاد.

هەر یەکەیان ئازارە دەستکردەکەی خۆی بە گرنگتر دەزانێت لە ئازاری ئەوانی تر.

ئەو مەزاتخانەیەی باسی لێوە دەکەم، بە تایبەتی کە لە دوای ساڵی (١٩٧٠)وە کۆڕەکەی گەرمترو دەردەکەی سەخت تر بوو.

---

*مەبەستم ئەم جیهانەی ئەمڕۆی شیعرە، کە لەمەزاتخانە خراپترە، هەر سەوداو مامەڵەی کۆنەو سەقەت و سقووتە.

چەند دەنگێکی هێمن و لەسەرخۆ.. چەند کەسێکی پەتا نەگرتوو، ئەگەرچی لە ژێر دەست و پێی هەیت و هووت کەراندا ئازاریان چەشت و دەنگیان کرا بە ژێرەوە، بەڵام ئەو چەند لاوە خۆیان گرت و باوەڕیان بە سەلیمیی سەرەتای دەستپێکردنیان هەبوو. خۆیان گرت و وردە وردە ڕێگای خۆ سەلماندنیان گرتەبەر. گۆرانیی‌یان بۆ ماوەیەک، لە ناو نەڕەی ئەکتەرە ساختەکاندا کپ بوو، بەڵام ئاوازیان" لە ئەنجامی خۆ بە دەستەوە نەدانیان و ڕەدوو نەکەوتنی مۆدێلی مەزاتخانەکەدا" خۆیان سەلماند، خۆیان بەو خەڵکە ئاشنا کرد.

جا ئەگەر هەر وا مەردانە بەردەوامبن و بیسەلمێنن کە شیعر دەست و پەنجەی سوورەوەبووی چەپڵە لێدان نییە. ئەگەر هەر ئاوا بەردەوام شیعری ناسک و بە هێز بنووسن بۆ ئەوانەی هێشتا شیعریان لەبەرچاو نەکەوتووە.

ئەم لاوەم لە ناوەند مەزاتخانەکەدا بینی. بۆ یەکەم جار(**) گوێم لێ بوو بە زمانێکی شەل و شۆق، کە هێشتا لە گرێی بەچکە شێوەیی، پاک نەبوو بووەوە. لەبەر خۆیەوە دەیوت:

لە ناو بەفراوی چاوەکانتدا

هاوین" درەختێکی وشکە

بانگی ڕەوە باڵندەکانی شەو دەکا

لە شارێ بۆ شارێ

لە گوندێ بۆ گوندێ.. دەفڕن

دڵێشت لە ناو دڵمدا

پەڵە هەورێکی بریندارە

......

دەڕۆی

هۆنراوەکانم بکە تووتنی دوا سیغاری

تەواوبوونی ڕێگا

خۆتی پێ لە بیر بکە

منی پێ لە بیر بکە

ئەگەر مردیشی وەکو ڕوبارێ بمرە

با شوێنەواری کەنارت، هەر بمێنێ

ل-١٧

ئەو ساکاری و هێمنی و خەمناکییە بەتامە، سەرنجی ڕاکێشام، لە دەنگی لاوێکی بە نەزاکەت وریایان کردمەوە، بەڵام لێی بە گومان بووم، تۆ بڵێیت لە شیعرێکی عەرەبی یان جیهانییەوە وەری نەگرتبێت..؟

بەڵام نا.. ئەم لاوە کوردە ساکاری و هێمنییەکەی کوردانەیە، خەمەکەی کوردەوارییانەیە، بە خاک و نەتەوەوە نووساوە، ڕەگی قووڵی داکوتاوە (تووتنی دوا سیغار) جگە لەمە، ئەوەتا:

هەواری گیانی ئاوارە بووم

لەبەر هەتاوێکی گەڕۆک

دەبێتە باوەشێ.. چیلکە

کچانی گوند

لە نیوەڕۆیەکی ناڕەحەتدا

هەڵی دەگرن

ل-١٩

مایەوە ئەوەی، ئایا ئەم لاوەی دیمەنەکانی هەڵهێنجراوی چیاو دەشت و کانی و هەڵسوکەوتی گەلەکەی خۆیەتی..! تۆ بڵێیت شووڵی لێ ڕانەکێشێت و تەمومژی خەیاڵاتی ڕۆمانتیکییانە نەیپێچێتەوە..؟ ئەی تۆ بڵێیت، لە لایەکی ترەوە گەردلوی ئەم مەزاتخانەیە حولی نەداو هەڵی نەلووشێت..؟ ئایا بایی هێندە هوشیارە..؟

لە ژێر شاخێ ناخەوم

شەو لە کەوتنی بترسم

ل-١٩

هەر زوو بوو لە سەلامەتیی نەفەسی ئەم لاوە دڵنیابووم، ئەوسا وەک تینوویەکی ئاو بەدیکردوو پڕ بە سییەکانم هەناسەیەکی قووڵی پشوودانم هەڵکێشا. هەتا دیوانە خنجیلانەکەی کەوتە بازاڕەوە. کەوتمە تاووتوێکردنی. ڕوانیمە (سەمای بەفری ئێوارانەی جەلال بەرزنجی).

* * *

با ئەو سەرەتایە. پیرۆزباییەک بێت لەو لاوەو لەو لاوانەش کە تێگەیشتوون لەوەی مێژوو چەپڵەو نەڕە نەڕ نانووسێتەوە، بەڵکە بەرهەمی پیرۆزو خزمەتگوزارو خێرخواز و نازداری دەوێت.

سەرنج:

نموونەکان لە دیوانی (سەمای بەفری ئێواران) وەرگیراون.

**چونکە یەکەم شیعری کە بڵاوی کردەوە لە ڕۆشنبیریی نوێدا ئەم نموونەیە بوو. ئەوسا من لەوێ کارم دەکرد-(د.م).

# هەڵبژاردەیەك لە چیرۆکەکانی دڵشاد مەریوانی

## ١. مەکینە

(نامەی خۆکوژێ)

لەناخەوە پێکەنینم ئەهات، هەر کاتێك باسی دڵداری و خۆشەویستیان بکردابێ.

خۆشەویستی چی؟ دڵداری چی؟ حەز.. ئاخر.. حەزلێکردن چییە؟

هێزە، هەستە، توانایە، وزەیە، بڕوایە، ئەبێ شتێك بێ وا.. ئەگینا ئەم خەڵکە بۆ ئەخاتە گێژاوو جەنجاڵی و سەر لێشێوانەوە؟ ئەم غەڵبە غەڵبە چییە؟

* * *

ساڵ وەکو ڕۆژان ئەڕۆیشت، قوتابخانەی ئامادەییم تەواوکرد، بەرگەی هەموو کوێرەوەری یەکم گرت، بەبێ دایك بەبێ باوك، بەبێ خوشك و برا، بەباوەڕ نامەی ئامادەییەوە بوومە فەرمانبەری میری، وورده‌ووردە گرێ کوێرەکانی ژیانم کردەوە بەڵام.. بەڵام ئەو شتەی خەڵکی ناویان نابوو خۆشەویستی وەکو تەلیسمێ وەك خۆی مایەوە.

ئاوەڵەکانم گاڵتەیان پێئەکردم.. ئەیان وت: تۆ نەخۆشی نەفسیت هەیە.. دڵت نییە.. عەمەلیاتی بەزەییان کردویت بەمناڵی، ئەزانی بێ هەستی تەنیا وەڵامێکم بۆیان بێ دەنگی بوو.. تەنانەت شکم لەڕاستی هەستی خۆشم ئەکرد، شکم لەڕاستی هەموو قسەکانیان ئەکرد.

بەمناڵی کاتێ فرێیان دابووم و میری خسبومیە هەتیوخانە، گوایێ لەپێ پلیکە ئاسنینەکانی هەتیو خانەکەوە کەوتبووم شیشێ چووبوو بەسەرمدا زۆر جار پەنجەم ئەخستە شوێن چاڵەکەی لەژێر قژمەوە وەبەخۆم ئەووت.

ئەڵێن مێشك گرێگرێیە، هەر گرێیەی کارێکی هەیە ڕەنگە بەو شیشەی چووە بەسەرمدا ئەو گرێیەی کاری خۆشەویستی دەبینێ لەکار کەوتبێ.. ئەگینا بۆ ئەم هەموو خەڵکە باسی خۆشەویستی و جۆری دڵداری و فرکان فرکانی خۆیان ئەکەن کەچی من هەست ناکەم بەوەی وابم. هیچ.. یان من نەخۆشم و شێت یان ئەم هەموو خەڵکە درۆ ئەکەن و شتێ نییە بەناوی خۆشەویستی بێت بەڵکو ئەویش وەك زۆر شتی تریان خەیاڵێکی پوچە و خۆیان لەهیچ دروستیان کردووە.

شەوێك لژوورەکەمدا دانیشتبووم لەناو ئەو کۆمەڵە کتێبەی کڕیبوم کتێبێکم هەڵبژاردبۆ خوێندنەوە.. لەیەکێك لەلاپەڕەکانیا بینیم نوسراوە (ئافرەت نیوەی کۆمەڵە) منیش هیچ کاتێك وەکو ئەو شەوە کامڵ نەبوو، کە ئەوەم خوێندەوە بەقسەیەکی قوڕ هاتە پێش چاووم زیاتر برسی بووم بۆ خوێندنەوەی تاگەلۆری نوسەرەکەم زیاتر بۆ دەرکەوێت..

کەچی کاتێك لەخوێندنەوەی بوومەوە و چەند ڕۆژێ لەخەیاڵیدا ژیام.. هەستم کرد دەبێت ژن بێنم.. کتێبەکە باسی خۆشەویستی و دڵداری نەئەکرد.. نەخێر.. بۆیێ واکاری لێ کردم.. چوومە ئەو بڕوایەی کە.

(ئافرەت مەکینەیەکی خواردن ئامادەکردن و قاپ و بەرگ شتنەوە و پێویستە دژی مردنیش وەکو مەکینەی چەکێکی بەکار بێنرێت تازاوزێی مرۆڤایەتی نەوەستێ مادام مردن هەیە، زکەی مردن نەما ئافرەتیش نامێنێ، ئافرەت و مردن بۆ یەکن) ئەگەر چی جاری واش هەبوو ئەمپرسی: باشە بۆ زاوزێی مرۆڤیش نەوەستێ؟ مرۆڤ ئیشی چییە لەسەر زەوی؟ بۆ هەبێ؟ چی ئەگۆڕێ؟

بەڵام ئەوکتێبەو هەندێ بیری خۆم پرسیارەکانیان بۆ ماوەیەك بەنج کرد.

حەزم ئەکرد شتێك بگۆڕم، ژوورەکەم لەماڵەوە ژوورەکەم لەدایەرە، ڕێگای هات و چۆم، تەنیا ژوورەکەی ماڵەوە سرف بەهی خۆم ئەزانی ویستم لەوێ شتێ بگۆڕم.. بامەکینەیەکی بۆ بکڕم.. ژنێك بهێنم.

بێوەژنێك-٢- ساڵ بوو مێردەکەی مردبوو ئەویش وەکو من ت مەنی (٣٥)ساڵێك ئەبوو، دوام کرد و هێنام مناڵێکیشی هەبوو دوای

مرۆڤی خێزانەکەی بووبووی ناوبەشی منداڵ. ژوورەکەم جەنجاڵ بوو منداڵەکە هەر لەبووکە شوشە ئەچوو حەزئەکەم تەماشای ئەم، تماشای کەم تابزانم چی ئەکات چی ناکات تابەهۆی ئەوەوە بزانم خۆم بەمناڵی چۆن بووم.

مەکینەکەم کڕی.. بەرگەکانم خاوێنتر و خواردنەکانم پوختتر و ژوورەکەم پرتربوو.. لۆمەی زۆری خەڵکیشم لەسەر نەما.. کە ئەمەیان لەهەموویان ناخۆشتر بوو.. ئەیان وت ئاسوودە و کامەران ئەبیت.

بەڵام من هەر خۆم بووم تەنیا شتێ کە گۆڕدرا:

جاران قسەم نەئەکرد و کاری خۆم دەکرد لەماڵا بەڵام دوای قسەم ئەکرد و کارم نەئەکرد، چونکە ژنەکەم بۆی جێبەجێ ئەکرد، دڵی ڕائەگرتم بەحیسابی خۆی

دیار بوو من وەکو خەڵکی ئەبووم دیار بوو زۆرجیاوازبووم چونکە ژنەکەم پێش من مێردی هەبوو بوو ئەو وەکو من نەبوو بوو لەتەکیا.. بۆیێ جۆرێکی سەیر سەرنجی ئەدامێ، بوو بووم بەتەلیسمێ لێی تێم نەئەگەیشت.. مەستم کرد وورده وورده لاواز ئەبێت ئەی ووت (نەخۆشم) پێم ئەووت: مەکینەی ئاسن ئەوەی خراپە ئەبێ بیبەی بۆلای فیتەر و وەستا بەڵام مەکینە ی گۆشت خۆی ئەچێت.. بچۆ.. نەخۆشی بچۆ..

یەکێك لەبەیانییەکان خەواڵووبووم هەڵسام بچم بۆ چاوشتن لەهەنگاوی یەکەمما جیقەکەی منداڵەکەو نەرمییەك کەوتە ژێرپێم کە لێفەکەم هەڵدایەوە بینیم منداڵەکەم پان کردۆتەوە و مردوە، چونکە بەدەم خەوەوە خزابووە خوارووی لێفەکە، چاوم خەواڵووبوو ویستم بەدایکی بڵێم بۆ ئاگای لەبووکە شوشە کەی نەبووە. ڕوانیم وەڵامم نەداتەوە.. بۆم ڕوون بووەوە کە شەوێ مردووە و ئاگای لەمنداڵەکەی نەماوە و خزاوەتە خوارووی لێفەکەو من پێم پیاناوە کەمێك بیرم کردەوە.

مرۆڤ چیە؟ بۆ ئەژی؟ بۆ زاوزێی مرۆڤایەتی نەوەستێ؟ ئەم هەموو وئەرکو ئازار و جەنجاڵی هەیت و هووتە بەس لەپێناوی درێژە پێدانی ئەو زاوزێیە. بۆ؟؟

منیش وتم خۆم ئەکوژم بالە خۆمەوە دەست پێبکەم بەڵام با ئەم چەند دێڕە بنوسم و باسی تیا بکەم نەوەکو خەڵکی بەهەڵەدا بچن و وابزانن دڵم ێشاوە بۆ مەکینە و بووکە شوشەکەی.. یان شتی تر.. ئێستاش نازانم ئایا خەڵکی وەکو منە یا مە جیام لەم هەموو خەڵکە وانووسیم و خۆم ئەکوژم دوا بەدوایا.. باخەڵکیش چۆنی شی ئەکەنەوە بیکەنەوە.

نیسان/ ١٩٦٥



## ٢. مامۆستا شەماڵ

پێش ئەوەی چاوبکاتەوە، گوێی لەدەنگەدەنگ و زرەی پەرداخ و گۆرانی بوو، بەستە لەلایەکەوە، مەقامی مەیخۆرانی خاو لەلایەکی ترەوە، هەستی بەنەرمی گژوگیا و شێ ێکی بەهاری و بۆن و بەرامەیەکی خۆش کرد.

هێشتا چاوی نەکردبووەوە، دەستی برد کڵاو جەمەدانەکەی لەسەر ناوچەوانی لابرد، پاشان لەسەرخۆ چاوانی هەڵهانی، تیشکی خۆرێکی کاڵ لەنێوان گەڵای درەختانی ژوور سەریەوە گورزەگورزە لەهەندێك لاوە دەڕژانە سەر ناوچەوانی لەسەر خۆ ئەنیشکی کردە یارمەتی دەری لەشی و ڕاست بووەوە دانیشت، ژنێکی سیما جوانی چاوگەش و تەڕ لەتەکییەوە بوو، تەمەنی نزیکەی سی ساڵ دەبوو، دەت وت تازە لەگریانێکی نەهێنی و بێ دەنگ بووەتەوە، کەڵ مل و پەرچەم و ئەگریجەخاو دەست و مەچەکی سپی و ناسکی بە پەرداخێك ئاوەوە بەرەو ڕووی ئەم هات.

-وابزانم دەنگ و هەرای منداڵان نەیان هێشت باش پشوو بدەی، نەختێك گەرووت تەڕبکە، چونکە ماوە یەك لەمەوبەر بەدەم خەوەوە دووجار بزرکانت و داوای ئاوت کرد.

پەرداخەکەی لێ وەرگرت، قومێکی لێدا گەرچی هەستی بەتینوێتی نەدەکرد پێی شەرم بوو لێی بپرسێ، ئەرێ خانمەکەم تۆ کێیت و لەگەڵ مندا چ دەکەیت؟ پەرداخەکەی دایەوە دەستی و بەدەمییەوە روانی بەدەورو بەری خۆیدا، لاپاڵی گردێك بوو، جۆگەیێك بەدامێنی دا دەچووە خوارێ، کۆمەڵێك درەخت و سەدەها ماڵ و خێزان و کۆمەڵەها کوڕوکاڵ بۆسەیران و بەزم و خواردنەوە تێی هاتبوون. دەنگی ژنەکە هێنایەوە لای خۆی:

—ئەوە چۆن بوو کە خەبەرت بووەوە یەکسەر جگەرەکەت دانەگیرساند؟ چونکە تۆ فێری

دیسان پێی شەرم بوو بپرسێ: بۆچی من جگەرەکێشم؟ ئەی بۆ خۆم نازانم و تۆ دەزانی؟!!

لەسەر خۆ دەستی برد بۆ گیرفانی شەرواڵەکەی، پاکەتێك جگەرەو چەرخێکی گازی جوان هاتن بەدەستییەوە، وەك خۆی تاقی بکاتەوە جگەرەیەکی نابە لێویەوە دایگیرساند، کە نەفەسی لێدا، زانی ژنەکە راست دەکاو ئەم جگەرە کێشێکی باشە، ئەوەتا تەسکینی بەدووکەڵەکە دێ و چاك هەتا هەموو کون و کەلەبەری سیەکانی هەڵی مژیو لەسەر خۆ دووکەڵەکەی بەبادا (داخۆ ئەم ژنە کێ بێ؟ بۆ وەها بەمیهر و بەوەفایە لەگەڵمدا؟ من بیرم نایە ژنم هێنابێ!! ئەی ژنم نییە! بۆ لێرەم؟ تۆ بڵێی زۆرم خواردبێتەوە و بەسەرخۆشی هاتبمە لایەوە؟ بەڵام کێ دەڵێ من هەر مەی خۆرم؟ کوا؟ سەرخۆش نیم! هەموو هەستەکانم لای خۆمن. پەرداخ و مەییشم لەتەکەوە نییە، گەر بەسەرخۆشی هاتبمە لای ئەم چۆنی قبوڵکردووە؟ بەڵام نابێ خۆم شڕشێت بکەم، دەبێ بەئارامییەوە چاوەڕێی بکەم بزانم داخۆ چی روودەدا، بابیهێنمە قسە بەڵکە بەهۆی قسەکانییەوە هەندێك شتم لێ رۆشن بێ).

ژنەکە قووڵ روانییە ئەم و لەسەرخۆ پرسی:

—لەوە دەچێ خەوێکی ناخۆشت دیبێ، تەواو نیت.

—نابڕوا مەکە، هیچێکی ئەوتۆ نییە، بەڵام نازانم چۆن خەوم لێ کەوت!!

ژنەکە زەردەیەك گرتی:

—ئاخر ئەوە هۆی خواردنەوەی ئەم چەند رۆژەی دوایەتە، من نامەوێ دەست بخەمە کار و بارتەوە.

بەڵام دەشزانم سەخڵەت و وێرانی ئەو جوانە.. ببورە دەزانم سەخڵەتی بەڵام ئەوەشت بێتامە کە مانگێك مۆڵەت وەرگری و لەسبەینانەوە تا ئێوارە بەرامبەر پێکەکەت دابنیشی و بیخۆیتەوە، بەبڕوای من ئەو هەفتەیەی ماوتە لەمانگەکە، ئیتر دەمی بۆ نەبەیت و خۆت ئامادە بکەی بۆ ژیانێکی نوێی پڕ لەووزەو ئومێد.

—ئا.. رەنگە وەها بکەم، بەڵام مەزەندەکەم بەخۆمدا بچمەوە. تکات لێ دەکەم یارمەتیم بدە.

—بەچاوان جامن کێم هەیە لەتۆ زیاتر حەزدەکەم پەرێشانت نەبینم.

لەسەرخۆ دەستی گێڕایەگیرفانیدا(وەها قسەم لەگەڵ دەکا وەك ژنم بێ، ئەمن ژنم نەهێناوە، بەڵام قسەکانی لەوە دەچێ کە خوشکم بێ و من براگەورەی بم، لەگۆمەڵی ئێمەدا برا زۆرلای خوشکی ئازیزە، بەڵام من خوشکیشم نییە، بابزانم ناسنامەکەم چیم پێ دەڵێ.. ئا.. ئەمە لەوە دەچێ، بەڵام ئەمە ناسنامەی من نییە، کاروان سلێمان مەحمود، فەرمانبەر لەپرۆژەی.. ئا ئەمە ئەناوی منە، ئەناسنامەی منیشە. داخۆ هیچ برادەرێکی سەرخۆشم بووە، لێی کەوتووە و هەڵم گرتۆتەوە. تادووای بیدەمەوە!! ئا.. ئەوە خەوەکە باشی بەردام، من شەماڵ مەحمودم لەهیچ پرۆژەیەك فەرمانبەر نیم و مامۆستام، ئێستا چاکم بیرە کەچۆن وانەکانم دەووتەوە..)

ژنەکە بەزەردەخەنەیێکی ناسکەوە خەیاڵەکانی ئەمی بڕی

—چییە؟ بەناسنامەکەتدا دەروانی!! بەخۆدا چوونەوەکە لەوێوە دەست پێدەکات؟!!

—نا.. هەروا حەزمکرد بزانم ئەمە چییە لەگیرفانمدا، کەچی ناسنامە دەرچوو، رەنگەهی کاروانی برادەرم بێ.

—ئەم کاروان ناوە تازەیە، قەت لێم نەبیستووی بڵێی برادەرێکم هەیە ناوی کاروانە!! چییە ئەندازیارە؟

—نا مامۆستایە.

ژنەکە پێکەنی و بەنازێکەوە سەری لارکردەوە و پرسی.

—ئێ.. ئێ لەوانەیە کەناتوانەوێ وانە بڵێنەوەو دەبنە فەرمانبەر لەدایەرەکاندا.

—فەرمانبەری چی؟ لەگەڵ من دایە، تازە گواستوویانەتەوە پێکەوە وانە دەڵێینەوە.

ژنە بەسەرسامی پێکەوە پرسی:

—بۆ کاروان تۆ لەکەیەوە بوویت بەمامۆستا.

ئەم خۆی زۆر بێباڵا نیشاندا و دەیڕوانیە دوور. هەتا دڵنیابێ لەوەی داخۆ ئەم ژنە چۆنی بانگ دەکا، چونکە وا ئەمیش هەر بەناو کاروان بانگ کرد، بیرەکەی بۆچووە سەر ئەوەتا ژنە دەنگی لێهات.

—کاروان.. کاروان.. کاروان ئەو چییتە!! کوێرا دالغە بردتی.

—ها.. ببورە، هیچ نییە، لەوە دەچێ تەواو نەبم، ئەمرۆ هەردەبرزکێنم.

—وات دەبینم.. دەنا تۆکەی باسی ئەوەت کردووە کە کارەکەت بگوێزیتەوە و ببیتە مامۆستا.

—ببورە

—قەیدی نییە پشوو بدە. چایەکت بۆ تێکەم؟

—ئا.. بەڵام سارد نەبووەتەوە؟

—ئەی لە تەرمزە نوێکەدایە و سەرکایەکەیم چاك داخستووە.

—باشە سوپاس.

(کەواتە ئەم ژنە دەیەوێ لەمن بگەیەنێ کەمن شەماڵ مەحموود نیم و کاروان سلێمانم، کێ دەڵێ ئەو ئەم ناسنامەیەی نەخستۆتە گیرفانم!! بەڵام بۆ؟ مەبەستی چییە؟ مامۆستا پێکی بێ ماڵ و جێ و

لانەی وەکو من، گیان بەخشی بێ پوول و پارە و لەپێناوی خەڵك دا ریسوابووی وەکو من، خۆ وێڵکەر بۆهەموو کەس مردوو، تەنانەت ئامێری پیاوەتیشی لەژێر زەبرا نەماو، داخۆ کێ بەتەمای چییە پێی، پارەیە.. نیمە، پلەیە.. نیمە، توانای سێکس وتۆو بەخشینە نیمە، پاشە رۆژە..نیمە.. هەمە.. نازانم دەبێ چیم بێ هەتا خەڵکی.. بەتایبەتی ژنێکی وەها شەنگ و شۆخ تەماعم تێ بکا، یان بیەوێ بم خەڵەتێنێ!! چیم نییە لەوون بوون و تیادا چوونی بترسێم).

–چایەکەت سارد دەبێتەوە، دەزانم تۆ وەك من نیت حەز دەکەی چا بەگەرمی بخۆیتەوە.

–ها.. بەڵێ.. سوپاس.

(بەلام پێویستە سنورێك بۆ ئەمە دابنێم دڵم زیاتری بەبەرەوە نییە، باراستەوخۆ پرسیاری لێبکەم)

–ببورە لەم بەخۆدا چوونەوەیەم، بەتایبەت وەك تۆ دەڵێی ماوەیەکە لەبەیانی تائێوارە دەخۆمەوە زۆرشتم لەلا ئاڵۆز بووە، دەتوانی یارمەتیم بدەیت و تاقەتی وەڵامی پرسیارەکانمت هەیە؟

–کاروان گیان من حەزدەکەم، ئاواتمە، چی دەپرسی بپرسە.

–بەس تکایە لێم ببورە و تەحەمولی پرسیارەکانم بکە.

–بەچاوان فەرموو.

جگەرەیێکی تری داگیرساند و خۆی کۆکردەوە بۆ پرسیارەکانی

–من ناوم چییە؟

–کاروان

–کوڕی کێم؟

–مامە سلێمان.

–کارم چییە؟

–فەرمانبەری.

تۆ چیمنی ؟

–هاوسەری تۆم.

ژنەکە قوڵپی گریانێکی بۆهات، ئەمیش لەپرسیارکردن وەستا، ژنەکە خۆی گرت و خۆی هێدی کردەوە، ئەم کەوتەوە پرسی

–چەند ساڵە تۆ هاوسەری منی؟

–نۆ ساڵە.

–منداڵمان نیە؟

–ئەی کەژە!

–کەژە چی منە؟

–کچتە.

–تەمەنی چەندە؟

–پێنج ساڵ .

–ئێستا لای کێیە؟

–لای دایکتە. خۆت ووتت سەیرانەکەمان لێتێك دەدا.

ماڵمان هەیە؟

–بەڵێ ئەی گوایە لەکوێ دەژین.

–چۆن هایتن بۆ ئێرە؟

–هەر سەر لەبەیانی، دوای ئەوەی چەند پێکێکت خواردەوە، کەژەت بردە ماڵی باوکت و خۆمان ئامادەکرد هاتین بۆئێرە، تەنانەت بە کابرای شۆفێرت ووت سەعات حەوت بێتەوە بە شوێنمانا.

–کەواتە من کاروانم

–بەڵێ گیان.

–ئەی شەماڵ مەحمودی مامۆستا کێیە؟

–جوانە مەرگەکەی هاوڕێتە.

ئەء من شەماڵم، چاك خۆم دەناسم، نازانم تۆ مەبەستت چییەو کێ ناردووتی!! بەلام من دڵنیام لەوەی ئەم ناسنامەیە هی من نییە و ئەو وێنەیەی پێوەیەتی وێنەی من نییە. ژنەکە دەستیکرد بەگریان، گریانێکی بەکوڵ بەلام کپ، هەوڵی دەدا بەپێی توانا بیشارێتەوە.

دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمبیلێك هات، کابرای شۆفێر دابەزی هەر لەدوورەوە هاواری کرد:

–خاڵە کاروان ئامادەن؟

ئەم داچڵەکی، بەخۆیدا هاتەوە، ناسنامەکەی خستەوە گیرفانی، کڵاوەکەی لەسەرکرد و جامەدانەکەی بەستەوە، ژنەکەش چاوی خۆی سڕی و دەستیکرد بەکۆکردنەوەی شتەکان، هەوڵیدا خۆی ئاسایی بکاتەوە.

کابرای شۆفێر لەدیاریان وەستابوو. ویستی خۆی هەڵەبکا لەپەشۆکاوی ژنەکە، سنووقی ئۆتۆمبیلەکەی هەڵدایەوە، کەوتە یارمەتی دانی ژنە لەکۆکردنەوەی شتەکاندا ئەمان سواربوون، ئەویش خستیە گەڕو بەرەو شار کەوتنە رێ، هەر گەیشتنە شار کەوتە رێنیشاندانی کابرای شۆفێر، لەبەردەم ماڵێکی زۆر پان و پۆڕدا رایگرت، بەژنەکەی ووت.

–فەرموو دابەزە.

ژنە، ناچار دابەزی، ئەم چووە بەردەم دەرگای ماڵە گەورەکە سێ ژن دانیشتبوون، ئەم روویکردە ژنەکەی لەمەڕ خۆیدا و

–خانمەکەم هەر ئێستا بۆت دەسەلمێنم کەمن کاروان نیم و مامۆستا شەماڵم.

ژنەکان بەردەمی دەرگاکەیان گرتبوو، ئەمان ڕێی چوونە ژوورەوەیان نەبوو، ئەوانیش نەبزوتن، ناچار ئەم ووتی:

–بەیارمەتی ڕێگامان بدەن بچینە ژورێ، من مامۆستا شەماڵم، لەم حەوشەیەدا ژوورێکم گرتووە بەکرێ.

ژنەکان تاس بردنیەوە، یەکێکیان بەرزە پێ هەڵسا بەسەیرێکەوە

–بیسمیلا، مامۆستاشەماڵ پارچە بۆمبایێك بەر ژوورەکەی کەوت و مێشکی تەقی، لەبەر چاوی خۆم تەرمەکەیان بەلەت و پەتی بردەدەرێ، ژنێك و دوومنداڵی تریش لەو کارەساتەدا بریندار‌بوون.

ئەم کەئەوەی بیست کەمێك راما. (راست دەکا، کە پارچەکە بەرسەرم کەوت هەستم بە تەقینەکەی کرد، بەلام لەتاو گرمەکەی

هەموو شتم لێ شێوا، دەشێ بووراببێتمەوە، ڕەنگە خوێنیشم زۆر لەبەر ڕۆشتبێ).

بەدەم ئەم داوە دڵی یانەوە، جەمەدانەکەی لەسەرکردەوە بەگرێیکی گەورە توند بەستی بەسەریەوە.

ژنەکە خۆی پێ نەگیرا، بەدەم قوڵپی گریانەوە چووە ناو ئۆتۆمبیلەکە.

شۆفێرەکە کەهێشتا دانەبزیبوو، لەناوەوە بەژنەکەی ووت:

-هیچ نییە براژن، خەیاڵەو ئەم وورە وورەش لەنێوان ژن و مێردا هەرهەیە.

ئەویش پاش شەتەك دانی سەری، گەڕایەوە لای ئۆتۆمبێلەکە، دانەویەوە، سەری خستە ئاستی پەنجەرەکەی و بەژنەکەی وت:

-ببورە لێم، ئەمڕۆ ئەزێتم دای، سوپاسی ئەو هاوڕێیانەش دەکەم، کەتۆیان ناردووەتەلام هەتا لەم میحنەتەدا ئاگادارم بی، ناتوانم لەگەڵتا بێمەوە، تۆ خوشکی ئازیزی منی، من سەرم پارچە بۆمبای لێ داوە، تەقیوە و دەبێ بچمە خەستەخانە هەتا بۆم چاك بکەنەوە و بگەڕێمەوە کۆڕی خەبات، نەك لەئەرکی نیشتیمانیم دوا بکەوم. ئەوەی وت و توند دەستی گرت بە سەریەوە و بەرەو شەقامی دەمی کۆڵانەکە ڕۆیشت و لەتاریکی ئەو ئێوارەیەدا وون بوو.

(١٩٨٥/٥/٩)

سەعات(٥/٤٠ تا ٨/١٠)-بەیانی هەینی

## ٣. قالۆنچە

زۆر منداڵ بووم، ئەو بەیانیەی باوکم مرد ڕوانیمە جێگا چۆڵەکەی. لەنێوان فرمێسکەکانمەوە بینیم شەش حەوت قالۆنچەی گەورەو بچووك بەسەر سەرینەکەوەن ترسام و قیژاندم:

-دایە گیان ئەو قالۆنچانە بکوژە باوکمیان خوارد ئێمەش دەخۆن، پەنجەکانم بۆ جێگاکەی درێژ کردبوو هەموو گیانم دەلەرزی، دایکم هێمنی کردمەوەو بردمییە پێشترەوە، تێیگەیاندم کە لەبەرئەوەی من لەدوورەوە دیومن، وامزانیووە قالۆنچەن دەنا تۆپەڵە خوێنن و بەدەم کۆکەی پێش مردنەوە لەگەرووی باوکمەوە پەڕیبوون.

***

گەرچی پێش مردنی باوکیشم جار جار برسی دەبووم و نان نەبوو بیخۆم، دەیانخڵافاندم تا بیریان دەبردمەوە یان نانیان لەناو سەبەتەی نانەکە بۆ دەردەهێنام و دەیاندامێ، بەڵام دوای مردنی باوکم جار جارەی برسی بوونەکەم زۆرتر بوون، وەم لێهات جارێك خۆم چووم شاڵاوم برد بۆ سەبەتەی نانەکە.. بینیم بەتاڵەو قالۆنچەیەکی تێدایە وامزانی نانەکە ئەو قالۆنچەیە خواردوێتی لەداخدا بەبەرد پانم کردەوەو کوشتم تا ئیتر نانەکەمان نەخواو برسیم نەبێ.

لەو کاتەدا دایکم بانگی کردم خوشکە ساواکەمی لەباوەشدا بوو ئەوسا هەر مەلۆتکەیەکی بچووك بوو دوای مردنی باوکم هات، من خۆشم نەدەویست وامدەزانی باوکمیان گۆڕیوەتەوە بەو جیقنە گرینۆکە، کە دەمی دەنا بەمەمکە لاوازەکانی دایکمەوە ئەوەندەی تر رقم هەڵدەستا، سەرە ڕەشەکەی لەپشتەوە لەقالۆنچەیەکی زۆر گەورە دەچوو لەمن وایە دایکم دەخوا نەك شیری مەمکەکانی، گەیشتمە بەردەمی دایکم داینیشاندم:

-کوڕم تۆ ئازایت و ناترسیت، ئێمە حاڵمان باش نییە، نانی وشکمان چنگ ناکەوێ بیخۆین، ئەم خوشکەت سەرباری هەموو کلۆڵییەکی ترمانە.

دایکم قسەی زۆر کرد من خەیاڵم لێی پچڕا تا ئەو کاتەی گوێم لێ بوو لەقسەکانیدا وتی: (لەبەرئەوە فڕێی دەدەین..) وریا بوومەوەو گوێم دایەوە قسەکانی:

-... دەیپێچم لەپارچە پەڕۆیەکەوە، تا نزیك مزگەوتەکە لەگەڵتا دێم، لەوێ لێم وەرگرەو بیبە بەردەرگای مزگەوتەکە، بڕوانە کەس چاوی لێت نەبێ، دایبنێ زەوی و رابکە، خۆ ئەگەر چاویان پێت کەوت و گرتیانی هیچ مەترسە بڵێ خوشکی خۆمەو هیلاك بووم دامنایە زەوی تا دایکم دێ، ئەوسا من یەکسەر بەرەو رووت دێم گەر لێشت توورە بووم کە بۆ لەسەر ئەو زەویە داتناوە ئەوا قەیناکا تۆ بێدەنگ بە... من خوشکەکەمم خۆش نەدەویست، بەڵام کە گوێم لەو قسانەی دایکم بوو.. ترسام، نازانم بۆ یەکسەر بەبەزەییەکەوە وتم:

- دایە گیان ئەی نامرێ؟

- نا رۆڵەکەم، خۆ هەموو خەڵك وەك ئێمە نەدارو برسی و رووت نین، ئێستا هەڵیدەگرنەوەو یەکێ دەیبا بۆ خۆی، ئەو لەئێمە تێرو پۆشتەتر دەژی.. هەزار خۆزگەم بەخۆی.

-باشە دایە با برۆین..

ئیتر نانمان دەبێ، نانێکی ساغم دەدەیتێ بیخۆم؟!

دایکم وادەی دامێ و بەقسەیم کرد، کەس نەیبینیم و رامکرد، ئێستا بیرم نایەت چۆن نانێکی ساغی گەرمی ئیعاشەی بۆ پەیداکردم، بەڵام ئەوەم بیر ناچێتەوە کاتێك دەمخواردو دەگەیشتمە لای بڵقەکانی کە زۆر برژاوو ڕەق بوون وامدەزانی قالۆنچە دەخۆم.

١٩٥٦

(ئەم چیرۆکە کاتی پاکنووس کردنەوەی زۆر گۆڕا بەدەستمەوە دڵم نەهات وا نەبێ- ٩٧٧).

## ٤. محازەرەیەك دەربارەی كورتە چیرۆك و سۆ وەت؟

بەرامبەر قوتابییەكانی دانیشت و لەوە حاڵی كردن كە محازەرەكەی ئەمڕۆیان دەربارەی نووسینی كورتە چیرۆكە، وێنەیەكی بەدەستەوە بوو تێی دەڕوانی.

پێشەكی دەبێ ئەوە بزانین كە لەكورتە چیرۆكدا، بەتایبەتی لەم سەردەمی خێرایی و جەنجاڵییەی ژیاندا، نابێ درێژدادڕیی تێدا بكرێ، چیرۆكنووس چەند كاتێكی زۆر كورتی ژیان بەدەستكاریەكی ئەوتۆوە باس دەكا بەگوێرەی فەلسەفەیەكی تایبەتی یان با بڵێین بەو مەبەستە تایبەتییەی خۆی هەیەتی دەیڕەخسێنێ و دایدەڕێژێ، لەداڕشتنی باسەكەیدا شێوەیەك پەیڕەوی دەكا كە بڕوای پێی هەیە، ئەو كارەسات و ڕووداوو دیاردانە بەشێوەیەك پێشكەش دەكا مەبەستەكەی خۆی تێدا ڕوون بێتەوە بۆ خوێنەدواران.

مەرج نییە چیرۆكنووسەكە تەنیا باسی ڕووداوێك یان كەسانێك بكا لەڕێی هەڵوێستیانەوە بەرامبەر كارێك مەبەستەكەی خۆی بدات بەدەستەوە.

بۆ نموونە (ئەو)ێك، لەوڵاتێكی شیرازە تێكچووی بار ناهەمواردا دەژی، جێگای مرۆڤی بیر پاك و خاوەن ئایدیای پێشكەوتووخوازی تێدا لەقە، دەیانەوێ سست بێ و وزەی كەم بكەنەوە، لەبەرئەوە بەڕێوەبەرانی ئەو ڕژێمە دەیانەوێ گەر بەلەناوبردنیش بێ، نەمێنێ، خۆ گەر كەسیش نەزانێ چۆن لەناوچووە ئەوە باشتر. (ئەو)ـە كە هۆشیارەو لەم كێشەیەدا تووشی حاڵێكی نەفسی خراپ دەبێ، هەموو گیانی دەبێ بەچاوو گوێ و هەستی پێویست تا بوون-ی خۆی بپارێزێ.

چیرۆكنووس دەتوانێ باسی ئەو (ئەو)ە تەنیا لەشەقام پەڕینەوەیەكدا بكاو ساتەكانی پەڕینەوەی بكا بەكورتە چیرۆكێ

-چۆن؟ بەچی؟

-بەوەی.. لەشەقام پەڕینەوەكەی ئەو (ئەو)ـە بەنیسبەت خەڵكەكەی ترەوە كە لەتەكییەوە دەپەڕنەوە ناتاساییە، بەڵكە هەر جیهانێكی تایبەتە، چونكە سەدەها خەیاڵی ترسناك مێشكی دەجنێ، بەئاشكرا ئۆتۆمبیلە تەرخانكراوەكان دەبینێ كە بەدوایەوەن و لەفرسەتێك دەگەڕێن تا لەپەڕینەوەیەكدا بیكەن بەژێرەوەو بگەنە مەرامی خاوەن فەرمانەكان و كەسیش نەزانێ و ئەو خەڵكەش بڵێن قەزاو قەدەر بوو.

یان نموونەیەكی تر باس بكەین لەسەر (ئەو)ێكی تر، ئەو (ئەو)ـە مرۆڤێكی دەروون خاوێنە، لەبەر كەمدەرامەتی، یان گرانیی ژیان، لەژوورێكی پەڕپووتی پڕ لەسیسرك و جاڵجاڵۆكەو قالۆنچەدا دەژی، خاوەنی فەلسەفەیەكی پیرۆزە، نایەوێ زەلكاوی دووڕوویی و درۆزنی و ماستاوكردن ڕایماڵێتە ناو پیس و پۆخڵییەوە، كەچی ڕۆژانە لووتی دەبێ بەلووتی شەپۆلی ئەو زەلكاوەوە ناتوانێ خۆی دوورخاتەوە، چونكە بێ ئیشكردن ناتوانێ بژی، ئەو زەلكاوەش لەهەموو شوێنێكی ئیشكردندا هەیە.

لێرەدا چیرۆكنووس دەتوانێ چیرۆكێ لەسەر تەنیا دانیشتنێكی پێنج دەقیقەیی ئەو (ئەو)ـە بنووسێ لەو كاتانەی كە لەگەڵ ٤-٥ كارگێڕی شوێن ئیشەكەیدا دانیشتووە، ئەو پێنج دەقیقەیە جیهانێكە بۆخۆی، چونكە كارگێڕەكان هەرچی قسەو باس و خواسیان هەیە بەئاشكرا لای (ئەو)ـەكە دیارە قسەو ڕیاو نیفاقە، بازرگانی و بەرژەوەندی و خۆپەرستنە، ناخی (ئەو)ـەكە لەناوەوە شیتەڵ دەبێ و خۆی دەخواتەوە، ڕقی لەخۆی هەڵدەستێ.. دەیەوێ بنەڕێنێ بەسەریاندا ڕاستی خۆیانیان پێدا تف بكاتەوە، بەڵام.. ژیانەكەی، سیسرك و جاڵجاڵۆكەو قالۆنچەكانی ژوورەكەی پێیدەڵێن: نەكەی.. نەكەی.. برسێتی، ئاوی ڕووتكاندن، دەست پانكردنەوە، پلیشانەوەی ویژدان و زۆر شتی تریش چاوەڕوانت دەكەن، نەگبەت وەكو قسە ناكەی جارجار (با)یەكیان بدەیێ، گوێگرتن لێیان، سەر لەقاندن بۆیان.. گومرگە.. باجێكە چارت نییە دەبێ بیدەی.

بەجۆرە چیرۆكنووس دەتوانێ تەنیا چەند ساتێ بكا بەكەرەسەی كورتە چیرۆكێكی.

-مامۆستا نموونەیەكی تر.

-ڕۆڵە نموونە زۆرە، خۆتان بیر بكەنەوە، بۆ نموونە (ئەو)ێك دەیەوێ هەناسە بدا، بژی، ئاسوودە بێ، لەزەت لەژیان وەربگرێ، نەچەوسێتەوە، مافی مرۆڤانەی خۆی بدرێتێ، خەڵكی.. هەر هەموو خەڵكی خوش بوێ، بەڵام ناهێڵن.. ناهێڵن.. نا.. نا.

مامۆستا دەستی بەوێنەكەوە دەلەرزی، دەنگی گۆڕا، یەكێ لەقوتابییەكان بەنەرمییەكەوە:

-مامۆستا، بۆ ناهێڵن؟

-چونكە مرۆڤە.

-بۆ ئەوانەی دەوروپشتی چین؟

-بەشكڵ نا.. لەناوەوە دڕندەن، لەهەڵوێستدا گورگن، چونكە ناهێڵن خونچەكان بگەشێنەوە.

-باشە مامۆستا، كە ئەو (ئەو)ـە وا دەژی و ئەوە حاڵێتی ئیتر چ مەجبووری ئەم ژیانە نەگریسەیە؟!

-با.. لەباسەكە دەرنەچین و بڵێین ئەو (ئەو)ـە چیرۆكنووسەكە خۆیەتی، تەنیا خۆی مەبەست نییە، ژیانی (ئەوەكان)ی تریشی مەبەستە، دەیەوێ ئەوە لەخەڵكی بگەیەنێ كە ئەم جیهانە دڕندانەیە بگۆڕن بەجیهانێكی مرۆڤانەی ئاسوودەیی پڕ لەئاشتی و خۆشەویستی.

-باشە وا خەڵكی تێگەیاند، ئایا ئەو تێگەیاندنە چارەیە؟! ڕەنگە خەڵكەكە تێبگەن، بەڵام هێشتا پێویستیان بەدەسەڵاتە بۆ چەسپاندنی ئایدیا مرۆڤانەكەیان.

قوتابییەك لەژوور هەموویانەوە قسەی بەقوتابییەكەی تر بڕی:

-نێ وا ئێمە تێگەیشتین: چیرۆكی كورت چییەو باسی چی دەكاو چۆن نووسەرەكەی هەڵیدەبژێرێ و دەینووسێ، بەڵام دەسەڵاتمان نییە بینووسین، تەنانەت ئەگەر دەسەڵاتیشمان بوو وەك چیرۆكنووسەكە بینووسین، دیسانەوە

هـەر دەسـەڵاتی نووسـینەو هیـچی تـر، یـەعنی دوای ئـەوەی هـەمـوو بـووین بەئەدیب.. ئیتر چی! دوای ئەوە **so what** چی؟

مامۆستا گوێی باش بۆ قوتابییەکە راگرتبوو گەرچی بـەقووڵی دەیڕوانییـە وێنەکەی دەستی، لەبەرخۆیەوە چەند جارێك دوایین قسـەی قوتابییـەکـەی وتـەوە.. سـۆ وەت؟ سـۆ وەت؟ بـەدەم زەردەخەنەیـەکی پـڕ لەخۆشەویـستییەوە وێنەکـەی دەستی دڕاندو بەهەمان زەردەخەنەو نەرمییەوە پارچەکانی خستە جانتاکەیـەوەو بەدەم هەڵسانەوە پێی وت:

سۆ وەتە فەندی خۆت بچکۆلەی، بەڵام قسەکانت زۆر لەوە زلترن کە خۆشت تێیان بگەی، فەرموو سبەی کە نەهاتمەوە تۆ ئەم محازەرەیـە تـەواو بکـە، وا مـن سبەی نایەمەوە.

قوتابیـەکانی بەجێهێـشت، بـۆ سـبەی کـە قوتابیـەکان هاتنـەوە پارچـە قووماشێکی رەشیان بـەدەرگای کۆلیجەکـەوە دی، تێگەیـشتن مامۆسـتاکەیان راستیکرد ئیتر هەرگیز نایەتەوە، بەڵام نەیانزانی (سۆ وەت) بۆ دیار نییە؟

رۆژی دوای ئەوە حاڵی بوون لەوەی (سۆ وەت)یش ناتوانێ محازەرەکـە تـەواو بکا، چونکە پارچە قووماشە رەشەکە ببوو بەدووان.

١٩٧٤-١٩٧٥

لەگۆڤاری رۆشنبیری نوێ

ژمارە ٤١ ساڵی ١٩٧٥ بڵاوکرایەوە.



## نموونەی دراما

# فایەق-ی سایەق

دلشاد مەریوانی

-١-

(تایتلەکان بەدەم ئەم دیمەنە بەرکولەوە نیشان دەدرێن لەتایتلی گرنگدا ستۆپ کادر ڕۆڵی خۆی دەبینێ)

لۆریەکی بار بەبەردەم کامێرادا دەڕوا. کە پشتی دەکەوێتە کامێرە کلۆزی لەسەر دەکرێ. لەپشتەوە نووسراوە (مەحبووبەی فایەق) لەژێریدا نووسراوە (ئەگەر گوڵ نیت گەڵا بە) دەوروبەری ئەم نووسینانە بەگوڵ ڕازاوەتەوە. پاشان کامێرا لەجامی پێشەوە شۆفێرەکە نیشان دەدا کە فایەقی سایەقە. زەرفی هەیە وادیارە گۆرانی دەڵێ و بەستێرنەکە تەپڵ لێدەدا. جار نەجارە لەئاوێنەکانی بەردەم و ڕاست و چەپییەوە دەنوارێتە دواوە.

گۆرانییەکەی ئاوازی فۆلکلۆرەو لەگۆرانییە کۆنە تایبەتەکانی شاری سلێمانییە:

لەخڕەی نێری نێری هاوار کەتانە

لەماڵی دۆستان بێ سەر بەلەرزانە

دەچمە ناو لۆری سلف دەوەشێنم

لەئەگزۆزەوە —ئەی هاوار- دووکەڵ دەردێنم

لەخڕەی نێری نێری هاوار کەتانە

لەماڵی دۆستان بێ سەر بەلەرزانە

مەحبوزبەی فایەق وەکو بووک وایە

کلاجی نەرمە-ئەی هاوار-پێنج گێڕی تیایە

دەستی دیارە بەستێرنەکەوە پێچ دەکاتەوەو خۆی دەکا بەکۆڵانێکدا. لەبەردەرگای ماڵێکی گلێندا لادەدا. چاپووك و لەش سووك دێتە خوارێ. دووکاندارێك-لاکۆڵان- لەوبەر ماڵی ئەمانە فایەق-ی سایەق مەرحەبای لێ دەکا

فایەق: مەرحەبا کاك عەبدوڵڵا.

عەبدوڵڵا: سەرچاو ماندوو نەبی.

فایەق: بێ وەی بی.

(فایەق بەدەوری لۆریەکەدا دەگەڕێ. بەلەپی دەست و بەنووکی پێ دەکێشێ بەتایەکاندا. دەرگای ماڵەکە دەکرێتەوە ژنێکی بەساڵاچوو دەردەکەوێ. فایەق واز لەکارەکەی دێنێ و بەرەو ڕووی دەچێ)

فایەق: چۆنی دایەگیان (دەستی دایکی ماچ دەکا. دایکی سەری ئەم ماچ دەکا)

دایك: بەخێربێیتەوە کوڕم. (دەچنە ژوورەوە. بەدەم چوونیان بۆ هەیوانەکە) خۆ هیچ ڕووینەداوە؟ خێر بوو را سەفەرەکەت تەکرد؟

(بەرە داخراوە، سەماوەر گیزەی دێ. فایەق دادەنیشێ)

فایەق: نانم خواردووە چایەکم بۆ تێکە. کابراش تەگریس دەرچوو.

دایك: چۆن؟ قسەم بۆ بکە.

فایەق: دەڵێ ئێوارە کە لەبەغدا بارمان کرد دەبێ بێینە باقووبە شەو لەماڵی کچەکەم بم و بۆ سبەی بکەوینەڕێ. وا دەزانێ لۆریەکەم دۆزیوەتەوە.

دایك: نێ کوڕم قەیچییکە ئەوا بارەو لەلۆریدایە خۆ بەکۆڵی تۆوە نییە. بۆ پارەکەت لەکیس خۆت دا؟

فایەق: (بەدەم تێکدانی چایەکەوە) دایەگیان مەکینەش وەکو ئینسان وایە. دوازدە سەعات بەدەتەن ماڵەوە رابگیرێ گوناهە. مەگەر سایەق خۆی لەزمانی مەکینە بزانێ. بەسەری تۆ ئەو مەکینە بەستەزمانە کە بەبارەوە گێڕێکی هیلاك دەبێ و داوای گێڕ گۆڕین دەکا، یەك ناڵە ناڵ و هاوار هاوارێتی هەر ئەوە نییە ناگری، جا بۆ ناگرێ؟ گریانی ئەو وایە. خۆش خۆشیش پێم دەڵێ (لاسایی دەکاتەوە) تۆ سایەقی و لۆری خۆت نییە، ئەم حەکایەتانەم بۆچی بۆ دەکەی؟ (ئاسایی دەبێتەوە) وا دەزانێ هەموو سایەقێك سایەقە، با لۆری خۆشم نەبێ، ئاخر کلۆڵی کەم ئەقڵ من نانی ئەو مەکینەو تایانە دەخۆم.

دایك: دەی کوڕم خوا کەریمە، ڕسق لای خوایە.

فایەق: ئامەننا.. بڕایەوە ڕێلی کە. شازدە ساڵە فایەق سایەقەو موخالەفەیەك لەئیجازەکەی نەنووسراوە. (ئیجازەکەی بەدەستەوەیە ماچی دەکا)

دایك: کوڕم هەر بێ وەی بی. من پەلەی ئەوەمە، مایەکەی زوو دەرچێ و حاجی سەر رووت وەعدەکەی خۆی بەجێ بهێنێ.

فایەق: دایەگیان حاجی پیاوێکی چاکە لەسەر وادەی خۆیەتی، هەر مایەکەی دەرچێ، نیوەی لۆریەکە دەکا بەهی من و دەبینە شەریکی، ئەوسا ئەمە دەفرۆشینەوە یەکێکی تازە دەکڕین، چونکە حەز لەمەکینەی کۆن ناکەم.

دایك: کەواتە هەروەك ئێستاتان لێدێتەوە.

فایەق: نا ئەوسا وەك یەك شەریك دەبین و من هەقی سایەقییەکە پارەی خۆمی لێ لادەدەم.

دایك: هەر بێ وەی بی، تۆ سەرڕاستی لەگەڵیدا، پیاوی سەرڕاست شەریکی دەوڵەمەندە، بۆیە لێت رازییە، تۆ بەهۆی داوودەرمان و دکتۆری رەحمەتییەکەی باوکتەوە زۆر لەبرادەرانت دواکەوتی. خوا عافووی کا هیچی بەدەستەوە نەهێشتین، ئەوەتا عەزوڵەی باجی سەفێ خوا لێی نەسێنێ وا کورەکەی دەچێتە مەکتەب، بەخوا تۆ ساڵەودەختینە بووی کە ئەو بوو، شەش حەوت ساڵە ژنی هێناوە.

فایەق: ئا تۆ ئەمەیان بڵێ، مەسەلەکەیە، خەمت نەبێ حەوتی تری بێ دیگرمەوە، مـن زۆرم حەز لەمنداڵە، دوو دوو تەسجیلیان دەکەم. سەرەو مەرەی ناوێ لەپاش نۆ مانگ ئامۆزا تەسلیمی دەکاو رەقەمیشی لێ بستراوە.

دایك: بەخوا وابزانم ئامۆزا پەلەیەتی و لەسەرمان ناوەستێ، دەی خوا کەریمە، ئەم بەیانییە زوو هەڵساوی بۆ تۆزێك ناخەوی؟

فایەق: (بەدەم هەڵسانەوە) نەوەڵڵا دەچم سەرێك لەگەراج دەدەم، ئێمە بەڵکە بیگرێ و کاروانێکی بەدەمەوە بێ. (دەست دەداتە کلاشەکانی بەهەڵکێشانی کامێرە دەگوێزرێتەوە بۆ دیمەنی دوای خۆی).

-٢-

(چایخانەکەی کاروان-ە لەگەراجەکەدا، فایەق کلاشەکانی دادەکەنێ و چوارمشقی لەسەر کورسی چایخانەکە دادەنیشێ).

کاروان: خەست و کەم شەکرەکەی خۆت!

فایەق: بەڵێ، ئەرێ کارە گیان ئەمڕۆ حەمە کۆرێنێت هاتە ئێرە؟

کاروان: (چاکەی بۆ دادەنێ) ئەها پێش تۆ لێرە بوو، فازڵ جەنازە هات بەشوێنیدا، دوو- سێ چرپەی لەگەڵ کردو بردی.

فایەق: دیارە ئەو سەگانە بەرەو دووڕیانەکە چوون، ئێستا دامەزراون ئەمان دامەزران.

کاروان: کاکە قەپاتن بۆ دانامەزرێن؟!

فایەق: وەڵڵا بابە قەپاتن، وەختێك فایەق سایەق بوو ئەوانێ بەلۆرییان دەووت- عووعە-

کاروان: دە ئێستا سەرو لەتیان هەیە.

فایەق: جا تۆخوا ئەوانە لەتن، بەشەرەفم لەتەکەی حەمە هەر بۆ سەربڕین چاکە.

کاروان: جا ئەگەر پاش سەربڕین و هەڵوەشاندنی پارچەکانی کەڵکی فرۆشتنی هەبێ.

فایەق: نا، لۆریەکەی حەمە پارچەی بەدەگمەن دەست دەکەوێ خۆی هەر ئەوەشە حەمەی دواخستووە، چونکە ئەو وەك فازڵ نییە کاسبی چاکە.

کاروان: هەر ئەوە نییە، بێ دڵی خۆشی ناکا، لەسەرێکیشەوە چاك دەکا، مام، بابە، ژن هیچی نییە، بەرەڵڵاو حەرەڵڵا.

فایەق: ئاخر هەتا کەی؟ خۆ دەبێ بیرێ لەدوو سبەی بکاتەوە وا سبەی نەخۆش کەوت، لێی قەوما، ئەی نابێ یەکێکی هەبێ دەنگێ حەپ و قومێ ئاوی بکا بەدەمەوە!

کاروان: ئەو گوێ ناداتە ئەوانە.

فایەق: ئاخر ئەوە کەرێتییەکەیەتی، بەشەرەف کە دایکم دەرپێ و فانیلەو کراسم دەشوا، لەحاڵی خۆم تەریق دەبمەوە، بەڵام دەڵێی چی؟ نییە، لەگەڵ نەبووندا چی دەکەی؟

کاروان: دەی خوا کەریمە، جارێ رایکێشە لەکوێدا پچڕا...

فایەق: گرتیەکی لێ بەدەرەوە، (پێدەکەنن) دیڕێ تێکە خۆ دەڵێی رۆژی ئاونووسی نفووسە، زەلام دیار نییەو یەکێك نالێ مەرحەبا.

(لەم دیالۆگەدا شەش حەوتێك بەمەرحەباو سەلام و عەلەیکوم خۆیان دەکەن بەژووردا).

-٣-

(دەمەو ئێوارەیێکی درەنگ و دووکانەکەی کاك عەبدوڵڵایە. فایەق دادەنیشێ و عەبدوڵڵا بەخێرهاتنی دەکا).

عەبدوڵڵا: سەرچاو هاتی.

فایەق: سوپاست دەکەم، چییە کاك عەبدوڵڵا دەڵێی ئەم ئێوارەیە بێ تالاوی؟!

عەبدوڵڵا: من و بێ تالاوی! بەس خۆت دەزانی لەبەر خەڵکی گەرەك و قسەو قسەڵۆك دفنم کردووە.

فایەق: (پێدەکەنێ) کارەبای سری فەیسە.

عەبدوڵڵا: کوڕە کارەبا چییە ئەمە کارەبایە.

فایەق: کوا؟ هەم؟ ها؟ (دەست بۆ ورگی عەبدوڵڵا دەبا) قەیناکە لێرەدا دادەگیرسێ، بەڵام سویچەکەی لەکوێدایە؟ (چاو بەم لاو ئەولای عەبدوڵڵادا دەگێرێ).

(عەبدوڵڵا تەنەکەیەکی شیری کردووە بەسەر پێکەکەیدا لەپەرداخێکی باریکدا دایناوە).

عەبدوڵڵا: بزانە چۆن سپی دەکاتەوە، گلێپی نیۆنە نیۆن.

(فایەق پێدەکەنێ، عەبدوڵڵا لەپڕ دەڕوانێتە دەرگای ماڵی فایەق کامێرا دەگوێزرێتەوە):

*بارۆکەیەك لەدەرگای ماڵی فایەق دەردەپەڕێ، دایکی فایەق بەدوایدا، فایەق و عەبدوڵڵاش بەخۆو دارشەقەوە بۆی دەردەپەڕن، بەمزمی گرتنی بارۆکەکە تاوێك مەشغوڵیان دەکا، تا دەیگرنەوە دەیدەنە دەستی دایکی

فایەق لەقیڕەو قیژەو بگرەو بەردە زیاتر ڕستەی سەربەست لەم دیمەنەدا نییە*

(عەبدوڵلاو فایەق دەگەڕێنەوە دووکانەکە، هەناسەبڕکێیان پێکەوتووە)

عەبدوڵلا: دەك خوا فەوتت کار بەسەر قبوڕلێەوە بتبینم، دارشەقەکە هەڵدەسپێری.

فایەق: (پێدەکەنێ) دە فەرموو ئەم ئێوارەیە مریشکمان هەیە.

عەبدوڵلا: دەزانم هەموو ژەمێ مریشکتان هەیە، بەڵام بەزیندوویی، جارێك وات لێکردووم نایکەم بەدوو.

فایەق: (پێدەکەنێ) بیرت نەچۆتەوە؟

عەبدوڵلا: ئەرێ بەجددی تۆش ئیشی قۆڕ دەکەی ئەم کەڵەشێرو مریشك و بارۆکانە چییە ڕاتگرتوون هەمووش کوردی، عەجوول، نەگریس، هەر ئەوەیان ماوە بووەڕن، مریشکە ئەجنەبییەکان نەبێ لەگەڵ پست لێکرد.. فس دەداتەوەو بەئاسانی دەیگری.

فایەق: نایزانی، ئیشت نییە، ئەمانە جوان و پەڕ ڕەنگینن، بەخوا هەر بۆ ڕاگرتن جوانن، ئەو ڕۆژە کەڵەشێرێکی حیزەڵم کڕی لەو کوڵنە بێ کلکەکان بەشەرەف هەر حەز تەکەی تەماشای بەرگەردنی بکەی.

عەبدوڵلا: کوڕە دە تێیان هەڵدە بوون بەمایەی ژان و ئەزێت بۆ ئەو پیرێژنەی دایکت.

فایەق: ها.. هە، تا لەمەشیان نازانی، ئەسڵەن لەبەر خاتری دایکم سەریان نابڕم.

عەبدوڵلا: کوڕە دایکتی چی؟ جار نییە دادو بێداد نەکا لەدەستیان لای من جاری وا هەیە نیو سەعات سکاڵام لا دەکا.

فایەق: باشە لەسەرخۆ... لەسەرخۆ، تۆ مێشکی خۆت ساف بکە با حاڵیت بکەم.

عەبدوڵلا: ئەمیش مێشك سافکردنی دەوێ؟!! باسی مریشکم بۆ دەکەی خۆ باسی ترێلە تازەکانم بۆ ناکەی!

فایەق: دەتۆ فڕیکە.

عەبدوڵلا: (بزە دەیگرێ، قومێك دەخواتەوە) ئەوا قومێکیش ڕۆیشتین فەرموو باسی ئەم دەبڵ ئەگزۆزەمان بۆ بکە.

فایەق: ها.. هە، کاکە ئینسان بەکارو بزووتن و هەڵسوڕان تەندروست و چاك دەژی، هەتا تەمەنی بەرەو ژوورتر بڕوا وەك چۆن پێویستی بەپشوو هەیە ئاواش پێویستی بەکاری لەقەدەر خۆیی و وەرزش هەیە.

عەبدوڵلا: بۆ نالێی مریشك دومبلسە، داتناون دایکت وەرزشی پێ بکا؟!

فایەق: مریشك دومبلس نییە، بەڵام وەرزشی پێدەکرێ، دایکم لەتەمەنی دومبلسدا نییە، بەڵام دێ و دەچێ، دانیان بۆ ڕۆ دەکا، ئاویان دەداتێ، جێگۆڕکێیان پێدەکا، قسەیان بۆ دەکا، ئەو تەنیایی و بۆشایی ڕۆژانەیەی هەیەتی بەوان پڕی دەکاتەوە وەك هاودەنگ و برادەری وەهانە، ناوی لێناون، ئەمە کونجەیە، ئەوەیان پۆپنە لارە، ئەوی تریان گەردن زێڕە، یەکێکی تر کڵاو لارە.

عەبدوڵلا: بەو حسابەی تۆ تەسکەرەشی بۆ دەرهێناون.

فایەق: مەسەلەکە بەفشقی بازاڕ ڕەرمەگرە، باشە گەر ئەوان نەبن ئەو بۆشاییە بەچی پڕکاتەوە خۆ ئەم وەك ژنانی تر تاقەتی گوڵەبەڕۆژە کرتاندن و دانیشتنی بەردەرگای نەماوە، لەبەرئەوە کە دێتە لای تۆ باسی مریشکەکانت بۆ دەکا.

عەبدوڵلا: خۆ قسەکانت تاڕادەیەکیش ڕاستن، بەڵام بەخوا من ئەقڵم بۆ شتی وەها نەدەچوو.

فایەق: بڕوات بێ ئەو پێکە چەند تۆ سەرگەرم دەکا، گارە گارو قووقەو قرتەی ئەوانیش دە قات دایکم سەرگەرم دەکەن.

عەبدوڵلا: بێ قەزابی ڕاسان لێ مەکە دووکانەکەسان بکەین بەدەواجن.

فایەق: بەسەری خۆم جارێك بەقسەیم کرد مریشکێکم سەربڕی، هەتا یەك مانگ ناڕاستەوخۆ باسی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی وتی سەری بڕە شەوی بەرات دەیخۆین.

عەبدوڵلا: چۆن باسی دەکرد؟

فایەق: کاکە چووزانم مەگەر خۆی بزانێ، ئەوەندە گەرای لەسکدا بوودو ناوەخت نەیخوێندووەو بەپۆپنە لەکەڵەشێر چووەو شاخی وابووەو باڵی وابووەوە.. ئیتر.

عەبدوڵلا: (قومێك دەخواتەوە) بابە هیچ وازمان هێنا، با ئەمەش لەچاوی مریشکی دومبلس بێ (پێدەکەنن، کامێرا دەگوێزرێتەوە بۆ دیمەنی دوای خۆی).

-٤-

(کامێرا هەمان پێکەنینی فایەق دەگرێ کە سەرلەبەیانی دەموچاوی شتووە، بەرامبەر دایکی دانیشتووەو بەخاولی دەستی دەسڕێ و پێدەکەنێ سەماوەر گیزەی دێ).

فایەق: ئێ دایەگیان، ئێستا هەر لەبەر ئەو خەوەی دیوتە دەبێ ئەو مریشکە کونجە جوانە سەربڕم؟

دایك: کوڕم خەو بۆی هەیە، گەنجی ئێستا گاڵتەی بەو شتانە دێ، خۆ من کونجەم لەهەموویان خۆشتر دەوێ، هەندێك ڕۆژ دوو هێلکە دەکا، بەڵام دەبێ سەری بڕیت و بیکەی بەقەزاوەگێڕی سەری خۆت.

فایەق: باشە دایەگیان بەشکو من بەڕاستی گەنم لەسەر سەری خۆم دانابێ.

دایك: ئەو قسانەم بۆ مەکە، لەخەوەکەمدا لەسەر سەرت نیشتبووەوەو خێرا خێرا دەنووکی دەدا بەسەرتا، یەعنی.. وەی بیسمیللا. بەقوربانی یەك دەقیقەت بێ، دەبێ سەری ببڕی و تۆش سەری ئەو بخۆی، لەوانەیە سەرەخۆرە بێ.. بیسمیللاهی ڕەحمانی ڕەحیم.

فایەق: باشە دایەگیان کە هاتمەوە سەری دەبڕم.

دایك: بەخوا بەخوا لەم ماڵە دوورپێت ناچێتە دەرەوە تا سەری نەبڕی، نامەوێ باوکم مریشکم ناوێ و پڕ بازاڕیشە لەهێلکە.

*(گفتوگۆ جددی دەبێ، بەڵام دەنگ نامێنێ، مشتومڕەو کامێرا ئەوانە بێدەنگ دەگرێ تا رازی بوونی فایەق و چەقۆ هەڵگرتنی و دایکی کە بەباڵ مریشکەکەی بۆ دێنێ و دەیدادەتە دەستی. پاشان سەربڕینی لەلایەن فایەقەوەو هەڵبەزو دابەزی مریشکە سەربڕراوەکە لەکادری کامێرادا، دیمەن دەگوێزرێتەوە بۆ دوای خۆی).

-٥-

(هەڵبەزو دابەزی مریشکە سەربڕراوەکە تێکەڵ بەهەڵبەزو دابەزو قیڕەی دەعم و خوێنی مریشکە سەربڕراوەکە تێکەڵ خوێنی سەری فایەق دەبێ کە لەلۆریەکەدایەو پاش دەعمەکە بەسەر سوکانەوەیە، موئەسیراتی دەنگ دەبێ ڕۆڵی کاملی خۆی شانبەشانی کامێرا ببینێ).

-٦-

(جێگەیەکە لەخەستەخانە، فایەق پاڵکەوتووەو سەری پێچراوە، دایکی بەدیارییەوەیە، پزیشکێك فەحسی دەکا، دیمەنەکە لەسەرەتادا بێدەنگە، پزیشك فەرمان دەردەکا، بەعەرەبانە فایەق دەگوێزنەوە بۆ ژوورێکی تایبەت، دایکی فایەق پەرێشانە، پزیشك بەئامێری تایبەت فەحسی چاوی فایەق دەکا، پاشان بەبزەوە دەست دەدا بەشانی فایەقدا نیشانەی چاکی، کە چاوی هیچی نییەو فایەق دەگەڕێننەوە ژوورەکەی خۆی، لەسەر جێگەکەی دایدەنێن، سیستەرەکە دەڕوا، دایکی و فایەق بەتەنیا دەمێننەوە).

دایك: کوڕی خۆم، فایەق گیان.. (پەشۆکاوە)

فایەق: دایەگیان بڕوات بێ چاوم هیچی نییەو زۆر باشم، خۆ ئاگات لێبوو دوکتۆر دڵنیای کردم کە هیچی نییە.

دایك: دڵم نەوعێکە.

فایەق: دڵت هیچی نەبێ، ئەوەتا زرپ و زیندوو و جوان دەتبینم ئەوە گوڵدانێکە (دەستی بۆ درێژ دەکا).

سەرنج: دیالۆگی فایەق لێرە بەدواوە بەگوێرەی ئەو ژوورە دەبێ کە کامێرا وێنەی تیادا دەگرێ، واتە فایەق-ئەکتەر- ئەو شتانە باس دەکا کە لەژوورەکەدا هەن، پەنجەرەی جۆری تاکەکانی، گڵۆپ... تاد، وەلێ فایەق لەهەندێك شتی وردەکارەدا هەڵە دەکا، بەڵام دایکی چ لەبەر کزی چاوی خۆی، چ لەبەر خۆشی ئەوەی چاوانی کوڕەکەی باشن بەو هەڵە وردانەی فایەق نازانێ.

فایەق: ئەیچۆن دایەگیان.

دایك: شوکور بۆ تۆ خوایەگیان، باشە کوڕم دڵم ئیسراحەتی کرد.

فایەق: (پێدەکەنێ) بەس دایە بەخوا تۆ ئەو مریشکە کونجە جوانەت بەخۆڕایی بەمن سەربڕی.

دایك: بەقوربانی سەرت بم، هەزاری وەهات دەکەم بەقوربان، کێ دەڵێ گەر سەرت نەبڕیایە خوانەخواستەو گوێی شەیتان کەڕبێ ئەو قەزاو قەدەرە خراپتر نەدەبوو؟

فایەق: ئەی کێ ناڵێ من لەئاهی ئەو کونجە بەستەزمانە وام لێنەهات؟

دایك: قسەی بەتاڵ مەکە، من خەوی خۆڕایی نابینم، دەڕۆم بەیانی زوو دێمەوە، جگەرت بۆ دێنم بۆ خوێنەکەت باشە.

فایەق: دایەگیان بڕوات بێ پێویست ناکا، ئێستا وەك جاران نییە خواردنی باشمان هەیە، جگە لەوەی دوکتۆر وتی دوو ڕۆژی تر مەرەخەست دەکەم.

دایك: چۆن دەهێڵم نانی ئێرە بخۆی؟

فایەق: تکات لێدەکەم نەبەو بەیانی زووەوە وەرە نەهیچ بێنە، هیچم نییەو چاك و باشم.

دایك: کەیفی خۆتە من هەر دێم، بەیانیان زوو هەڵدەسم بەخوا دوای نوێژی بەیانی کە پاڵدەکەومەوە دوور لەدینەکەم هەر گورگەخەوە، ئەگینا خەوم لێناکەوێتەوە.

(سەری ماچ دەکا، دووعاخوازی دەکاو دەڕوا، هەر کە دایکی دەچێتە دەرەوە فایەق هەڵدەسێ، هەرجارەی چاوێکی خۆی بەلەپی دەستی دەگرێ و ڕوانینی خۆی تاقیدەکاتەوە، دەستکاری گوڵی ناو گوڵدانەکە دەکاو دەڕوانێ، جارێکی تر تەرتیبی گوڵەکان دەگۆڕێ و دوور دەکەوێتەوە ئینجا دەڕوانێ، کەمێك سەغڵەتە)

فایەق-دیالۆگ: ڕەنگە سپییەکە تێکەڵ دەبێ، ئەوانەی دوو دوون و لەیەك نزیکن تیشك دەدەنەوەو تێکەڵ دەبن، هەر بەیەکێکی ناڕۆشن دەیانبینم.

زۆر دووریش نیم لێیان، باشە ئەی لەجامی لۆریەکەوە چۆن شت دەبینم، چۆن حسابی خاوکردنەوەو ئیستۆپ و ئەمانە بکەم! ئەوا لەڕاستە شەقامدا قەیناکە هەڵوێستی خۆم دەتوانم دیاری بکەم! ئەی لەلۆفەدا کە پێچ دەکەمەوەو کتوپڕ دیمەنی شتەکان دێنە پێش چاوم؟! ئەی ئەوەیان چۆن؟ زۆر موشکیلەیە. تۆ بڵێی کە برینەکەی سەرم چاك بوو ئەمیش چاك نەبێ. بەهەرحاڵ دەبێ نەك لەدایکم بەڵکە لەهەموو کەسی بشارمەوە تادەگەمە ئەنجامێك، دەنا ئیجازەی سایەقییەکەم لێدەسێننەوە، هەقی خۆشیانە، ئاخر منیش هەقی خۆمە. لەوە زیاتر هیچی تر نازانم. ئەی چی بکەم؟ کەیفی خۆمە قابیلە ڕۆحی ئەو عالەمە بەلاشە لەبەردەستما!! بەڵام نا.. نازانم چی بکەم!! نازانم!!

(دەموچاوی خۆی بەلەپی دەستانی دەشارێتەوەو دیمەن دەگوێزرێتەوە بۆ دوای خۆی لەقفلی دیالۆگی -نازانم-دا)

-٧-

(دایکی فایەق لەبەردەمی دووکانەکەی عەبدوڵلادایە، گفتوگۆ دەکەن، لەوە دەچێ دایکی فایەق وەڵامی هەواڵ پرسینی فایەق بداتەوە)

دایك: نازانم، خۆی دەڵێ باشم، منیش باش نایبینم، خوا ڕەحم کا.

عەبدوڵلا: ئامین، ئینشەڵلا سەلامەتەو هیچی نییە، بەس دڵی دایك وەهایە، مادام دوکتۆر خۆی وتوویەتی دوو ڕۆژی تر دەری دەکەم مانای ئەوەیە هیچی نییە، بێ خەم بە.

دایک: خوا خەمت نەداتێ، خواحافیز، (دەیەوێ بڕوا)

عەبدوڵڵا: دایەگیان هەرچی لەدەست من بێ قسوور ناکەم، چیت پێویست بوو خزمەتکاریت دەکەم، خوات لەگەڵ.

دایک: خوا ڕەحم بەهەموومان بکا، بابچم بەلای ئەو مریشکە بەستەزمانانەوە بەخوا ئێستا تینوێتی پرزەی لێ بڕیوون. خواحافیز (دەڕوا، عەبدوڵڵا بەسۆزەوە تێی دەڕوانێ و پاشان لەبەرخۆیەوە وەك قسە بۆ خۆی بکا)

عەبدوڵڵا: فایەق کوڕێکی چاپووك و کاسب و زیرەکە تێدەگا، لەم دنیایەی ئەمڕۆ تێدەگا، خوا بەدڵی خۆی لەگەڵ بکا.

(دیمەن دەگوێزرێتەوە بۆ دوای خۆی)

-٨-

(ماڵی فایەق، هەیوانەکەیەو فایەق لەجێدایە بەڵام پاڵ نەکەوتووەو شانی داداوەتە سەر سەرینێکی بەرز، کاروان کراسێکی میلداری لەبەردایەو عەبدوڵڵا دارشەقەکەی هەڵسپاردووە بەدیوارەکەداو بۆ دیدەنی هاتوون بەبۆنەی دەرچوونی لەخەستەخانە)

فایەق: ئەرێ وەڵڵا کاکە ئاوا لەخوت و خۆڕا بەناشیێتی خۆی هاتە سایەدەکەم و منی ناچاری دەرچوون کردو ئاوای کرد کە کردی.

کاروان: ئەی ڕاپۆرتی مرور دەڵێ چی؟

فایەق: جا چی ناڵێ؟! باوکی دەسووتێنن بەڵام پاش چی؟! پاش ئەوەی پەکی منی خست!

(دایکی فایەق شەربەتیان بۆ دێنێ)

دایک: کوڕم ناشکور مەبە، خوا زۆر لەوە خراپتری لایە.

فایەق: دایەگیان ناشکوری نییە، گلەییەو لەبەختی خۆمی دەکەم.

دایک: هیچ نییە کوڕم، شوکور سەلامەتی، شوکری لازمە.

عەبدوڵڵا: بەخوا باوکم شوکری لازمە، حەمەبزەی ئێمە دووساڵە بەدارشەق دەڕواو قاچێکیشی پلاتینە.

کاروان: (سەرسامە) بۆ حەمەبزە چی تۆیە؟

عەبدوڵڵا: دایك و باوکمان خاڵۆزاو پورزان.

کاروان: ئینجا خۆ لەگەڵ کاکیشمدا ئاوەڵزاوان.

فایەق: کەواتە ئێوە خزم دەرچوون و ئەوا منیشی لێ دەرچووم.

عەبدوڵڵا: باوکم شارەکە ئەندك و دۆندك لێکی بدەیتەوە هەموو سەرو بنی یەك دەردەچن.

کاروان: دوێنێ هاتە چایخانەکە چایەکی لا خواردمەوە، پارەم لێ وەرنەگرت چونکە دەزانم دەستی کورتە، بەس باشە شوکر یەکێك لەدارشەقەکانی فڕێداوە.

عەبدوڵڵا: مانگێك نابێ کردوویەتی بەیەك دار، کاکیشم (دەست بۆ فایەق درێژ دەکا) شوکر ساغ و سەلامەتەو گلەیی لەبەختی خۆی دەکا، ئەی ئەگەر مەسەلەکەی تۆ دەعمە تەماشای مەسەلەکەی من بکەی دەڵێی چی؟ فەرموو ئەوە بیست و دوو ساڵە ئەو دارشەقە بنباڵی بەرنەداوم و دەبێ هەر بەریشی نەدا.

فایەق: توخوا باسەکە مەهێنە پێشەوە، زۆر پێی پەست دەبم کە باسی ئەو سزادانە دەکەی دانەچێڕەم پێدەکەوێ.

عەبدوڵڵا: نەبابە نا، کای کۆن بەباکردنە، دەی پشت بەخوا کۆتایی ناخۆشی و دەردو بەڵا دەبێ (هەڵدەسێ و دەست دەداتە دارشەقەکەی).

کاروان: (هەڵدەسێ) گوێی مەدەرێ ئینشەڵڵا بەم زووانە دەکەویتەوە گرمە گرمی خۆت.

(دووعاخوازی دەکەن، فایەق دەیەوێ هەڵسێ ناهێڵن)

کاروان: توو سەری دایە ئەگەر هەڵسی.

(دەڕۆن، دایکی فایەق دووعاخوازیان لێ دەکاو تا دەرگا بەرێیان دەکا، فایەق تەنیا دەمێنێتەوە).

فایەق-مەنەلۆگ-: چاوانم پەکیانە، سیمای عەبدوڵڵاو کاروانم لا ڕۆشن نەبوو تا نزیك بوونەوە، قەیناکە بەدەنگ زانیم ئەوانن! خۆ کراسە میلدارەکەی کاروان هەر لام تەلخ بوو تا تەواو نزیك بووەوە، لای دەرگاکەوە دارشەقەکەی عەبدوڵڵام لێ ببوو بەمناڵێك، یان با بڵێم تاپۆی مناڵێك کە دەستی گرتبێ، فایەقیان سایەق وتووەو هیچی تریش نازانم، بەڵام من خۆم دەناسم، من پیاوی ئەوە نیم درۆ لەگەڵ خۆم و خەڵکدا بکەم، دەبێ هەوڵ بدەم چارێکی خۆم بکەم، دەنا دەبێ خۆم خەبەر لەخۆم بدەم و ئیجازەکەم بیبەمەوە بۆ مرور، تەق و بێ گوناهێکم کرد بەژێرەوە، بڵێم چی؟ مەگەر تا ماوم تەماشای ئاوێنە نەکەم، یان کە تەماشام کرد، تف لەخۆم بکەم، چەند ڕۆژێکی تر دەچمە لای پزیشکێکی پسپۆڕی چاو گەر چاری بوو ئەوا بوو، گەر نەبوو، بەدەستی خۆم ئیجازەکەم دەبەمەوە، خۆ نامرم لەبرسا، کەی باوی ئەوە ماوە خەڵك لەبرسیدا بمرێ.

(دایکی دێ شەربەتێکی پرتەقاڵی بۆ هێناوە)

فایەق: دایەگیان پێم ناخورێتەوە.

دایك: کوڕم نابێ، بۆ خوێنت باشە.

(فایەق دەست بۆ پەرداخەکە دەبا، دوایی دیمەنەو گواستنەوە بۆ دیمەنی دوای خۆی).

-٩-

(کامێرا دەست بۆ بردنی شەربەتەکەی دیمەنی ڕابردوو، دەکا، بەدەست بۆ بردنی دوکتۆری چاو لەژووری تایبەتی خۆیدا بۆ کردنەوەی چاوی فایەق کە بەرامبەری لەسەر کورسییەك دانیشتووە، دوکتۆر جەنجاڵە بەتیشك بەلایت بەعەدەسە بەئامێری تایبەتی خۆی خەریکی پشکنینی چاوانی فایەقە، دیمەنەکە بێدەنگ بەردەوامە هەتا دوایی پشکنین. پاشان)

دوکتۆر: حەز ناکەم درۆت لەگەڵ بکەم، چاوانت ناتەواون، لەم حاڵەشدا دەوەستن، بەڵام بەداخەوە عەدەسەش، واتە عەینەکیش چاریان ناکا، چونکە مەسەلەکە پەیوەندی بەو سەدەمەیەوە هەیە، جا نازانم خۆت بایی چەند رادەگری بۆ ئەم ئەنجامە.

فایەق: (خەمناکە) بڕیاری خۆم داوە، کارێك ناکەم پێویستی بەچاو بێ.

دوکتۆر: (پێدەکەنێ) زۆربەی هەرە زۆری کار پێویستی بەچاوە.

فایەق: ئەو چاوەی تۆ باسی دەکەی جیایە، مـن فایـەقی سـایەقم دەبـێ ئیتر وا نەبم، خۆم ئیجازەکەم دەبەمەوە بۆ مرور.

دوکتۆر: (سەرسامە) هەی بژیت، من هێند خۆشحاڵم بەو مەردایەتیەت نەراپۆرتت لـێ دەنووسم بـۆ مـروری کـە ئەمـە ئـەرکی سەرشانمە، چـونکە پەیوەندی بەبەرژەوەندی گشتییەوە هەیە، نە یەك فلسیشت لێوەردەگرم.

فایەق: نا دوکتۆر ئەرکەکەت مافێکی رەوای خۆتە.

دوکتـۆر: بـەڵام مـافێکی رەوای خۆشـە بەرامبـەر بەویـژدانێکی رەواو زیندوو واز لەو مافەم بهێنم، سەرچاوی من هاتی، مادام درۆ لەگەڵ خۆت و خەڵك ناکەی.

(دیمەن دەگوێزرێتەوە بۆ دوای خۆی)

-١٠-

(دەمەو ئێوارەیەکی درەنگە، فایەق لەدووکانی عەبدوڵلایە، سـەغڵەتە، گفتوگۆ دەکەن، کامێرا دیمەن دەگوێزێتەوە، دوادیالۆگ دووبارەدەبە)

فایەق: نا.. درۆ لەگەڵ خۆم و خەڵك ناکەم، ناتوانم.

عەبدوڵلا: مـن نـازانم کـاری چـاوت چـۆنەو بـایی چـەندە، بـەڵام گـەر جیاوازییەکە ئەوەندە زۆر نییە، ئەوا بەس بەتانییەکی دەویست، یەك بەتانیت پیادا بدایە، لای کەس باست نەکردایە کەس لەکەسـە، کـێ بـیری لەشتـی وا دەکردەوە؟.

فایەق: نا کاکە سەد حەکیم بەقەدەر دەرددداری نازانن، مـن خـۆم دەزانم بایی چەند وێرانم، ئەی ئەگەر بێ گوناهێکم شێلا.

عەبدوڵلا: برا تۆ لەسەرخۆ لۆری خۆت لێ بخوڕە، ئیتر بۆ کـەس دەکـەی بەڤێرەوە؟

فایەق: ئاگاداربە، تۆ لەمەش نازانی، کارەکەی من، سـایەقی، کـارێکی زۆر زۆر گرنگـە، هێنـدەی پەیوەنـدی بەخەڵکـەوە هەیـە، هێنـدە پەیوەنـدی بەخۆمەوە نییە، من لۆریم پێیە، مـەکینەیـەکم پێیـە ئیجازەی خستنەگەڕی ئەو مەکینەیە، لەئیجازەی رەشاش خراپترە.

عەبدوڵلا: قسەکانت هەندێکی ماقووڵە، بەڵام بـێ قـەزا بـی هەنـدێکی تری هێندەت زل کردووە سەرو بنی نییە، تۆ لەناو ماشێنێکدای، لـۆری بـێ پیکاب بێ، قەمەرە بێ.. هەرچی بـێ، هـەموو کەردسـەیەکی تیایـە، بتـەوێ سووك بڕۆی.. دەڕۆی، زانیت رێ چـۆڵە... خێـرا دەڕۆی، زانیـت خەتـەر هەیـە ئیستۆپ دەگری.

فایەق: کاکی برا، ئەوەی تۆ دەیڵێی لەدیوی دەرەوە راستە، بـەڵام بڕوانـە ناوەوە، بڕوانە گەوهەر، بڕوانە ناوەڕۆکی کارەکە، کە لێی قووڵ دەبیتەوە ئـای چی دەبینی، تۆ بەقەدەر مـن رێگاوبـان و کارسـاتی رێگاوبـان نـابینی، بـا نموونەیەکت بۆ باس بکەم، پێـرار نـا.. نـا بەسـرپێرار بـوو ئـاخ خ خ خ.. ئـەو کارەساتە چەندە وێرانی کردم.

(فایەق تەواو سەغڵەتە دەست و قاچی دەلەرزن)

عەبدوڵلا: ئێ ئێ چی؟ چۆن؟

فایەق: کە ئەو کارەساتەم بیردەکەوێتەوە، هـەموو لەشم دەنیشێتە سەر ئاو، (تەواو سەغڵەتە).

عەبدوڵلا: فایـەق گیـان تـۆ زۆر پەرێشانی بـۆ ئـەم ئـاوە تاڵـە ناقی ناکەیتەوە؟ تەواو رەنگت تێکچووە! من دڵنیام کە یارمـەتیت دەدا، بـڕوات بێ ئەمە (دەست بەپێکەکەوە درێژ دەکا) یارمەتیت دەدا.

فایـەق: (زۆر شـێواوو دڵگرانـە، کـە مـاوەیـەك دەسـتی عەبـدوڵلا بەدرێژکراوی دەبینێ لەحاڵی خۆیی و لەدەست راگرتنی ئەو شەرم دەیگرێ، بێ ئیختیار دەست درێژ دەکا وەك ئەوەی تینووی بێ یەك ژەمی قوومی لێ دەداو هـەمووی دەخواتـەوە، بەدەسـت باوەشێنی دەمـی خـۆی دەکـا) خـوا نەتگرێ چۆنت پێ دەخورێتەوە؟! ئەح کە تاڵ و توونە.. پەح!!!

عەبدوڵلا: تاڵیی ئەم ئەهوەنترە لەو تاڵییەی خۆتی لێ دەدزیتەوە.

فایەق: هەر ئاگرە.. ئاگر. ئەوە چییە؟!! ئەح چ بەڵایەکە!!!

عەبـدوڵلا: (پێدەکەنێ)ئەها... هەر لـەقومی یەکەمـدا ئـەو سـەغڵەتی و هەرایەت نەما! لەبری باسەکەت کەوتیتە باسی ئەمە، ئەها وایە؟ توو سـەری خۆت وەها نییە؟!

فایەق: نا.. نا هەر بیرمە، بەڵام ئەمە بۆ مۆڵەتێك مەشغوڵی کردم دەنا ئەمە قەت چاری تەواو نییـە، مـەگـەر ئـەوەی ویـستی بـەهۆی ئەمـەوە خـۆی لەگێروگرفت بدزێتەوە هەمیشە پێی بێ. کە هەمیشەش پێی بوو خوا بۆخۆی دەزانێ چۆن دەغەزار دەبێ.

عەبـدوڵلا: لێـت دا بەشـەرەفم بـەزۆریش بتـەوێ وەك یەکـەم جـارت لـێ بێتەوە کە باسەکەت دامەزراند.. وەهات لێ نایەتەوە، تۆ یەکەجار کـە بـیرت کەوتـەوە وا تێکچوویت وامزانـی ئـەها ئێستا.. نـا.. تـۆزێکی تـر پەرکـەم دەتگرێ و دەکەوی.

فایەق: کاك عەبدوڵلا کارەساتەکە زۆر گـەورەو دڵتـەزێن بـوو، هـەرگیز بیرناچێتەوە (دەست بۆ سەری دەبا) سەرم هێژ بووە.

عەبدوڵلا: چاکتر.

فایەق: (بیر دەکاتەوە پاشان وەك قسە بۆخۆی بکا) زانایـەك وتوویـەتی: ژن نیوەی کۆمەڵە، کابرایەکی زاناتر وتوویەتی: ژن نیوەی کۆمەڵەو دایکی نیوەکەی تریشێتی.

عەبدوڵلا: ئەڵلا.. ئەڵلا. بەرزە، الجنه تحت اقدام الامهات

فایـەق: (ئێـی دەروانـێ) ئێمـەی سـایەقیش، لامـان کۆمـەڵ دوو بەشە بەشێکی لەگەڵماندا سواردەبێ و بەشەکەی تری بەو رێگاوبانانەدا دەڕۆن کـە ئێمـە ئوتـۆمبێلی پیـادا لێـدەخورین، گـەر بیربکەینـەوە کارەکـەمان لێپرسینەوەی زۆر تیادایەو ژیانی هەموانمان لەژێر دەستایە، بەرپرسیارین لەژیانی خەڵکی.

عەبدوڵلا: ئەڵلا.. ئەڵلا، جوانە دەخۆش، بەشەرەفم لەسەر ئەو گەوهەرەش قوومێکی تریش دەڕۆی.

(پێکێك رادەگرێ. فایەق دوودڵە، کە دەستی عەبدوڵلا بەراگیراوی دەبینێ، شەرم دەیگرێ، کورج وەریدەگرێ و هەمووی دەخواتەوە)

بەس فایەق گیان وەها ناخورێتەوە تۆ دەڵێی تینووتە.

(مشتێك فستق دەخاتە دەستی فایەقەوە) ئەوەی بکە بەسەردا بەو حالە بخۆیتەوە لێت دەدا، دەبێ قوم قوم بێ.

فایەق: کاکە من چوورزانم، دایکم خواردوویەتییەوە؟ باوکم خواردوویەتییەوە؟ تۆ بڵێ وەهاو وەها، ئەوا زانیمان قوم قوم... بەڵام قومی چۆن؟

عەبدوڵلا: ئەها ئەه.. ئێستا تەواوە، ئەم پرسیارەتم بەدڵ بوو، پیاو کە شتێك نەزانێ دەبێ بپرسێ (خۆی جددی دەکا وەك ئەوەی مامۆستا بێ و وانەیەکی گرنگ بڵێتەوە)خۆی دووجۆر قوم هەیە، یەکەم قەیتان قەیتان لەسەرخۆ پێی دەڵێن بەغایی، دووەم قومی گەورە گەورە، بەڵام لەبەینەکەیدا زۆر دەوەستی پێی دەڵێن موغانی، بەس تۆ دەتوانی نەبەغایی و نەموغانی نیو قومی لێبدەیت و بەینەکەشی بخەی مادام سەردتاتە.

فایەق: (پێدەکەنێ) ئێ ئەمەی سێیەمیان کە تۆ باسی دەکەی یەعنی قومی عەبدوڵلایی.

عەبدوڵلا: (زۆر کەیف خۆشە، لەخۆشیدا نازانێ چی بکا) سوپاس، زۆر سوپاس فایەق گیان، تائێستا کەس ستایشی وەهای نەکردووم، یەعنی من وەهام لێ بێ خاوەنی دەنگ و رەنگی تایبەتی خۆم بم و وەها بناسرێم! هەر زۆر گەورەیە، ئەڵلا عەبدوڵلایی ئای لەسەر ئەم-یی یی-یە چیم بەسەرهات، ئەم سەقەت بوونەی قاچم و ئەم ئاوە تاڵەش هەمووی ئەنجامی ئەو فلانی و فولتانی یەیە.

فایەق: دەزانی باشم! ئا.. وەك بەخۆمدا دەڕوانم باشم، ئێستا ئامادەم شەمەندەفەریش لێبخورم و کەسیش نەکەم بەژێرەوە.

عەبدوڵلا: (پێدەکەنێ) بێگومان قومی عەبدوڵلاییت لێداوەو شەمەندەفەریش سکەی هەیەو کەسیش خۆی ناداتە بەری (دەیکا بەجددی) ئەرێ بەڕاست بۆ نابی بەسایەقی شەمەندەفەر.

فایەق: کاکە من فایەقی سایەقم، بێ ئەم شارە ئیدارە ناکەم، لێرەش شەمەندەفەر نییە، من ژیانەکەم زۆر دیاریکراوو ئاشکرایە، هەموو رۆژ گۆیژەو گڵەزەردەو پیرەمەگروون نەبینم، بەر سەراو مزگەوتی گەورەو گەراجەکەو دەموچاوی ئاشناو تایبەتی ئەم شارە دلگیرە نەبینم دڵم دەتەقێ هەر دەخنکێم.

عەبدوڵلا: ئەی کەواتە چی دەکەی؟

فایەق: هیچ ناکەم.

عەبدوڵلا: چۆن؟!!

فایەق: کاکە من هیچ نازانم سایەقی نەبێ، خەتای ئەو رەحمەتییەی باوکم بوو، لەقوتابخانە دەری هێنام بەبیانووی ئەوەی سنعات باشترە، پاشان حەزم دەکرد شانبەشانی فێربوونی سایەقی لای خاڵم فێری دارتاشی ببم، رێگای نەدام دەیووت مانگا دۆشین و قەزوان کرۆشتنیان نەوتووە، یەعنی کفرە ئینسانێك دوو سنعات بزانێ.

عەبدوڵلا: کای کۆن بەبا مەکە، بەقسەی من دەکەی هەر لەگەراجەکەی لای خۆتان دەلالی دەکەی، ئۆتۆمبێل دەشۆی، ئەوانیش هەموو برادەرتن و یارمەتیت دەدەن.

فایەق: تۆ ئەو پەرداخەم بدەرێ، با قومێکی عەبدوڵلایی لێ بدەم (عەبدوڵلا دڵخۆشانە دەیداتێ) بەهەموو تەقڵتەوە من، فایەقی سایەق، ئۆتۆمبێل بۆ ئەوانە بشۆم کە خۆم فێری سایەقیم کردوون؟!! کاتێك من سایەق بووم ئەوان بە..

عەبدوڵلا: (قسەکەی پێ دەبڕێ) بەڵێ دەزانم، جاری تر باست کردووە کە تۆ سایەق بووی ئەوان ئۆتۆمبێلیان دەووت تەتە.

فایەق: نەخێر پێیان دەووت عروعە.

عەبدوڵلا: ئێستا کاکە وا پێیان دەووت قورقە، بەڵام دنیا گۆڕاوە، تۆ گۆڕاوی، دەبێ رێگەیەکی تر بۆ ژیانت دانێی، دەبێ دەلالی بکەی، ئۆتۆمبێل بشۆی، ئەی چۆن دەژی؟ دەبێ بجووڵێی، کار بکەی.

فایەق: چۆن دەژیم؟ نازانم، سەرم قورسە، با بچم بخەوم، سبەی بیرێکی لێدەکەمەوە. (هەڵدەسێ بڕوا، عەبدوڵلا خەریکی پێك گرتنەوەیە).

عەبدوڵلا: دڵم پێی خۆش دەبێ قومێکی عەبدوڵلایی لێدە. (دەستی بۆ رادەگرێ)

فایەق: (بەپێوەیە) ئای کاك عەبدوڵلا، ماڵت ئاوا بێ، ئەو خەوەت بۆ هێنام کە ئیمشەو بەتەمای نەبووم، بەقسەت دەکەم (پەرداخەکە وەردەگرێ، قومێکی لێ دەدا) خواحافیز.

عەبدوڵلا: خوا ئاگادارت بێ (فایەق دەڕوا، پەرداخەکە بەدەست عەبدوڵلاوەیە) وا نەبووایە ئیمشەو بێ ئارام و پەرێشان دەبوو، فایەقی سایەق کوڕە نەگاڵتە، بەڵام دەڵێی چی ئەم چەرخەی بەدڵی خۆی بۆ ناگەڕێ، وەك بۆ من نەگەڕا. (دەڕوانێتە پەرداخەکەو بەقومێك هەمووی دەخواتەوە) هاهە با ئەم قومە فایەقی بێ.

-١١-

(هەیوانەکەی ماڵی فایەقە. بێ رایەخ، بێ گیزەی سەماوەر، رەق و تەق، فایەق دانیشتووە، خۆی مەلاس داوە بەدیوارەکەوە، حاڵی شڕە، ریشی هاتووە، پەرداخێك عەرەقی لەبەردەمدایە، چاوانی سوور بوون، گەرووی پڕە، بەدەنگی بەرز قسە لەگەڵ خۆی دەکا)

فایەق: نا.. هیچی نەبوو، بەخوا ساغ و سەلیم بوو، وتم: دایەگیان زۆرم برسییە چوار هێلکەم بۆ بکە بەهێلکەورۆن، سەلکێ پیازی سپیشم بۆ بهێنە، هیچی نەبوو.. بەخوا هیچی نەبوو

*(ئەم دیمەنە تێکەڵ دەنگی فایەق دەبێ:

دایکی هێلکەورۆنەکەی بۆ دادەنێ، فایەق خەریکی ناغنواردنە، دایکی بەدەم چا تێکردنەوە چەند جارێك سەغڵەتی دەنوێنێ و دەست بۆ پشتی خۆی دەبا)*

دەنکەکە: وتم دایەگیان چیتە.. وتی هیچ نییە کورم وابزانم کۆلنجم کردووە، پارووەکەم لەدەمدا بوو، هەلسام پشتی بشێلم.

*(دیمەنە تێکەلەکە: فایەق هەلدەسێ چەند جارێك دەست دەهێنێ بەپشتی دایکیدا، لەپڕ دایکی دەموچاوی گرژ دەبێ و شل دەبێ، لەسەر تەنیشت دەکەوێتە زەوی، فایەق خەریکی راوەشاندن و بانگ لێکردنێتی، فایەق تەواو تێك دەچێ، هاواری لێ هەلدەسێ، بەرەو دەرگا دەڕوا)*

دەنگەکە: هانام بۆ کاك عەبدوللا برد، بەپەلە فرێمان بۆ خەستەخانە، کەچی دوکتۆرەکە وتی: دلّی وەستاوە، ئاخر بۆ، بەخوا هیچی نەبوو، ساغ و سەلیم بوو.

*(عەبدوللا دێ بەدەنگەوە پەلاماری دەدەن، تارمایی پزیشکەکە تێکەلّ دەبێ کە ئەفسووسی خۆی دەردەبڕێ.. دیمەنەکە تەواو دەبێ. کادر رۆشن دەبێتەوە لەسەر دانیشتنەکەی فایەق لەهەیوانەکەدا)

فایەق: ئاخر بۆ، ئەو مایەی ئاسوودەییم بوو، چرای ئەم مالّە بوو، من بێ ئەو هیچم، ئەم دنیایە بۆ دەبێ وابێ؟ من هیچم نەبوو، گێلێکی ناشی هەموو شتێکی بەسەرهێنام لەنان پەیداکردنی کردم، لەڕۆشنی چاوی کەم کردم، دایکم هیچی نەبوو لەخۆوە دلّی وەستاو جێی هێشتم، بۆ ئەمانە دەبێ وابن؟

(قومێکی لێ دەدا، پەرداخەکەی هەر بەدەستەوەیە) ئەم حالّە نابێ وابڕوا، بەلاّم وا رۆیشتووشە.

(کاروان دێتە ژووری)

کاروان: چیتە کاك فایەق؟ لەکەیەوە لەدەرگا دەدەم، ئەمە حالّ نییە تۆی تیادای، خوا دەزانێ لەکەیەوە نانت نەخواردووە.

فایەق: (دەگری) بەخوا هیچی نەبوو، لەهەموو بەیانییەك لەشی سووکتر بوو.

کاروان: (دەست دەداتە بالّی) هەلّسە چاوەکەم، منیش برسیمە با بچین دووسێ شیش گۆشت بخۆین، کاکە ئیتر لەگەلّ قەزاو قەدەردا چی دەلّێی؟! چار چییە لەرێی هەمووماندایە.

(دیمەنەکە بێدەنگ دەبێ، فایەق تەواو پەرێشان هەلدەسێ لەنزیکی دەرگاکەوە چاوانی دەسڕێ، لەش قورس لەگەلّ کارواندا دەچێتەدەرێ)

-١٢-

(سەرچنارە لەدامێنی ئاوەکەی خوارەوە فایەق دانیشتووە، چارەکێك عەرەقی لەبەردەمدایە، دوو روبعی ئاسنی لەدەستدایە تێیان دەڕوانێ)

فایەق-مەنەلۆگ-: کوڕی شارەکە دەمناسن، منیش ئەوان دەناسم و پارە لەهەموو کەس وەرناگرم، پارە لەکەسێك وەردەگرم بەدلّ بیەوێ یارمەتیم بدا، ئەمەیان چاکترە لەوەی خزمەتکاری بۆ کەسێك بکەم خۆم فێری سنعاتەکەم کردبێ و ئێستا لەودیو لووتییەوە تێم بڕوانێ! (قومێکی لێ دەدا) کوێر بی فایەقی سایەق، ئای کە دنیایەکی هیچە، ئەو خوێڕییە خۆم لەسەر باوەشی خۆم فێری سایەقیم کردووە کەچی ئەمەندە پۆشتە دوێنێ لەگەراجەکەدا بەپەلەتیقەوە دەیووت: ئاگاتان لێ بێ کەس خۆی نەدا لەفایەق چونکە دەعامییەکانی لە-کوێت- نەبێ دەست ناکەوێ.. خ خ خ (دانە جیڕەی پێدەکەوێ) رەوشت نەماوە، ئاخر چۆن لەبرووت دێ، هەر لەبەرئەوەی خوا بۆی رەخسانوویت لەسیکس ویلی پرتەقالیدای؟ هەی هەزار رەحمەت لەگۆڕت کە وتووتە

بازاڕی دەهرە قیمەتی ئەشیا بەجێگەیە

مێشێك گەیشتە رووی نیگاری

ئا.. ئا.. مێش بەو پیسییە لەسەر رووی نیگارێك نیشتەوە لەخالّ دەچێ.

(هەلدەسێ، چارەکەکە دەخاتە گیرفانی، بەدەوروبەری خۆیدا دەڕوانێ)

تەماشای ئەم سروشتە جوانە، ئەم هەموو رازاوەیی و شیرینی و دلگیرییە، کەچی ئاخ خ بەداخەوە ئادەمیزادەکانی ناوی.. تەح کە دژوارن.. ئەمەو ئەوان ئاسمان و رێسمانن.

(دەڕوا.. کەمێك لارە دەکاو خۆی دەگرێتەوە)

گرنگ نییە، کوڕی شارەکە من دەناسن، منیش کوڕی شارەکە دەناسم، خۆیان دەزانن من پارە لەهەموو کەس وەرناگرم، ئەی چۆن دەبێ یارمەتیم بدەن، کوڕی شارەکە ئەبوونایە.

-١٣-

ئەم دیمەنە بێدەنگە، مۆسیقا رۆلّی خۆی دەبینێ، فایەق پاکەتە جگەرەیەکی پێیە، گوایە جگەرەی تاك دەفرۆشێ، بەلاّم تەنیا بۆ یارمەتی وەرگرتنە، بەڕۆژ لەناو بازاڕو چایخانەکان، بەشەو بەسەر مێزی باڕەکاندا دەگەڕێ، جار ناجارە قومێکی سەر مێزی دەدەنێ، لەشوێنی تایبەتیشدا قوم لەچارەکەکەی گیرفانی لێ دەدا، کە تیایدا نامێنێ، لای باڕێك یان عەرەق فرۆشێك پارەی وردە دەردێنێ و بایی پارەکەی بۆ دەخەنە چارەکە بەتالّەکەی گیرفانی، هەندێ جاریش لەپەنا دیوارێکدا دادەنیشێ پشوو دەداو جگەرە دەکێشێ.

-١٤-

(گەراجەکەیە-چایخانەکەی کاروان-ە سنووقێکی تەلەفۆنیان دامەزراندووە، فایەق سەرخۆشە دێتەژووری)

فایەق: کارەگیان رۆژباش.

کاروان: ژیانت باش، فەرموو با دیژێکت بۆ تێکەم.

فایەق: بەقەبری باوکم لەسەرچنارەوە بۆ ئەو دیژە هاتووم.

(سنوورقی تەلەفونەکە سەرنجی رادەکێشێ) ئەوە لەکەیەوە ئەم شتە پیسەیان لێرە هەلواسیوە؟

کاروان: دوێنێ.

کابرایەك: ئینجا بۆ پیسە؟

فایەق: پیسەو ئەولاتریش، سەگبابی وا بەپارە نەبێ ئیش ناکا، ئەی پیاوەتی؟ ئەی مەردایەتی؟ ئەی یارمەتی؟ نا نەوەللا هیچ نازانێ، دە تۆ هەلّسە یەك سالّ، یەك دانە سالّ بینێ بەگوێتەوە بزانە نوتق دەدا، بەلاّم کە پارەکەت کرد بەقوڕگیا وەك سەگ دەوەڕێ چۆنت بووێ قسەی پێ دەنێری و پێی دەهێنی، حەزدەکەی سەد جنێوی پێ بدە، بزانە گوێت لێناگرێ.

کاروان: (دیژلەمەکەی بۆ ڕاگرتووە) لەوە گەڕێ دنیاکە هەمووی وای لێهاتووە بەس پارە، بگرە دیژەکەت بخۆ.

فایەق: (بەکابرادا دەڕوانێ) ئەم برادەرە کوڕی شارەکە نییە بۆیە نایزانێ، برادەر، کوڕی شارەکە، هەموو شت دەزانن.

(لەم کاتانەدا گەنجێکی شێت-جەمال- خۆی دەکا بەژووردا)

جەمال: دایی ئا چایەکم بۆ تێکە (دارشەقەکەی دادەنێ و دادەنیشێ).

فایەق: بەخێر بێی دایی.

جەمال: بژی دایی گیان، تۆ شەکری خۆشت کردووە بەهەنگوین.

کاروان: (چاکەی بۆ دێنێ) ئەڵێی قاچت هەر چاك نەبووەتەوە؟

جەمال: دایی گیان ئەو ئۆتۆمبێلە نەیکردمایە بەژێرەوە ئێستا شەکر دەبووم.

※-فایەق-دیالۆگ-: بەقسەی شەیتانم بکردایە ئێستا دوو-سێ گەنجی ئاوایی دەبوونە قوربانی نارۆشنیەکەی چاوم، بەس نەبوو بەویژدانی خۆمم کرد※.

(دەنگی جەمال دێ، کۆمەڵێك گۆرانی دەڵێ لەهەریەکەی چەند دێڕێك، پاشان دێتە سەر گۆرانییەکی تایبەتی خۆی:

یاپراخ هەی یاپراخ یاپراخی چاکە-نەی هاوار یاپراخ برنجی تێکە گۆشتی زۆر تێکە شویتی تێکە... هتد)

(فایەق بەخۆیدا دێتەوە، هەڵدەسێ، شێوەی دایکی بۆ چەند ساتێك تێکەڵ دیمەنی خۆی دەبێ لەکادردا، دەچێتە دەرەوەی چایخانەکە، بەرامبەر دیواری گەراجەکە دەوەستێ)

※فایەق-مەنەلۆگ-:

ئای دایەگیان لەکەیەوە یاپراخم نەخواردووە! ئەمە کەی حاڵە منی تیادام! وەها بۆم ناچێتە سەر، دەبێ کاسپی بکەم، دەبێ خۆم بکرمەوە، با فایەقی سایەق نەبێ، فایەقی کاسب بێ، فایەقی هەرشتێ بێ، بەڵام فایەقی عەرەق نەبێ.

(دەست دەکا بەگیرفانیدا چارەکە عەرەقەکە دەردێنێ و دەیگرێ بەدەستییەوە)

بەمە، نەدایکم، نەئیجازەکەم، نەرۆشنی چاوم بۆ ناگەڕێتەوە، نا.. نا.. ناگەڕێتەوە.

(توند چارەکەکە دەدا بەدیواری گەراجەکەدا، کامێرا پیاوان و هاڕەکردنی وردە شووشەکەو کەوتنە خوارەوەی بەدووبارەو سلۆ مۆشن چەندین جار دووپات دەکاتەوە، تایتڵی تەواو بوون دەردەکەوێ، لەباقیاتی تایتڵەکانی تردا تا ناوی دەرهێنەر دەنووسرێ فایەق بەتەختەیەك پاکەت و جگەرەو شقارتەوە دەبینرێ، تەختەکەی بەقایشێك لەملدایە، پاك وخاوێن و زیت دەگەڕێ و جگەرە دەفرۆشێ).

-تەواو-

١٩٨٧



# بەسەرکردنەوەی چەند شاعیرێکی بیانیو وەرگێڕانی چەند بەرهەمێکی شیعرییان

## ماکس سچوارتزی هاوڕێم

لە رۆژنامەی هاوکاری ژمارە ٩٣٠ رۆژی ١٩٨٧/١٢/١١دا لە دوایین لاپەڕەدا هەواڵێکی خۆشم بینی دەربارەی شاعیری ئەمریکایی ناسراو (ماکس سچوارتزی)ی هاوڕێم تیایدا ئیشارەت بەوەش کرابوو کە ماکسی شاعیر دەستبەرداری ئەو تەسبیحە ئەبڵەقەش ناکا کە بەدیاری پێشکەشیم کردبوو. لە ڕاستیدا هەروایەو ئەو سەراسیمەی ژیانی کوردەواریو شیعری کوردیە. من هەموو ساڵ و لەڤیستیڤاڵی (مەربەد)دا دیاری کوردەواریانە بۆ شاعیر و ئەدیبە میوانە ئەمریکاییەکان دەبەم سلاید و وێنەی منداڵانی کورد بە بەرگی کوردییەوە، شریتی کاسێتی گۆرانی فۆلکلۆری کوردی، وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی کوردستان و ژیانی میللی خۆمان.

بە پێویستی دەزانم دەربارەی ماکسی شاعیرو هاوڕێم بدوێم و هەندێك زیاتری بناسێنم بە خوێنەرانی ئازیز:

ماکس سچوارتز لە ١١ی نیسانی ١٩٤١ لە گەڕەکی (بروکلی)ی ناوەند شاری (نیۆرك) لە ئەمریکا لەدایك بووە.

ساڵی ١٩٥٩ چۆتە (زانستگای کالیفۆرنیا) بۆ تەواو کردنی خوێندن. ساڵی ١٩٦٤ دەستی کردووە بە دانانی شیعر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەوە بەناوبانگە کە دەسەڵاتێکی هونەریانەی زۆری هەیە لە دانانی شیعری ڕاستەوخۆ و دەستەبەجێ پێ لە ناو جەماوەردا هەروەها بە شاعیرێکی ڕەوشت میللی و خاکی ناسراوە زۆریان خۆش دەوێ.

لە ساڵانی ١٩٧٤ تا ١٩٨٠ لە ئیستگەی ڕادیۆی نیۆرك ی پایتەختدا یەکێك لە ئیستگەکانی شار بەرنامەیەکی تایبەتی ئامادە و پێشکەش دەکرد کە تەرخان بوو بۆ بەرگریکردن بۆ بەندکراوانی ناو زیندانەکان بۆ چاککردنی مامەڵەیان و بارو دۆخی ژیان چاکردنیان و بە دادپەروەیانە و شارستانیانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکرێ.

شەش جار بەشداری ڤیستڤاڵی جیهانی (ستراکۆ)ی کردووە لە ساڵی ١٩٨١ تا ١٩٨٦ لە ڤیستیڤاڵی جیهانی (لۆگۆس لافیجا) بەشداری کردوە.

سێ جار لە (پولیبیلتۆنیکس) بەشداری ڤیستیڤاڵی شیعری پاریسی کردوە، شەست و سێ دەوڵەت گەڕاوەو لە هەموویاندا بەرەو ڕووی جەماوەر بۆتەوە و قسەی بۆ کردوون و شیعری بۆ خوێندوونەتەوە، ساڵی ١٩٦٨ لە (بەلگراد) لەگەڵ نووسەر و شاعیرە جیهانیەکاندا کۆبۆتەوە و گفتوگۆی لەگەڵ کردوون، پاشان ساڵی ١٩٨٦ بەشداری کۆنگرەی جیهانی ئەدیبان و نووسەران و شاعیرانی جیهانی کردووە.

لە (بودابیستی) پایتەختی (هەنگاریا-مەجەر) پێنج جار شیعری خوێندۆتەوە هەروەها چوار جار کە کۆڕی شیعر خوێندنەوەی گێڕاوەو شیعرەکانی هەندێکیان بۆ ئەم زمانانە وەرگێڕاون (ڕووسی، سلاڤی، مەجەڕی، ئەڵمانی، ئیتاڵی، عەرەبی)، سێ شیعریشی بەتایبەت پێشکەشی من کردووە. هیوادارم بەم زووانە لە وەرگێڕانییان ببمەوەو بەیارمەتی خاوەن کۆمەکان پێشکەشی خوێنەرانی ئازیز بکەم.

لە دوو ڤیستیڤاڵی (مەربەد) و حەوتەمین و هەشتەمین (١٩٨٦-١٩٨٧) بەشداری کردوە، کە دەربارەی فەلسەفەی ژیان لێم پرسی وتی:

(باوەڕم بەهێزی گەردوونان خوای تاك و تەنیا هەیە بەبێ واسیتەو پەیوەنداری ئەم و ئەو باوەڕم بە مرۆڤ بەگشتی و زەمین هەمووی، خۆشەویستی هەیە).هیوادارم توانیبێتم نزیکتر خوێنەرانم بە ماکسی شاعیر و ئینسان ناساندبێ. هەوڵ دەدەم لە هەلی تریشدا دەربارەی شاعیران و ئەدیبانی تر بۆتان بنووسم بە تایبەتی جیهانیەکانیان کەتا ئێستا توانیومە ڕوو گەشەکەی ئەدەبی کوردیان پێ بناسێنم.

ئەم زانیاریانەی لەم وتارەدا بۆم نووسین لە نامەیەکی تایبەتی خۆیەوە وەرم گرتوون کە پێش ماڵ ئاوایی بۆی ناردم، لێتان

ناشارمەوە کە دەست خەتێکی زۆر ناخۆشی هەیە. ناچاری کردم تکای لێبکەم کە ئیتر بە ئامێری چاپ نامەم بۆ بنووسێ.

## عائیشە ئەلخواجا ئەلرازم-ی هاوڕێم

لە ئەڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرە وتارەی -ناو بەناو بەبێ دەرفەت- باسی یەکێك لە شاعیران و ئەدیبە غەیرە عیراقیەکانی تێدا دەکەم وادەی ئەوەم دا کە بەردەوام بم. وا لەم وتارەدا باسی کورتەیەکی ژیانی ئەو خانمە شاعیرە فەلەستینییە پێشکەش خوێنەران دەکەم کە بەشیعرە دڵ تەزێنەکەی ڤیستڤاڵی مەربەدی هەشتەمی هەژاند.

ناوی (عائیشە) ڕۆژی ١٩٥٢/٨/١٣ لە (ئەریحا) لە ژێر چادری دەربەدەری و ئاوارەیی دا لەدایك بووە واتە لە چادرگەی پەنا هێنەدانی فەلەستینی، ساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ کەس و کارەکەیدا کۆچیان پێ کراوەو هاتوونەتە (عەممان)ی پایتەختی (ئەردەن) و لەوێ خوێندنی دوا ناوەندی و ئامادەیی تەواو کردو پاشان (زانستی تیمارسازی تایبەت بە سوپا)ی لە کۆلیجی (شازادە مونا- بەشی تیمارسازی) خوێندووە. دوای دەرچوونی شەش ساڵ کاری تیمارسازی کردووە. هەر لە نێوان کارەکەیەوە لەگەڵ فرۆکەوانێکی هێزی سوپای ئاسمانی تاراجی شای ئەردەن کە ئەفسەربووە گونجاوەو شووی پێ کردووە، ئێستە عەقیدەو لە دایکبووی ١٩٤٨/٢/٢٢ وازی لە کاری تیمارسازی هێناوەو لە یەکێك لە بنکەکانی هێزی سوپای ئاسمانی بووەتە مامۆستا.

شەش ساڵیش بەڕێوەبەری باخچەی منداڵانی شازادە هاشمی کوڕی شاحسێن بووە. پاشان وازی لەوەش هێناوەو خۆی تەرخانی کاروباری ماڵ و منداڵی خۆی بووەو تا ئێستاش کەیبانووەو. هەر لە منداڵیەوە مەراقی شیعر نووسینی هەبووە بەڵام لە ساڵی ١٩٧٢ وەوە بەرهەمی خۆی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا چاپ کردوە. بەرهەمی لە شیعرو چیرۆکدا زۆرە جارناجارە وتاری هەمە چەشنەش دەنووسێ. ئەندامی یەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی ئەردەنیە پێنج دیوانی شیعری هەیە:

١-لاواندنەوەی تیشك (مرثات النور).
٢-جند الاقصی.
٣-القلب الخداج
٤-عرسی الشهید
٥-حسن الفلسطینی

یەك کۆمەڵە چیرۆکیشی هەیە بەناوی (الاسیر) دایکی سێ کچ (میس، ریم، زین) و دوو کوڕ (حسین، محمد) گورج و گۆڵەو بە بەرهەم کۆکی و وردبینی و توندو تێری لە شیعری سیاسیدا بەناوبانگە. لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ ئەردەن وتی:

(شاعیرانی هەموو دنیا بەیەك خێزان و کەس و کاری یەکتری دەزانم، هەموو شاعیرانی ئەم زەویەم خۆش دەوێ، بەڵام شاعیرانی کوردو نەتەوەی کوردم بە تایبەتی خۆش دەوێ و خۆم بە هاوسۆزی بابەتی شیعرەکانیان دەزانم).

لە هەلێکی تردا هەندێك لە پارچە شیعرەکانی عائیشە خانم پێشکەش بە خوێنەران دەکەم.

لە نامەیەکی تایبەتی خۆیدا بۆ نووسەری ئەم ووتارە ئەم باسی کورتەی ژیانەی خۆی نوسیوە.

## برسی یان

شیعری: عائیشە الخواجا الرازم
دڵشاد مەریوانی: کردویە بە کوردی

حەز دەکەم گریەت ببینم
هەروەك گریەی ئاوێنەی خۆم
هەمیشە نوقمی گریان بی هەروەکو خۆم
حەز دەکەم کاتی یەك بینین
زۆر گورج گاڵتە و پێکەنینەکانمان بیر چێتەوە
بۆ کوژاندنەوەی ڕووناکی مۆمەکانیش
لەبەر چاوم باڵاکەت بچەمێتەوە

***

حەزدەکەم ئارەزوەکانم بەجێ بێڵی
بتگرێنم و بمگرێنی
من لە گەڵتا تێر تێر بگریم
تۆ لە لەگەڵما تێر تێر بگری
هەردووك پێکەوە هەر بگرین
وەك دوو پاساری باڵ بگرین
برفین، برفین
هەتاوەکو ون دەبین و تەواو دەبین
ئینجا لەسەر دەفەی شانت
سەری کوورەم بنێمەوە
ئەوسا لەسەر کێڵگەی سنگت
سەری کاسم بروێنمەوە
هەتا سێیەکانمان هەردوو دەسووتێن و
دووبارە دەسووتێنەوە
پەراسوومان دەتوێنەوە
دەتوێنەوە، دەتوێنەوە

***

بەو هەموو ژان و سووتان و ئەوینەوە
حەز دەکەم دوا مۆدێل و
شەپۆلی سەیرو سەمەرەی ئەم جیهانە
من و تۆ ببین
لە خەمو خواردن و گریانا
هەم میوان و هەم خانە خوێ بین
پێك گەیشتن و دیدارو سەرلێدانمان قەدەغەبێ
دەنگیشمان هەتا سنووری دەنگدانەوە
درێژخایەن و بێ بن بێ
دەفری خواردنەوەی دەوریشمان
سەرو بن بێ
ئاومان وشك بێ
نانمان وشك بێ
بەردەوام هەر برسیمان بێ
برسی بوونێکی خۆمانی
برسی بوونێکی ئینسانی

### ٣-مظفر النواب

پاکانە: البراءة شیعری شاعیری عێراقی (مظفر نواب)ـە وەرم گێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی لە گۆڤاری (نوسەری کورد) لە شاخ لە تشرینی دووەمی ١٩٨١ بڵاوبۆتەوە.

## پاکانە

گفتی دایکێك:
ڕۆڵەگیان، ڕۆڵەی زیندان.. گەرچی کوێرم
بەڵام بەچاوی دڵمەوە بۆ لات هاتووم
مەگەر نازانی ڕێی زیندان بە چاوی دڵ بە دی دەکرێ؟
هەناوو بەندی جگەرم... خۆ بیرت دێ
کە منداڵ بوویت دەمکردیتە قەڵا دۆشکان
دەستە نەرم و نۆڵەکانت لەسەر عەبا شڕەکەوە
لەسەرو پرچم دەناڵان
ئێستاکەش هەر ئەو پرچانەن بەڵام سپین
هۆن هۆن هەمووم هۆنیەوە
بۆ ڕەوابوونی تۆ بۆ ژین
چاوەکانت شەربەتی زیندەگانیم بوو
گڕوگاڵت بەزمی شاییو لۆغانیم بوو
سپێنەی ئەو دووچاوانەت شیری مەمکی داماویمە
ڕەشێنەیان شەو نزای شەوانی کولە مەرگیمە
چاوە بچکۆلەکانتم کرد بە دو گلۆپی ڕووناك
گڕو گاڵتم کرد بە قسەی جەماوەری خاوێن و پاك
تا ڕام هێنای لەگەڵ دەریای بێ داری ژیان
بوی بە شێرێك لە مەرگ نەترسی بۆ ژیان
مەبەستت هێندە فراوان بێ ڕزگاری بێ بۆ گشت گەلان
ئێستا کوڕەکەتم لایە
شەوان بەدەم لای لایەوە دەڵێم لایە
کۆرپەم لایە... لایە لایە
سەرفرازیم لە خۆگرتنی باوکتایە
ڕزگاریمان لە خەباتی هاوڕێیانی پلەدایە
جەرگی جەرگەکەم لای لایە
خەفەت مەخۆ حیزب لانکی منالێکە بی لانکە
حزب باوکی منالێکە کە بێ باوکە
ئەو پشتێنەی هەڵواسراوە
بە خەتی وووردی لێی نووسراوە
هی باوکتە کە گەورە بووی لە پشتی کە
کارەکانی ئەو تەواو کە
لەسەر پەراسووت ببیبەستە و بیپارێزە
ئەوە پەساپۆرتی ڕێگەی سەر بڵندیو مەردی و ڕێزە
ڕۆڵە ئەمانەت پێ ئەڵێم
تا کە مردم... بە ئیسراحەت چاولێك بنێم
ڕۆڵەی شیرین هەناسەکەم
خەمی کۆرپەت مەخۆ (لایەی) وای بۆ دەکەم
کوڕم زامداری نەنووستوو
لە زیندانا ئازاریان دای
سنگ بێنە زامەکانت لە سنگی کفتم هەڵ بسووم
تا وەك گوڵاڵە بۆنیان کەم
بڵێم نۆخەی شوکر ڕەنجم بەبا نەچوو
باوانەکەم تۆی کۆڵەکەی خانووی هیوام
تۆی بەهاری تەمەنی خەزانی تەنیام
کوڕم نائومێدم نەکەی
ڕەنجی ژینی کولە مەرگیم بە بانەدەی
ڕۆڵە نەکەی ورە بەردەی
ڕۆڵە نەکەی بە مەرهەمی خۆ فرۆش
زامەکانت سارێژ بکەی
زامدارێك خاوەنی ورە بێ... زامەکانی دژی مەرگ
وەك ڕەشەبا وەك بروسکە

وەگ گەردەلوول دەگرمێنن
مەرهەمەکان ڕەفز دەکەن
سارغێکان ڕەت دەکەنەوە نەفرەت دەکەن
مەرهەم و سارغی یان تەنیا ئاگرو ئاڵای شۆڕشە
هەڵمەتی سەخت و هێرشە
باوانەکەم. برینەکانت ئەوانە مەرهەمیانە
نەك پاکانە
چونکە دەڵێن
بە بیانووی نان پەیدا کردن
بۆ برسێتی ژیانی من
پاکانە پڕ دەکەیتەوە
وا هاتمە لات لە خۆمی ببیستە ڕۆڵە
شیرم بە تووتك حەڵاڵ بێت
نەك ئەو کوڕەی پاکانەی لە خەیاڵ بێ
کوڕم من حەز دەکەم گەڕیم لە چڵکانا
ڕۆڵە من حەزدەکەم بمرم لە برسانا
من حەزدەکەم چاوەکانم کرمە ڕێژبن لە زیندانا
بەڵام کوڕەکەم بەرنەبێ بە پاکانە
ڕۆڵە ئەوەی پاکانە پڕ دەکاتەوە
دووبارە کۆست دەخاتەوە
شەهیدەکان لە نوێ شەهیددەکاتەوە
ناوی پاکانە ناهێنێ
سەرباری ئەم زەبونیەم نەکەی شەرەفم بشکێنی
ڕۆڵە نەکەی ڕێگەی خۆت و هاوڕێکانت بیر چێتەوە
بم گوشە توند بە خۆتەوە
تەماشای پرچەکانم کە هەموو سپین
هۆن هۆن هەمووم هۆنیوە بۆ ڕەوابوونی تۆ بۆ ژین
بڵێ دایە... سوێند بێ بەو پرچە سپییانەت
دڵۆپ دڵۆپ سوێندبێ بەشیری حەڵاڵی ئەو مەمکانەت
تۆ دایکمی سەری دایکێ نانەوێنم
بەشیری گۆشی کردبم
بینای حزبێك ناڕوخێنم
بە خوێنم گۆشم کردبێ

قسەی خوشك:
کاکە گەرمی و ساردی هەموو زیندانەکانم چەشتووە
هاتوومە لات جنێوی تف و نەفرەتی
پاساوڵم بە داوێنم هەڵ گرتووە
نزاو نزام ڕژانۆتە ژێر پۆستاڵی ژەندرمەوە
شیشی ژەنگاوی زیندانم بە زمانم لستۆتەوە
کەچی ئەنجام لە سووچی ڕۆژنامەیێك دا بە
پاکانە پڕ کردنەوە
پاداشتەکەم دەدەیتەوە
ئەو خەڵکەش بیخوێنێتەوە
هەتا ماوین قێزو بێزمان لێ بکەنەوە
بەبنی پێڵاوی نەفرەت شەرەفمان بپلیشێتەوە
ئاوا پاداشتی ئازارو شەونخونی
من و دایکم دەدەیتەوە
چۆن لە ڕووم دێ بچمە لای ئەو
خوشکانەی کە چاوەڕوانن
تۆڵەی جەرگی سووتاویان بۆ بێنی
وا هاتمە لات لە خۆمی ببیستە کاکە
من حەزدەکەم ڕووم ڕەش بکەیت و پرچەکانم بقرتێنی
بەڵام هەرگیز ناوی پاکانە نەهێنی
کاکە چی بکەین بیر بکەوە کاکە چی بکەین
مەگەر زەوی قوتمان بدا
مەگەر ئاسمان هەڵمان کێشێ
ئەگینا چۆن لە ڕوومان بێ
دوای پاکانە ڕوو نیشانی خەڵکی بدەین
لە ئاستی ژنی گەڕەکدا سەر هەڵبڕین
چۆن باسی کەین؟
چۆن لای لایە بۆ تاقانەکەی خۆت بکەین
کە تۆ هەموو گیانت پیسی بێت سەر شێواو بێ
کاکە گەر ئەوە نیازتە بۆ لای ئێمە نەیەیتەوە
سیکتر..............سیکتر
پاکانەی ناو ڕۆژنامەکەو خۆشت ... سیکتر
ئێمە پیاوێکمان بۆچییە... کە پارچەیە
پیاوەتی پی شێل کراوی جەریدەیە
هەر بە ڕۆژنامەکەی لای خۆت
بێ ئابڕویی و سەر شۆڕی خۆت بپێچەوە
هەتا تۆ هەی لە زەلکاودا بتلێرەوە
بەڵام هەرگیز بۆ لای ئێمە مەیەرەوە
چۆن پاکانە لەگەل دەکەی
ئێمەش هەروا پاکانە لە ناوت دەکەین
دەڵێین ئەی گەل ئەم سەر شۆڕە چاوان پڕ لە زەلیلایە
کوڕمان نییە کاکمان نییە کەسمان نییە

## ئاراگۆن

### ئیلزا

شیعری: ئاراگۆن

وەرگێڕانی: دڵشاد مەریوانی

نەهێنیەکی گەورەت بۆ ئاشکرا ئەکەم
تۆ ڕۆژگاری و ڕۆژگار ئاخرەتێکە
پێویستی بە یاری بازی و کڕنۆش بردنە بەر پێ ی
دڵداران هەیە
کراسێکە دائەکەنرێ و پرچێکی درێژی داهێنراوە
ئاوێنەیەکە هەناسە لێڵیش ئەکات و ڕۆشنیش
تۆ ڕۆژگارێکی
بەرەبەیان کە خەبەرم ئەبێتەوە
لەسەر گزنگی خۆر ڕائەکشێ ی
تۆ وەك و چەقۆیەکی گەرووم ئەکێڵی
وشەکانم گەلێ گرانن
مەسەلەکەش لەو خۆشەویستیەمدابێ
کە ئەچێتە ئەو دیو سنوورەکانی لەزەتەوەو نایگەمێ
تۆ ئەو سەعاتەی لەملاو ئەولای سەرم ئەدەیت و
من ئەخنکێم گەر تۆ هەناسە نەدەیت
نەهێنیەکی گەورەت بۆ ئاشکرا ئەکەم
وشەکانی نێوان لێوم هەژارن، سواڵ کەرن
دەرۆزەکەرێکی لە ژێر چاوەکانتا ڕەش دائەگیرسێن
بوێی خێرا، خێرا، ئەڵێم- خۆشم ئەوێیت-
چونکە بلوری ڕستەیەکی شەفافم دەست ناکەوێت
تا بیکەمە ملوانکەی گەردنت
لە قسە ساکارەکانم تووڕە مەبە
ئاو چەندە ساکاریش بێت، ئەبیستێ
چ دەنگێکی هەیە کە ئەکەوێتە ناو گرەوە
نەهێنیەکی گەورەت بۆ ئاشکرا ئەکەم
لێت ئەترسم
لەو هەموو شتانەی ئێوارانی ژێر پەنجەرەکەت ئەترسم
ئەو ئیشارەتانەی ئەیکەیت و ئەو قسانەی نایکەیت
لەم ڕۆژگاری گورجی و خاویە ئەترسم
***
نەهێنیەکی گەورەت پێ ئەڵێم
دەرگاکان داخە
مردن لە خۆشەویستی ئاسانترە
منی ئاسان نەویست
تا هەم ژیان هەڵ ئەبژێرم، خۆشەویستەکەم

ئیلزاو چاوەکانی ئیلزا
چاپی ١٩٦٩
میسر/دار الکاتب العربی

## ٥-ئینۆ تیۆدۆرۆ وانك

### داخوازی

شیعری: ئینۆ تیودۆرۆوانك

کە لە ئینگیزیەوە ڕۆژنامەی -ڕۆشنبیریی نوێ- ژمارە ١٩٧٤/١/٥ کردبووی بە کوردی لەو پەخشانە کوردیەوە شەهید- دڵشاد مەریوانی- کردبووی بە شیعر و پلەی یەکەمی وەرگرت.

### داخوازی

من لە ڕابوردویەکی دێرینەوە ئەگەڕێمەوەو دوور ئەڕوانم
دوکەڵی جەنگێ بە دی ئەکەم، کە بڕواتەوە
ئەپرسم ئایا لەدەست مرۆڤی خێر خواه
کردەوەی نالەبار و خراپ ئەوەشێتەوە؟
تۆ بڵێی: گوێیە بۆ ئەم بانگ و ئاوازەکەم شل نەکەن؟!
ئەبینم: مرۆڤایەتی دیسان خەریکە
کێش ئەکرێت بەرەو لێواری سامناکی
جەنگێکی ناپاك لە پێناوی ئامانجێکی ناڕەواو
بێ هودەدا
برایان بۆیە ئەوپەڕی ئەوکاتە هاتووە کەوا
ئەم شیرە بەدفەساڵە لەناو ببرێت کە
بەسەر ماڵ و مناڵمانا هەڵواسراوە!
لوتکەی ئەوکاتەیە کەوا سۆزو بروێنین!
تۆوی ئاشتی و خۆشەویستی بچێنین!
دەبا کۆتایی بەوهاری و نەخۆشیە بهێنین
کەساڵەهای ساڵە بەدەستیەوە ریسوا بووین
با، ئەو کۆشکی ئابوریەی جەنگی پێ ئامادە ئەکرێت
پەڕاشی بێت و بکرێت بەخۆڵ
خەرمانی ئەم زەمینە گوڵشەنە بکەینەوە
بەمیوەی ڕەنج و پیت و فەڕی مەردانە

### داخوازی

شیعری: ئینۆ تیودۆرۆ وانك

وەرگێڕانی: دڵشاد مەریوانی

هاورێکانم من ڕێبواری گەشتێکی دووری دێرینم
ئاسمانی ژینی مرۆڤی ئەم سەردەمە گرژدەبینم
ئایا دەشێ مرۆڤێکی پێشکەوتو خواز بێتە جەنگ خواز
بڵێی خەڵکی گوێ نەگرن لە ئاوازی دوور بینیم؟!
هاورێکانم واهەست دەکەم مرۆڤایەتی سەرلەنوێ

بەرەو جەنگێکی سامناك و نالەبار و ناپاك دەبرێ

نابێت کەستان بە پێکەنینی دڕندە بخەڵەتێ
نۆرەی ئەوەیە مۆتەکەی برسی و شەڕو خوێن بفەوتێ
ئەو مۆتەکە مرۆڤ خۆرە بەد فەسالە دارزیوە
کە ئاسوودەیی و بەختیاری کۆرپەکانمانی دزیوە
ئەم نەخۆشی و دواکەوتنی و برسێتی‌یە هەتاکو کەی؟
ئەم ریسوایی و ترسنۆکی دیلێتی‌یە هەتاکو کەی؟
با گشت یەك دەنگ پەلامار دەین کۆشکی زەروەکان بڕمێنین
زەمین نەك بۆ شەڕو جەنگین بەڵکە بۆ خێر بەکاربێنین
لە ئینجانەی خڕی گێتی و دڵی خەڵکدا سۆز بڕوێنین
تۆوی ئاشتی و پێشکەوتن و خۆشەویستیەك بچێنین

## ٦-عەلی عەبدولئەمیر عەجام

با بیناسین

یەکێك لەو شاعیرە گەنجانەی عەرەب کە لە مێژە ئاشناین و لە نزیکەوە ئاگاداری یەکترین- عەلی عەبدولئەمیر عەجام-ە

یەکێکە لەو ڕووناکبیرە هوشیارە عێراقیانەی عاشقی ئەدەبی کوردیەو لەهەر دیدارێکدا یەکبگرینەوە داوای نموونەی وەرگێڕاوی ئەدەبی کوردیم لێ دەکا.

لەمەربەدی هەشتەمدا پێك شادبووینەوە بەرنامەیەکی وەهامان دانا کە لە مەنزڵگای یادی دێرینەمان (کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد) بۆ چەند ساتێك دانیشین و لە دەنگ و باسی یەکتری بزانین. کە چووین چەند برادەرێکی تری خۆمانی لێ بوو کەوتینە رازو نیازی ئەدەبی. هەندێك نموونەی شیعری نوێمان-کوردی- بۆ خوێندنەوە ئەویش هەندێك شیعری خۆی بۆ خوێندینەوە.

ئەنجامی گفت وگۆکەمان بەوە شکایەوە کە:

ڕاستە بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردی بە شاعیرانی غەیرە کورد کۆشش پێویستەو دەبێ بوونی ڕووی گەشی ئەدەبی کورد بۆ ئەوان دەرخەین. بەڵام پێویستە جار نەجارەش بەرهەمی ئەو کورد مەیلانە بگۆڕینە سەر کوردی و لەوەفاو ئەمەکی ئەوان دا: ئێمەش بیان ناسێنین بە خوێنەرانی کورد.

ئەم چەند نموونە شیعریەی کاك -عەلی- زادەی ئەو گفتوگۆیەی ناو کۆمەڵەی رۆشنبیری یەو پێشکەشی خوێنەرانی دەکەم

لە سێبەری لاپالێکدا
دڵم دەیویست-خۆشی- بێنێتە خۆیەوە
کێ دەزانێ کار ئاسکی من
لە دەمە دەمی تاریك و ڕوونی ئەم بەیانەدا
دەیەویست باز بۆ چ کێڵگەیەکی تر بدا؟
لە بێ دەنگی داو
لەناو باخچەی لێکدانەوەکانم دا
وشەی شیعر بەهێمنی
دەگەڕانەوە لانە ئارامەکەی خۆیان
کە دڵمە
لەو باڵەخانەیەی تیایدام و
پرشە لە گوڵی -ئۆرکید-
ئاهەنگی ئەمشەوم
بە فەخفووری ئینجانەکان دەکەم
ئاگام لە هەردوو دەستیشمە
کاتێك لە نێوان لقە مردووەکان و بۆنی گڵەکەدا
دەستیان کرد بە گریان

با -زەمەن- دڵنیا بێ!
با پانتایی زەمین هێمن بێ
با کەناری دەریا شڵپەی شەپۆلی نەیەت و
لەسەر خۆ بێ
چونکە ئێستا من تەنیام
لەسای سێبەردا

## ٧- پاپلۆ نیرۆدا

### سێ چلە شیعری نیرۆدا

دڵشاد مەریوانی

پاپلۆ نیرۆدا ساڵی ١٩٠٤ لە شاری (پارال)ی چیلی لە دایك بووە. ناوی ڕاستەقینەی ریکاردۆ ئەلبار نەفتالی ریگس بازوالتۆ-یە ٢٤ی ئەیلولی ١٩٧٣ کە لە جێگەیەکی تایبەتی دەست بەسەر بوو وایان بڵاوکردەوە گوایە بە نەخۆشی شێرپەنجە مردووە. گەلەکەی ٢٦ی ئەیلول گەرچی لە ژێر زەبری رەشاشدا تەرمەکەیان ناشت بەڵام بە گەورەترین خۆپیشاندان وەفاداریان بەرامبەر نواند. ناشتنی تەرمی نیرۆدا بوو بەیەکەم خۆپیشاندانی جەماوەری بەهێزو ئاشکرا دژی فاشیەت و ئیمپریالیەتی ئەمەریکایی.

چیاو ڕووبار
لە نیشتمانمدا چیا هەیە
لە نیشتمانمدا ڕووبار هەیە
لە گەڵم بێ
شەو بە چیاکەدا سەردەکەوێ
برسێتی بەرەو ڕووبارەکە دەخزێ
لەگەڵم بێ
ئەوانە کێن کە ئازار دەچێژن
نازانم

بەڵام مەبەستمن

لەگەڵم بێ

نایان ناسم

بەڵام بانگم دەکەن و

پێم دەڵێن

ئێمەین ئازار دەچێژین

***

لەگەڵم بێ

چونکە پێم دەڵێن

گەلە کلۆڵەکەت

لە نێوان چیاو ڕووباردا

لەگەڵ برسێتی و ژاندا

نایەوێ بەتەنیا تێ بکۆشێ

چاوەڕێی تۆیە، برادەر

ئەی ئەوە خۆشم دەوێی

گەرچی دەنگە گەنمێکی سوور گچکەیەو

تێکۆشانەکە سەخت دەبێ

ژیانیش سەخت تر دەبێ

بەڵام لەگەڵ من بێ

لەگەڵم بێ

***

لە -یەناییردا- بۆ گەلەکەم-

سەرەتای هەموو ساڵێك

زەوی بۆنی نانی شاخیو

سێوی دەریای لێ دێ

کاتێك نیشتمانە هەژارەکەم

کەوایەکی لە هێشوو چنراوی کردبووە رایەخ

زۆڵم دەمێکی پیرەمارانەی دان کەل و کۆمی کردبووەوە

گازی لەدڵی زەوی گرت

رەشەباکە کۆتایی هات

ژیانی ساکاری تاڵ یان شیرین

گەڕایەوە شوێنی خۆی

زۆر کەس ئەویان لەبیر چووەوە

زۆر کەس مردن

ئەمرۆش زۆر هەن ئەوانەیان

نەچەشتووە

چونکە ئەوسا لە دایك نەببوون

وەڵێ من

نە لەبیرم چوونەوەو نەمردووم

من درەختی (یەنایرم)

لە چەنگەڵە سوتاوەکەداو

ئەو بلێسە دڵ ڕەقەی

لە نێوان گەڵاکاندا سەمای دەکردو

سووتانی دەپەخشان

خۆڵەمێش بە باچوو

درەختان بەدەم مەرگەوە دەچەمانەوە

گەڵا بەلقەکانەوە نەمان

وەڵێ دڵم پڕە لە گۆپکەو چرۆ

ئێستاش گوڵ دەگرێ و یادەوەری دەکا

من چڵی دووا ئازار و ژانم

## هەژاری

ئاه، تۆ ناتەوێ

هەژاری دەت ترسێنێ

تۆ ناتەوێ بە جووتێ پێڵاوی دڕاوەوە

بچیتە بازاڕو

بەکراسێکی کۆنەوە بگەڕێیتەوە

خۆشەویستەکەم

وەك دەوڵەمەندان مەبەستیانە

ئێمە هەژارمان خۆشناوێ

وەك کەڵبەیێکی پیس دەیکێشین

چوونکە هەتا ئێستەش

گاز لە دڵی مرۆڤ دەگرێ

وەڵێ من نامەوێ لێی بترسی

گەرچی بەهۆی منیشەوە گەیشتە ماڵەکەت

زەردەخەنەکەت نادڕێنێ

کەنان-ی ژیانی منە

گەر ناتوانی کرێی خانوەکەت بدەی

وەرە دەرێ بە هەنگاوی پڕ -شکۆ-وە بۆ کار بڕۆ

خۆشەویستەکەم ئەوەت بیر بێ

کە من تێت دەڕوانم و

ئێمە بەیەکەوە گەورەترین سامانێکین

کە هێشتا وا بە کۆکراوەیی

زەوی بەخۆیەوە نەیدیوە

لە کتێبی-من شعر بابلونیرودا- زنجیرەی شیعری جیهانی ژمارە (٢) وەرگێڕانی حەسەن حەمادە، ئەحمەد موسی- بڵاوکراوەی -دار الفارابي- بیروت چاپی دووەم ساڵی ١٩٧٩ وەرگێڕاوە.

١٩٨٧

**٨-کاڤاڤی**

## چوار گەڵا لە شیعری کاڤاڤی

کۆنستەنتینین کاڤاڤیَ- ساڵی ١٨٦٣ لە ئەسکەندەریە لە دایك بووە ساڵی ١٩٣٣ هەر لەوێ کۆچی دوایی کردوە. خاوەن جیهانێکی تایبەت بووە لەشیعردا لەکاتێکدا قوڵ و هوشیارانە دەرکی بە ئازداری و بەرفراوانی کەلەپوری گریکی دەکرد وەڵێ ئەم بابەتەی شیعرەکانی لە هۆمیرۆس یان چەرخی بەرکلیسی هەڵدەهێنجا بەڵکە هاوگونجاوی هیللینستی بۆ شارستانیان و ڕەگەزان هەڵبژاردبوو وە کردبویە سەرچاوەی بابەتی شیعریەکانی.

ئارەزووەکان

وەك ئەو لەشە ئازدارە مردوانەی

هێشتا ڕۆژگار پێی لێ نەناون و

لە مەرگدانە رازاوەکاندا

دەرگایان بە فرمێسك لێ داخراوە

گوڵەباخ لە ژوور سەریانە

گوڵە رازقی لەژێر پێیان

ئارەزووەکانیش هەر دێرینەکانن

ئارەزووی ساردبووەوە

کە پێیانە و بۆیان نایەتە دی

شەوێکی بەتام و

کاتێکی کامەران و

گەشاندنەوەیەکی بەرەبەیانیان

پێنابەخشرێ

دەنگەها

کۆمەڵە دەنگێکی وەك خۆم خۆشەویست

دەنگەهای وەك خۆم خۆشەویست

هی ئەوانەی بزرمان کردن و چوونە ڕیزەی مردوان

لەلامان

جار نەجارە لە خەودا لەگەڵمان دەدوێن

جار نە جارەش لە بیر کردنەوەدا مێشك گوێی لێیانە

لەگەڵ دڵە ڕاوکێیدا ساتێك دەگەڕێتەوە لامان

دەنگەهایێك لە شیعری ژیانی سەرەتاییمانەوە

وەك مۆسیقای پەرش و بڵاو شەوان لە دوورەوە

بۆ ساتێك ئەگەڕێتەوە لامان

نوێژ

دەریا دەریاوانێکی قوت دا

دایکە بێ ئاگاکەشی هەمیشە مۆمێکی گراوە

لە مەزاری مریەمدا بۆ داناوە

هەتا سایەقە بێ و بگەڕێتەوە

هەمیشە گوێ بۆ ڕەشەبا هەڵدەخا

وە لێ لەو کاتەدا دایکە دەم بەویری نوێژە

نزرگە بە ئاگاکە

هێمنانە

ژانگرتوانە

گوێی بۆ دایکە ڕاگرتوەو

دەزانێ جارێکی دی کورەکەی ناگەڕێتەوە

مۆمان

لەبەردەممانەوە ڕۆژانی ئاییندە

وەك ڕیزێك مۆمی گڕدار هەموو ڕست بوون

مۆمانی ئاڵتونی گەرم زیندوو

وەڵێ ڕۆژانی ڕابردوو لە پشتمانەوە جێماون

ڕیزێکی خەمناکە لە مۆمی کوژاوە

نزیکەکانیان هێشتا فنیلە دووکەڵاوین

مۆمانی سارد تواوە چەماوە

نامەوێ بیانبینیم

دیمەنەیان ئازارم دەدا

بەیاد کردنەوەی ڕۆشنایی یەکەم جاریان

ئازار بارتر دەبم

بۆ مۆمە گڕدارەکانی بەر دەمم دەڕوانم

نامەوی ئاوڕ بدەمەوەو سامناکانە

ئەوە ببینم کە چۆن ئەو مۆمە کوژاوانە

بە خێرایی ژمارەیان زیاددەکا

نامەوێ ئاوڕ بدەمەوە

لە کتێبی -کاڤاڤی- بڵاوکراوەی (مكتبة النهضة العربية) بغداد- ساڵی ١٩٧٩ وەرگێڕاوە.

-مەرگدان- لەبری- المدفن-ی عەرەبی دانراوە. واتە ئەم جێیەی لە بەستگەکاندا مردووی لێ دادەنێن. ١٩٧٤.

سەرچاوە:

سەرجەم بەرهەمەکانی شەهید دڵشاد مەریوانی کۆکردنەوەو چاپکردنی مەریوان محەمەد ئەمین، چاپی یەکەم ١٩٩٩.

# یاداشتەکانی هاوڕێکەم

دلشاد مەریوانی

(١)

١٩٦٧/٨/١٥

لەتاو گەرمای ئەو مانگی ئابەی شاری سلێمانی، خۆم کرد بە دۆندرمەخانەیێك دا. زۆر نەبوو دانیشتبووم، فێنکم بوودوە و پشووم دا. لاوێکی ١٨ سالآن. سیما سەرنج ڕاکێش. چاوو برۆ و سمێڵ ڕەش. ڕۆژباشێکی لێکردم و بەرامبەرم دانیشت. وەڵامم دایەوەو شاگردی دۆندرمەخانەکە هات بەلامانەوە. پرسی:

-تێکەلاّو یان سادە ؟

ووتم: بەس قاوەیی.

لاوەکەش ووتی: تێکەلاّوو بەس قاوەیی تیانەبێ.

ووشەی (بەس) ەکەی سەرنجی ڕاکێشام. لەدلّی خۆمدا ووتم ((بەس-ەکەی بەجۆرێك ووت" وەك بەربەرەکانی منی پێبکا. ئەگەر وایە، بۆ هاتەسەر مێزەکەم و بۆ ڕۆژباشی لێ کردم)) کە کوڕە دۆندرمەکانی هێنا، وازم لەو بیرکردنەوانە هێنا.

دەستم ڕاکێشاو خەریکی دۆندرمەکە بووم. ئەو هێشتا دەستی بۆ نەبردبوو، لەپڕ ڕووی تێ کردم و ووتی:

-وادیارە ئێمە زۆرشتمان لەیەك ناچێ!

پرسیم بۆ؟

ووتی: تۆ حەزت لەڕەنگی قاوەیییە. من حەزم لێی نیە، تۆ گورج دەستت کرد بە خواردنی. بەلاّم من هەتا تۆزێك گەرم دانەیەت و شل نەبێتەوە نای خۆم.

قسەکانی زۆر گەرم و گوڕ و خۆش دەکرد. لەدلّی خۆمدا ووتم:

((باش بوو لەم پاش نیوەڕۆ گەرمەدا هاودەمێکی وا خۆشم دەست کەوت ))

گورج پێم ووت: ئێ؟ تۆ قژت ڕەشە و من قژم زەردە. ئەویش یەکسەر بەدەم پێکەنینێکی سەیرەوە ووتی:

-تۆ چاوت شینە، من چاووم ڕەشە. تۆ سمێڵ دەتاشی، من سمێڵناتاشم. تۆ پاپراخ ناخۆی من پاپراخ دەخۆم.

منیش خۆم پێ نەگیراو پڕ بەدڵ پێکەنیم. بۆم دەرکەوت کوڕێکی ڕۆح سوك و قۆشمەیە. لەو خاکی و پاکانەیە کە زوو دەبنە هاودەم و ئاشنای کەسانی دەوروبەریان. هیچ نەبێ کاتێك بەیەکتری دەبەینە سەر.

پێم ووت:

-باشە باوابێ. بەلاّم یەکترمان نەناسی. دەشێ بیبینەبرادەر؟

هێمن بوەوە. خۆی پێشکەش کردم و خۆمم پێشکەش کرد کەناوی خۆمم پێووت، ووریا تر بووەوە. کەمێك تێم ڕاماو ووتی:

-خۆشحالّ بووم بەناسینت. من بەرهەمی تۆم زۆر خوێندۆتەوە. بەس لەوەدا لەگەلّتانیم کە بە غەیری زمانی کوردیش دەنووسی. با ئەو وزەو توانایەشت هەر بۆ خزمەتی ئەدەب و زمانەکەی خۆمان بێ. لەگەلّ ئەوەشدا نووسینەکانتم زۆر بەدلّە. ئاواتم بوو ڕۆژێك بت ناسم. زۆر خۆشحالّم کە ئاوا بەئاسانی بەردەستم کەوتی.

ئەوەی ووت و دەستی کرد بەگیرفانی کراسەکەیدا. دووسێ پارچە کاغەزی نیوە عەرەق کردووی دەرهێنا. لەدلّی خۆمدا ووتم:

((بەشەرەف تووش بووم. وادیارە خۆی بەشت دەزانێ. ئێستا دەست دەکا بە مەقام خوێندنەوە. بەلاّم چار نیە تازە ژانەسەرم بۆخۆم کڕی))

ووتم:

-سوپاسی هەستت دەکەم. لەوەدەچێ تۆش تواناو شارەزاییەکت هەبێ. دەشێ نەك هەر ئەدەب دۆست " بەلّکە چیرۆك نووس یان شیعر نووسیش بی.

-باش بوو ووتت شیعر نووس، چونکە لەڕاستیدا من شیعر نووسم نەك شاعیر. شیعر دانانم نەکردووە بە خولیاو پیشەیەکی بەردەوام. کە زۆر زۆر ڕقم هەلّدەستێ. یان زۆر کەیف خۆش دەبم" بە هەڕەمەکی و نیوەشیعرو نیوە پەخشان. هەلّچوونەکەم تۆمار دەکەم. دوایی کەهێدی بوومەوە. بۆی دەچمە پارێزەوە و دەیکەم بە شیعر.

خۆم پێ نەگیرا پێکەنینێکی گەرم لەشێوەی قسەکردن و گەرمی ووشەکانی و دان نان پیایاندا گرتمی. ئەویش گەرمتر پێکەنی

لەگەڵما. لەپڕ کپ بوو. چاوانی زیت بوونەوە. بە جدیاتێکی زۆر سەیرەوە کاغەزە قەدکراوەکانی کردەوە. تەکی دا بەلامەوە ووتی:

–بەیارمەتی خۆت گوێم بۆ بگرە. پاشان ڕای خۆتم پێ بڵێ.

ئەوەی ووت و دەستی کرد بەخوێندنەوە:

ئاغا. ئەمڕۆ
بەرامبەر تۆ
وەکو کێوێکی ئاگرین
ڕاوەستین
هەرچی داخی دەروونمانە
تێتی ئەگرین

ئاغا، کێوانی ئاگرین
پارچە ئاسن فڕێ ئەدەن
بەڵام کێوی دڵەکەی من
چەند دێرەشیعرێك ئەهاوێ
گەلێك ڕەق تر
لە: بەرد، پۆلا، مس و ئاسن
زۆر بەهێزتر
لەنارنجۆك، چەکی مردن

ئاغای جاران
ئاغای نەزان
تۆ ئەوکەسەی خۆت دائەنێی
بەخاوەنی کوردستانمان
خۆت دائەنێی
بەخاوەنی سەرو گیانمان
بەخاوەنی مافی (مان) و (نەمان) مان
وەك گەلی کورد
درشت و وورد
وەکو بەندە کڕابێتن
بۆ تۆی کوڵکن.
ئاغای جاران
کوردستانمان
هی پێشمەرگەیە، چەك لەشان
کەناوی خۆی، ناوی باوکی
ناوی خزم و ناوی دایکی
ناوی خێزانە جوانەکەی
ناوی بەچکە تاقانەکەی
لەسەر فیشەکێك نووسیوە
بەڕووی دوژمنا تەقیوە
ژیانی لەمەو پاشی خۆی

لەسەر فیشەکێك نووسیوە
کە دای ناوە
ئەگەر مافی پێ نەدرێ
دوژمنەکەی پێ هەڵدڕێ
کوردستانمان
هی جوتیارێکە ئەیکێڵێ
تا بەرهەمی تیا بچێنێ
هی کرێکارێکە هەژار
کوشتەی دەستی سەرمایەدار
هینی دایکێکە سك سوتاو
کوڕی تاقانە سەربڕاو
هی باوکێکە شەرم گرتی
پرسە بگرێ
بۆ کوڕی بە داراکراو.
هینی خوشکێکە ڕەش پۆشە
کاتێك ووتیان: خوشکی برا
دوێنێ کاکت شەهید کرا
ووتی: بریا
پێشمەرگەیەتیم پێ ئەکرا
بەڵێ ئاغا
ئاغایەتی جارانی تۆ
خەوێکی پڕ ئەندێشە بوو
میللەت واهاتەوە: سەرخۆ
تێت گەیشتین
جارێکی تر، ناخەڵەتێین
بەبێ ئەقڵانی ساکاریش مەخەڵەتێ
کەبە ( کاوە ) ناووت دەبەن!
ئەی ئاغای لەخۆ بایی بوو
وەك کوولەکە
بەلقی گێڕا سەرکەوتوو
ئاوەڵەکانت دام لە دار
خۆمت داخ کرد
دڵت سمیم دەیەها جار
جامی خەباتی پڕ پشکۆم
قلێپت کردەوە کۆشی خۆم
برادەرانمت سەر بڕی
کاوەی یەکەم نەورۆزی کورد
سەریان ئابڕێ،بۆیان ئەگری
کاوەکانی پێشتری کورد
بۆ میللەتیان ئەبوون بە پرد
کەچی زامەکانی ئێمە،لە جۆرێك بوون

به ئاسانی سارێژ ئەبوون

گەر نەبوویتایه به برین.

کاوەی یەکەم نەورۆزی کورد

چەکوشی دەستی پۆڵایین

دەست و مەچەکی ئاسنین

ئامادەی کرد،بۆ کەلاکی

ئەژدەهاکی

کەچی ئێستا

خۆت ئامادەی هەڵێك ئەکەی

کەبە سەری دوو لاویا بەی

نەخێر.نەخێر ئاغای جاران

هەرەشەت من ناترسێنێ

چونکە من و کەس پەرستن

دوورین،دوورین

وەکو سۆفی و بت پەرستن

دوورین، دوورین

تازە میللەت ڕێی لێ بڕی

ڕۆشن بیری تر، سەر بڕی

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. قومێکی لە پەرداخەکەی بەردەمی دا.پاشان ووتی:

—ئەمە مارتی ١٩٦٧ دام ناوە بەڵام جارێ ناونیشانم بۆ دانەناوە.

لە ڕاستیدا من سەرسام بووم چاوەڕێم نەدەکرد شیعرەکەی ئەو ئاستەی هەبێ.ئەوەم تاووتوێ ئەکرد:

ئایا وەك شیعر نووسێك مامەڵەی لەگەڵدا بکەم و هانی بدەم یان وەك شاعیرێك مامەڵەی لەگەڵ بکەم و خەوش و ناتەواوییەکانی پێ بڵێم؟

بڕیارم دا پێی بڵێم:شیعرەکەت جوانە بەڵام توندو تیژییەکی ماڵی نەکراو،کەف و کوڵێکی مێر منداڵانەی تیادایە.مشت و ماڵی هونەری دەوێ.قافیەی سواوی زۆر تیادایە پەلەو هەنسکە بڕێ لە ئاهەنگەکەیدایە...

بەڵام پێش ئەوەی هیچی پێ بڵێم،لە پڕ تەماشای کات ژمێرەکەی کردوو هەڵسا.بەپەلە ووتی:

—ببورە،لەگەڵ برادەرێکی زمان درێژماوادەی چوونە سینەمام هەیە.پێت خۆشحاڵ بووم.

ئەوەی ووت و فرتەی کردو بۆی دەرچوو.تەنیا لای دەرگاکەوە گوێم لە دەنگی بوو.هاواری کرد.

—پارەی دۆندرمە قاوەیییەکەت دراوە.

هەروا تاس دەیبردمەوە لەم ئادەمزادە خوو سەیرەی کت و پڕ یەکترمان ناسیو هەر بەو جۆرەش وون بوو!

بۆ سبەی هاتمەوە دۆندرمە خانەکە، بەڵکو بی بینم.کابرای دۆندرمە خانەکە.کاغەزی شیعرەکانی دامێو ووتی:

—ئەو برادەرەی دوێنێ لەگەڵتا بوو.ئەمانەی بۆدانایت و ڕۆی.

لێم وەرگرت و تاوو توێم کردن،لە سووچێك دا بۆی نووسیبووم:

ژیانت شاد.ئەمە شیعرەکەی دوێنێیە.گەر مەیلت بوو لەلات بێ،یان بیدڕێنە.چونکە زۆر ڕقم هەڵساوە.پڕۆژەی شیعرێکی تر کەللەم دەخوا.ئەگەر ئەمە لە ناو نەبەم ئەوی ترم بۆ نانووسرێ.

بە لاتەوە سەیر نەبێ .لەمەوپێشیش هەروا بووم.

خەریکی خوێندنەوەی ئەو دێڕانە بووم،بێ ئەوەی هەست بە خۆم بکەم بە شاگردەکەم ووت:

—تێکەڵاوێك قاوەیێ تیادا نەبێ.

* * *

(٢)

١٩٧٠/١٠/١٠

پایزانی شاری بەغدام لە هەرسێ وەرزەکەی تر پێ خۆشترە، دەمەو ئێوارەیەکی وەرزی پایز ڕێم تێی کەوت.لە میوانخانەیێك بەپەلە جانتاکەم دانا.بەرەو شەقامی (ئەبو نەواس ) کەوتمە ڕێ تا فریای بەرێکردنی خۆر بکەووم لە ئاوابوونیدا، کە عەکسەکەی بۆ دوایین جار ماڵ ئاوایی لە ڕووباری ( دجلە) دەکا.

لە قاوەخانەکەی ڕۆخی دجلە دەگەڕام بۆ کورسییەك ڕووی لە ڕووبارەکە بێ. گوێم لێ بوو یەکێك بەناوی خۆمەوە بە کوردی بانگم لێ دەکا.لام کردەوە تێمڕوانی.هاوڕێ دێرینەکەی سلێمانیم بوو!!

نزیکەی سێ ساڵ بوو نەم دیبوو.لە سەرەتادا جار نەجارە هەواڵم دەپرسی پاشان ئەو یەکتر ناسینەم هەر لە بیریش چوو بووەوە.

کە چی کەبینیم دەت ووت سێ ڕۆژە نەمدیوە!

بەرەو ڕوی چووم. لەبەرم هەڵسا.دەستی یەکمان گوشی.خۆرو دیجلەم هەر لە بیر چووەوە.

خۆشحاڵی خۆمانمان بۆ یەك دەربڕی.بەرامبەر یەك دانیشتین.

خێرا کەوتمە پرسی ڕقە شیعراویەکانی.لە وەڵام دا ووتی:

—بیست جارو زیاتریش شتی وای لێ ڕووداوم.

کەواتە دیدارەکەمان سەد هێندە خۆشتر دەبێ. کوان؟

وەرە دەرەوە شاعیری خۆ شاردووەوە.

نازدار گیان ئینجا پێم زانی:
کابرایەکم بێ سوودو فەڕ
مەقاشی دەستی ئاغابووم
مرۆڤێك بووم لەجنسی کەر
زەبوونێك بووم. بێ ورتەو کەڕ
کەی گەورەکەم ووتبێتی:
(هۆ– کوڕە زەڕ).
خێرا ووتوومە: (قوربان زەڕ).
هەرشتێکی گەلێك سەیرە!
ئەو خاکەی بۆ(بەرزی)کوژرام
مافم نی‌یە تیایا بژیم!!
نازە، تیایا، تۆش ناتوانی خۆشت بوێم
نازدار ئەوەیە زەبوونی
ئەوەیە گیرۆدەبوونی..
ڕژێمێکی وەها بۆگەن
کەپێویست نی‌یە بە– بوونی
ئەو ڕژێمە بۆگەنانە
بە (نەفامی)، خۆمان بۆ کردنە نیشانە

نازدار گیان ئەم جەماوەرە
خلیسکاوە و خەڵەتێنراو
لێی دراوەو تەفرەدراو
* * *

نازدار ئەمڕۆ. هەموو ژیانی ڕابوردووم
وەکو تفێکی بیزاوی
بەدیواری ئاغادا سوو
دژم بەوەی تۆی لێکردم
مەیل و بەزەیی پێ کوشتم
لە زەبوونانی کەی، کردم
دژم بەوەی کە، وای زانی
هەرچی کاتێك من دوای کەوتم
بۆ تاقیبوونەوەی بیری
وێنەی خەستەخانەو مەیتم
* * *

نازدار ئەمڕۆ
سەری کەوتووم، نووسانەوە بە لەشمەوە
ئەژیم بۆ تۆی جوان و نازدار
ئەژیم بۆ نێرگزی بەهار
ئەژیم بۆ ڕێبوارانی ژیانێکی پڕ لە ئازار
دەست ئەخەمە دەستی زبری بلۆقاوی
پێ ئەنێمە شوێن پێی پاژنەی شەقاراوی.
دژ ئەبم بە هەموو شتێ
کەڕێگەی مرۆڤ ئەبەستێ
بۆ سەرکەوتن
بۆ پێشکەوتن
هەموو نەریتی ئاغاکەم
وەکو پێڵاو لە پێ ئەکەم
هەرچی ئیمانێك ئەوانە
باوەڕیان پێی هەیەو من
شکم هەیە لەکەڵکی
تا ئەتوانم من پڕ بەدەم
تفێکی پیسی لێ ئەکەم.

١٩٧٠/١٠/٦

گەرچی لەسەرەتاوە، زۆر هێمن دەستی پێ کرد. بەڵام لەم دێڕانەی دوایی دا مەسەلەکەی جددی‌تر بوو. تادەهات زیاتر گەرم دەبوو. جارجار دانەکانی بۆ جیڕ دەکردەوە. سەرنجمی ڕاکێشابوو، ئەوەم بیر چووبووەوە. وەك ڕەخنەگرێك گوێی بۆ ڕاگرم. کە لێ بووەوە. دەستم بۆ درێژ کرد دەستم گوشی و ویستم پێی بڵێم:

تۆ بوویتە شاعیرو ئومێدی ئەوەت لێ دەکرێ کە...... کەچی!! دانەکانی جیڕبوون و سپی دەچوونەوە. چاوانی زەق بوون. سەیرم لێ دەهات سوعبەتی وام لەگەڵ بکا. چونکە گاڵتەو بەزمی وا لەنێوانماندا نەبوو. بەڵام نەء. سەرو ملی بەلای ڕاستدا لار بووەوە. لەسەرشان بەخۆیی و کورسی‌یەکەیەوە کەوتەزەوی. دەمی کەفی پەڕاندو نیخەو هەنیسکی لەرزۆك و لرخەی گەروی گوژم گوژم، ئەهاتنەگوێ.

ئینجا زانیم. ئەم هاوڕێیەم پەرکەمی لەگەڵە. خەڵکانی دەوروبەرمان هاتن بەدەنگەوە. کابرایەکی کەواوسەڵتەلەبەر لەولامانەوە تاوڵەی دەکرد. خێرا پەلاماری داو دەستەسڕێکی گەورەی لە باخەڵی دەرهێناو سەروچاوی هاوڕێکەمی پێ داپۆشی. دەستی کرد بە (ویرد) خوێندن بەسەریدا.

دووسێ خولەکی تەواو نەبرد. هەڵسازۆر تێك چووبوو. سەروچاوی خۆی هەڵگلۆفی. کەمێك بێ دەنگ دانیشت. زۆرم بەزەیی پیادا دەهاتەوە. لەسەرخۆ دەیڕوانی بەم دیوو ئەو دیوی خۆیدا. پاشان هەڵسا دەستی بۆ درێژکردم. دەستی گوشیم و ووتی:

– شیعرەکەت بۆ بەجێ دەهێڵم سەرپشك بە. داوای لێبووردنت لێ دەکەم لەوەی ڕویدا. بەلاتەوە ئاسایی بێ مادام لەهێرۆشیمای دەربڕینماندا ئەتۆمی دەم کوتی تەقێنراوە پێویستم بە پشووە دەچمەوە ئوتێل.

هەڵسامە سەرپێو ووتم:

– بابێم و تەنیانەبێ. ڕەنگەپێویستت بەیارمەتی هەبێ.

بێ ئەوەی بەدەم قسەبکا. دەستی بە(پەلی)بەرەو ڕووم کردەوەو چەند جارێکی ئیشارەتی پێ کرد بەدانیشتنەوەم و نەچووم لەگەلی.

هێمن و نەرمی و بەئارامی هەڵسان و ئیشارەت و ڕۆیشتنەکەی گفتیان بڕیبووم. گەلێك کاریان تێکردم. بەخەمناکی لەسەر کورسیەکە دانیشتمەوە. دەستم دایە پارچەکاغەزەکان و شیعرەکەی لەسەر مێزەکەو دەستم کرد بەخوێندنەوەیان.

***

(٣)

١٩٧١/٤/٣

شەممە

مانگی نیسان وناسراوە کە مانگی گوڵان و سەیران ودڵ خۆشیە. بەڵام من زۆر وەڕەس و بێ حەواس بووم.

شەممەشە ڕۆژی سەیران نیە دەنا ماڵ و منداڵم دەبردە دەشت و هەوڵم دەدا خۆم مەشغوڵ بکەم. سەرەڕای ئەوە سەعات دەی سەر لە بەیانیە. کاتی یانەو ئێوارە پیاسەش نیە.

هەستم کرد پێویستم بە جێی چۆڵ و کەس نەدیو هەیە تا مۆڵەتێك تیایدا تەنیاو بێ قرەبم. دوور لەهەموو خەڵەتاندنێکی ئادەمزادانی دەوروبەرم.

سەرچنارم بە باشترین و نزیکترین جێ زانی. لە ویستگەی پاسەکە وەستام. زۆری نەبرد لە ئاستی ئاوو باخەکە دابەزیم. بە باشوری ڕێڕەوی ئاوەکەچووم، لای ڕیزەدارەکانی دامێنەوە تەریکترین شوێنی باخەکەی سەرچنارە. جێی تەنیایی و خەیاڵاتە.

کاتێکم زانی وەك حەکایەتی پڕلەجادوو. هاوڕێ نائاساییەکەم بەرەو ڕووم بووەوە. بەدەم یەکەوەپێکەنین و دەستی یەکمان گوشی و ڕۆژباشمان لەیەکتری کرد. هەر ئاسایی وەك ئەوەی بەنەخشەو پلانێکی دیاری کراو، هەردوولا بڕیارمان دابێ لەوشوێن و کاتەدا یەکتری ببینین. مۆڵەتی نەدام هیچی لێ بپرسم یەکسەر ووتی:

– چیم پێ ووتی!! ناهەقم کە ڕقم لە یازدەی ئازار هەڵسابوو خۆ بەچاوی خۆت دیت! یەکێك ئالو گۆڕی ئۆتۆمبیل دەکاو یەکێکی تر ژن دێنێ، قەیناکا بەڵام بە کیلۆ ئاڵتوون دەکڕێ. ئەو گازینۆو چێشتخانەی فەنتازی دەکاتەوە. کۆمەڵێك مقاولی..... سپین. جائیتر حساباتی پیاوەگەورەکانیش لەولاوە بوەستێ. پلەو پایەی گەورەی دایەرەکان نەما. کاکە بەرناکەوێ.... ئەوەسەرۆکی پۆستەیە، ئەمەسەرۆکی شارەوانیە. ئەوانەی تر هەریەکەو بەڕێوەبەری کارگەو کۆمپانیایەکە. ئەمانی تر فەرمانبەری زل زلن لەپارێزگاکاندا. هەرلەپارێزگاو جێگرەکانیانەوە تا مووچە خۆری مشە خۆری بێ دایەرەو دەوام. جەماعەتی سەریشەوە. هەر لە وەزیرو جێگرەوە بیگرە تا موستەشارو خاوەن دیوان و ڤاڵڤۆو مارسیدس. هەی هوو کەری نێر نای کێشێ! هەرچی پێشمەرگە گیان بازو خۆ بەخت کردووش هەیە بێ کەس و بێ لێپرسینەوە بەسەر کەس و کاریاندا کەوتوون. لەسەرەتای دەوامەوە تا دوای دەوام لەبەر دەرگای تەجنیدەکاندا بەسەر یەکتردا داماون. ئینزیباتی لوت پان بە دار هەڵیان دەبڕن و داوایان لێ دەکەن، بێگومان بەدەم جنێو دانەوە، کە پاڵەپەستۆنەکەن و بە سلوکەت ڕیز بن تا دەفتەری خدمەکانیان بۆپڕ دەکەنەوە.

تو شەرەفت ئەوە حاڵە ! شۆڕش و ئەنجامی شۆڕش ئاوادەبێ ؟!

ئەگەر ئەنجامی ئەم شۆڕشە، ئەنجامی حەکایەتەکەی بلوێرژەنی....دوونەبوو، چی دەڵێی بیڵێ! دەبێ بەم شۆڕشەش بڵێین (فت) ڕۆی. تازەحسابی دەرچوو.

هەڵچونی هاوڕێکەم زۆرخۆش بوو. یەکێك گوێی لێمان بوایە. نەدەچووە عەقڵیەوە کە تازە یەکمان دیوە. وای دەزانی لە بەیانیەوە مشت و مڕمانە و ئێستا گەیشتوینەتە ئەنجام و خەریکین لێ دەبینەوە. تەنیا من خۆم کەوتمە گومانەوە و لەخۆم پرسی:

((تۆبڵێی وادەمان لێرە نەبووبێ و من بیرم چوبێتەوە؟!!)).

زەردەخەنەیەك گرتمی و لەسەخۆ لێم پرسی:

– گرنگ ئەوەیە ئەم ڕق هەڵسانەت هیچی بەدەمەوەبوو؟ کوا چیت پێیە؟

– ئەی چۆن! دووسێیەکی تریشم دڕاندووە. گوێ بگرەبزانە لە زمانی پێشمەرگەیەکەوە کە دەچێتە ماڵی وەزیرێکی کورد چیم نووسیوە.

ئەوەی ووت و دەستی کرد بە گیرفانیدا. تەنیا یەك پارچە کاغەزی دەرهێناو کەوتە خوێندنەوەی.

یەکەمجاربوو ببینم بەدەم خوێندنەوەی شیعرەوە ئیشارەت دەکا:

ئەی کورسی گەورەی میهرەبان
ئەی مێزی پان
ئەی دیواری سپی و بەفرین
ئەی تەپڵەکی نەخشین و جوان

ئەی سورەیای کریستاڵی پڕ مرواری
ئەی خزمەتچی پوخت و پۆشتە
ئەی گوڵ ڕەنگین کاکە (ئۆرتە)

ئێوە هەموتان، ئەی خزمان
هەموو وەکو کوڕی من وان
بە عەرەق و خوێنم کڕران

گەر هاتەوە هەڤاڵ وەزیر
لە ئێوەی نازداری دڵگیر
پرسیاری کرد:
-ئەوە کێ بوو؟
بڵێن: قوربان
هەتیوێکی پێشمەرگە بوو
بە خوا وابزانین شێت بوو
چونکە ئەوە دوو هەفتەیەو هەتا ئێستا
لەبەر دەرگای تەجنیدەکا
هەربەتەنیا
بۆ یەك ئیمزا
بۆ ئیمزایەکی تەسکەرە
دەربەدەرە.

١٩٧١/٣/٢

هەر شیعرەکەی تەواو کرد. بە ئەدەبێکی زۆرەوە قەدی کرد و دایە دەستم ووتی:

-فەرموو ئەگەر نەت پاراست بیخەرە ئاوەکەی سەرچنارەوە دوایی خۆم لە سلێمانی بە بەلووعە لەێی دەخۆمەوە و هێدی دەبمەوە.

شیعرەکە کاری تێ کردم و زۆر بەهێز هاتە پێش چاو خۆم بۆنەگیراو پێم ووت:

- هاوڕێی ئازیز تۆ بوویتە شاعیرێکی باش. لە کاتێك دا پیرۆزبایت لێ دەکەم. تکاشت لێ دەکەم واز لەم ڕەفتارە نائاساییەو سەیرە بهێنە. برا نەختێك خۆتیان پێوە ماندوو بکە. هەروا دوورە پەرێز مەبە. ئێستا برا، گەر واز لە ڕەفتارەکەت ناهێنی ئەدرێسی خۆمت دەدەمێ. کەویستت بیان درێنی بە پۆستەدا بۆم بنێرە.

- لای من ئەم شۆڕشەش وەك شیعرەکانی من وایە ئەگەر ئەوەی پێشوو نەدرێنی. لە دوای ئەوەوە ناتوانی هیچ بکەی.

- برای باش. شۆڕشی چی و حاڵی چی؟! من دەڵێم تۆ توانایەکی باشت هەیەو گەر ئەم شیعرانەت. واتە بیرو هونەری شیعرەکانت پاڵفت و مشت و ماڵ بکەی. گەر لام سەر لایی چمکی شیعر نەگریت و تۆزێك خۆتی بۆ تەرخان بکەی. دەبیتە شاعیرێکی چاك و ناسراوو خزمەتگوزاری گەل.

کەمێك تێی ڕوانیم پاشان سەر لووتی خوراندو ووتی:

- هاوڕێی خۆشەویست، کاکی گەورەم. وولاتەکەی ئێمە قاڵبێك کێکی شیرین بوو. لە ئاهەنگی زل هێزەکانی جیهاندا کوت کوت کراو هەر قاشەی خرایە گەرووی نەڕەشێرێکی دەبەنگەوە. شیعر چی لەم حساباتەدەگۆڕی؟ خۆت بۆ هەڵە دەکەی! ئێمە پێویستمان بە فەلسەفەیەکی زانستیانەیە، واقیعیانەو عەمەلی هەیە. فەلسەفەیەك ووزەو توانای کرێکاران و چەوساوانی نەتەوەکەمان یەك بخا. ڕێ نمایی بکا. بەرەو ڕزگاری و شارستانێتی ببات نەك سێ چوار وورێنەی ناومان لێ ناوە شیعر. شیعری قوربەسەر چی لەدەست دێ؟!!

ویستم ڕۆڵی شیعری تێ بگەیەنم. ویستم حاڵی بکەم لەوەی یەك لایەنی بیر نەکاتەوە و ڕۆڵی بووەکانی تری ژیان نەکوژێنێتەوە. بەڵام ئەو هەر ملە لەقێی بوو. بۆ پانتایییەکی پشت منەوەی دەڕوانی. کەزانی درکم بەشتێك کردووە. مۆڵەتی قسەکردنی نەدامێ. یەکسەر باسەکەی گۆڕی و ووتی:

- ببورە وادەی دیدارێکم هەیە لێرە. ڕەنگە ئەمەت بەلاوە ئاساییبێ. کەسێك نەتوانێ یەك مرۆڤی خۆش بووێ و دڵسۆزی بێ ناتوانێ نەتەوەیەکی خۆش بووێ یان دڵسۆزی چینەکەی خۆی بێ و خۆشەویستی سوننەتی ژیانە. خۆشەویستی نوێژی مرۆڤە بۆ مرۆڤ. بم بەخشەکەناتوانم گفت و گۆکەت لەگەڵ تەواو بکەم. بە ئومێدی یەك بینینەوە.

کەبەدەم ماڵ ئاوایییەوە ئاوڕم دایەوە. خانمێکی شیکم بینی لای پردەکەی خوارینەوە چاوەڕێی هاوڕێکەمی دەکرد.

نازانم دوای ئەوە چیم کرد! هێندەم زانی لە پاسەکەی سەرچناردام و بەرەو شار دەگەڕێمەوە و چاکیشم برسییە.

(٤)

١٩٧١/٩/٢١

سێ شەممە

من لەمەسەلەی نەخۆشی ماڵ و منداڵدا، کەمێك ترسنۆکم. پزیشك بەهاوسەرەکەمی ووتبوو:

- بەگوێرەی پشکنینەکانی من دەبێ (نۆ) ی مانگی ئەیلوول مناڵەکەت ببێ.

نەخێر درێژەی کێشا، مانگ بوو بە (نۆزدە) ش هەر نەی بوو. من توانای هێندە چاوەڕێ کردنم نییە لە مەسەلەیەك پەیوەندی بە دروست و نادروستی تەنەوە هەبێ. بەڵام خەتاکە هی دایکم و خەسووم بوو، بەوە ڕاپانگرتووم کە ڕەنگە مناڵەکە (کوڕ) بێت. چونکە کوڕ لەبووندا دوا دەکەوێ و ئاساییە. بە پێچەوانەی (کچ) ەوە کە پێش کاتی خۆی دەکەوێ. هاوڕێیانی پزیشکیشم ڕووی زانستیانەی ئەو حاڵەیان بۆ دەسەلماندم. بەڵام هەرخۆم بۆ ڕانەگیراو شتەکە لەتام دەرچوو.

ناچار ئۆتۆمبیلم بۆ گرت و بەرەو بەغدا کەوتینەڕێ. بۆ لای ئەو پزیشکەی بۆیان دیاری کردبووم.

گەیشتینە جێ ویستم گرنگی حاڵەکە بۆ فەڕاشەکەی ڕوون بکەمەوە، بێ سوود بوو، دەفتەرێکی حساباتی شەکرو چای گرتبوو

بەدەستەوە و دەیویست بۆم ڕوون بکاتەوە کەدەبێ (دە) ڕۆژی تر بێمەوە. ئەوجا نۆرەم دەکاتە سەر

لێم پرسی:

– ژمارە چەند لە ژوورەوەیە؟

– ژمارەیازدە

– دەباشە من ژمارە دوازدەم. گەر باوەڕناکەیێ بڕوانە لاپەڕەی سەرەکانی ئەمڕۆ.

کابرا زۆر سەرسام بوو. خێسەیەکی لێ کردم و چاوەکانی زۆر بەئاشکرا پێیان دەووتم: (تۆ درۆزنترین ئادەمزادی).

گەیشتە لاپەڕەی ئەو ڕۆژە. تا ئەو گەیشت، من دینارێکم بۆ نوشتەکردبوو خستمە سەر ژمارە (١٢) دوازدە. زەردەخەنەیەك گرتی و بە سوپاس مەندیەکەوە تێی ڕوانیم. بە ئاشکرا چاوەکانی پێیان دەوتم:

(تۆ ڕاستگۆترین ئادەمزادی).

هاوسەرەکەم لە ژمارەی کرراودا چووە ژوورەوە. پاش مۆڵەتێك، لەژوورەوە زەنگێك لێ درا. فەڕاشەکەچووە ژووری. زۆری نەبرد هاتەوەو ووتی:

– میران جەنابتیان دەوێ . فەرموون. ئەوی ڕاستیبێ، ترسام و بەپەلە خۆم کرد بەژووردا. خۆ، کە پزشکەکە پێی ووتم:

– ئەمەنامەیەکە بۆ خەستەخانە، تا بیخەوێنن. ئەوەش کارتێکە ئەدرێسی خەستەخانەکەی تێدایە، بیدە دەست شۆفێری تاکسیەك دەتان گەیەنێ.

هێندەی تر شڵەژام و بێ ئیختیار پێم ووت:

– تکایە تێم بگەیەنە. چیەتی؟ مەترسی لەسەرە؟

بەهێمنی حاڵی کردم کە شتێکی ئەوتۆ نیە مەترسی لێ بکرێ. بەڵام پێویستە لە ژێر چاودێری دا بێ تا سلامەت و بێ ئەرك منالەکەی ببێ.

بردمە خەستەخانەی دیاری کراوو خەواندم. شەوم بەهەرحاڵ بردەسەر. بەیانی زوو چوومە خەستەخانە. چاوانم لە کەم خەویدا سوور هەڵگەڕابوو. پزیشکەکەی دوێنێ ئێوارەم لە ساڵۆنەکەدا تووش هات. بەپەلە بەیانی باشم لێ کردوو هەواڵی هاوسەرەکەمم لێ پرسی.

زەردەخەنەیەك گرتی و لەسەر خۆ پێی ووتم:

– مزگێنی بێ کوڕێکی ژیکەڵەتان بووە. خۆیو دایکی تەندروستن. لە هۆڵی یەکەم ژووری دووەمە. بەس دەبێ ببوری، تەنیا خانمان بۆیان هەیە بچنە دیداری. عەسر سەعات چوار وەرە بیان بەرەوە لەگەڵ خۆت.

سوپاسێکی زۆریم کردو بەکەیف و خۆشیەوە هاتمەدەرێ.

بەپاسی ژمارە (٤) خۆم گەیاندە قاوەخانەی بەڕازیلی لە شەقامی (ڕەشید). تا بەیادی ڕۆژانی قوتابێتیم لە زانستگا. چەند سەعاتێکی تیادابەرمەسەر. خۆم کرد بە قاوەخانەکەدا هەموو گیانم ئاسوودەیی بوو. ئەخێر ئەو ڕۆژە بەختەڕۆژم بوو. هاوڕێ عاشقە ناناسایی‌یەکەم لە گۆشەیێکی تەریك دا خەریکی ڕۆژنامە خوێندنەوە بوو. بەخۆی نەزانی تا بە نقێمی مستیلەکەم تەقەم لە مێزەکەی هەڵسان.

زیاد لەپێویست داچڵەکیو ترس سیمای داپۆشیبوو. شەرمەزاربووم لەکارەکەم. بەڵام هەر چەند چرکەیەك بوو ڕووی گەشایەوە هەڵسا لە بەرم و بەگەرمیەکی زیاد لەپێویستەوە پێشوازی لێ کردم. نەك هەر شەرمەزاریەکەی بیر بردمەوە بەڵکە هێندە خۆشحاڵم بینی، هەستم کرد ئەویش وەك من، بەختە ڕۆژێتی.

لەخۆمەوە حەزم کرد حەکایەتی هاوسەرەکەم و کوڕە نۆبەرەکەمی بۆ بکەم. ئەوەم لێك نەدایەوە کە ڕەنگە ئەو خۆشی لەو باسەی من نەیە. ئەوەی هانیشی دام. ئەو بەشداریەگەرمەی بوو. سەرەڕای دڵخۆشی خۆ دەربڕینی بەباسەکەم.

لەپڕێکدا بەدەم پێکەنینێکی پرس ئامێزەوە لێی پرسیم:

– ئێستا، کە، بیر لەم هەڵوێستەی خۆت و هاوسەرەکەت دەکەیەوە. هەست بە چ گۆڕانکاریەکی نوێ دەکەی.؟

– تێ ناگەم.

– چ جیاوازیەکی نوێ دەبینی لەگەڵ جارانی لێك جیابوونەوەتاندا ؟

بەکوردی و کورتی تێم گەیاند کە زۆر کەیف خۆشم و تاقەتی بیرکردنەوەو مەتەڵ و مەتەڵبازیم نیە.

بەسەرسامیەوە ووتی:

– زۆرئاسانە. نە بیرکردنەوەی دەوێ و نە مەتەڵە!

– چۆن؟

– بۆ یەکەم جارە لە ژیانی خێزانیتاندا. کەتۆو هاوسەرەکەت لە یەکتری دوور دەکەونەوە تۆ بەتەنیایت و ئەو بەتەنیانیە، چونکە کوڕەکەتانی لەگەڵە. ئێستا تۆ یەکی و ئەو دووانە.

سەیرێکم کردو ووتم:

– ڕاست دەکەی من بیرم بۆ ئەوە نەچوو. تانیوەی ڕستەکانیشت وام زانی باسی مەسەلەیەکی تەم و مژاوی (ڕووانگە) ئاسام بۆ دەکەی.

وەك شتێکم بیر خستبێتەوە. گورج پێی ووتم:

– بەڕاست بیرم چوو. پێم خۆش بوو لەهەڵوێستەئەدەبیەکانتا سەر بە گروپی ڕووانگە دەرنەچووی.

ئینجا من لێم پرسی:

– ئەی تۆ بەتەحدید، ڕات چیە بەرامبەریان؟

کەمێك تێی ڕوانیم و لچێکی هەڵقورتاند، ووتی:

– ئەمڕۆ بەکەڵکی قسەبۆکردن نایەیت.

– بۆ؟

– هێندە دڵ خۆشی، ڕابردووی هاوڕێکانت بیر نەماوە.

– پێم بڵێ : بۆ؟

– دەبوو ئەو پرسیارەم هەر لێ نەکەی. دەبوو خۆت بزانی من لایەنگری ئەو کەف و کوڵەنیم و بە کارێکی بێ ئەنجامی دەزانم.

– لەگەڵ ئەوەش دا کە دوو شاعیرو دوو چیرۆك نووسی خاوەن سەلیقەو هونەر مەندیان لەگەڵە؟

– بەڵێ، لەگەڵ ئەوەش دا. چونکە مەسەلەی لای من و بروام ئەوەیە: لەهەموو بزوتنەوەو راپەڕین و گۆڕینەکارو شۆڕشێك دا، یەك بوونی فەلسەفەیە. یەك بوونی ڕێبازە. یەك بوونی بەرنامەیە. دیاری کردنی پرۆگرامی کارکردنە. مادام زۆربەی برادەرانی ڕوانگە هەریەکە لەئاوازێك دەخوێنن و هەندێکیشیان تلپەی بەجێماوی پارت و ڕێکخراوەسیاسی‌یەکانن. لەبەر ئەوە نەسەردەگرێ. نەهیچیشیان پێ دەگۆڕێ. لەئەو پەڕی حاڵەتی سەرکەوتنیشدا مەسەلەکە فۆرم کاری زیاتر هیچی تری لێ هەڵناکرێ.

خۆ گەر دەتەوێ جگە لەم وەڵامە فەلسەفیە. وەڵامی سۆزی خۆشمی تێکەڵ بکەم. ئەوا ڕەقترم بەرامبەریان چونکە کارەکەیان دەشێ لەئەنجامدا زیانی هەبێ و کێشەسەرەکیەکانی کۆمەڵ و ململانێ گەورەکانی قۆناغەکەداپۆشن. بەخۆ بزانن و بەخۆ نەزانن خەڵکی مەشغوول دەکەن بە شکڵ و شێوەو هونەری فۆرم سازیەوە و وایان لێ دەکەن شتە گەوهەریەکان بەدی نەکەن.

لێ گەڕام تالێبووەوە. ئەوسا لەسەرخۆ پێم ووت:

– دەشێ وەکو گەوهەری سەرەکی و کرۆکی مەسەلەکە لەگەڵت بم. بەڵام لە جوزئیاتدا نەء. چونکە سەرەڕای ئەوەی ڕاکانت زۆر توند و تیژو بێبەزەییانەن و لێت دان، هیچ نەبێ ئەو گۆمەیان شڵەقاد کە... نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم هەڵی دایە، ووتی:

– تکایە با کات بەوەوە نەکوژین. دەنا زۆرم پێیە دەربارەیان. بەسەری خۆم ئەو گۆم شڵەقاندنە پولێك ناکا. ئاو لەسەرچاوەوە لێڵە. کارێز کەندی کارزان و هوشیاری دەوێ. دوو ملیۆن سەرەمێکوتەی ڕوانگە ئاسا ڕۆشنی ناکاتەوە. ها... بیرم کەوتەوە!

تۆ دەزانی ئەوانەی ناو ڕوانگە وەکو من ڕقیان لە مفاوەزاتەکەی ئازارە؟! بەڵام بە خۆیان نازانن!

– خۆ، تۆش ڕقت لێیەتی. کەواتە بۆ لایەنگری ڕوانگە نابی؟!

– نەء ئەوە تەنیا خاڵێکەو هەر لایەنمان لە دیوی خۆیەوە بۆی دەڕوانێ. جگە لەوەیئەوان بەخۆیان نەزانیوە. بەڵام من چاك بەخۆم دەزانم و ڕایەکەم دژی (ئازار) لە هەڵوێستی هۆشیارانەمەوەیە.

– کاغەزێك لە گیرفانتا دەبینم. گەر شیعرە بۆم بخوێنەوە. با لەدەست ئەم ڕوانگەیە ڕزگارمان ببێ.

پڕ بەگەروی پێکەنی. پێکەنینەکەی درێژەی کێشا. تا ووتی:

– دەزانی بەچی پێدەکەنم؟

– نەخێر.

– دەتەوێ بەشیعرەکە لە باسی ڕوانگە ڕابکەی کەچی شیعرەکەشم لەسەر ئەوان داناوە.

– گرنگ ئەوەیە گوێم لێبێ.

– فەرموو:

دەستی کرد بە خوێندنەوەی شیعرەکە:

یەکەم:

یاخی بووەو شۆڕشگێڕە!
دەستی لەسەر ئەژنۆیەتی
ئەڵێ: توخوا، ئەمەحاڵە؟!
-باشە گیانە شتێك بکە
-کێ؟ من بیکەم؟!
من یاخی بووم فێریان ئەکەم
کامەیان زیادەو کامە– کەم.
بە دەمیشیەوە ڕائەکەم
تا لەکاروان خۆم دوانەخەم.
بەڵێ جوانە، زۆریش جوانە
یاخی بووی گورج جەناپتانە

دووەم

یەکێکی تر
ئەڵێ: لە ڕیزی پێشەوەم
کەچی بە جۆرێك دەنووسێ
لە شێوەی سەدەی پازدەیەم
تەنها بەوە یاخی بووە
کە باسی یاخی بوون کرا
دەست پێشکەری خۆی کردووە
ئەمیش جوانە. زۆریش جوانە
یاخی بووی ڕاست، جەنابیانە.

سێیەم:

یەکێکی تر، هەرهیچ نییە
سفری چەپی ژمارەیە
تانە، لەمێژوی خەباتی گەلی ئەدا
ژیانی لەلا (دامە) یە
بدۆڕێنێ و بباتەوە
هەر تەنیا (داشە هارە) یە

بەڵێ جوانە، زۆریش جوانە
یاخی بووی نوێ: ئەمەیانە.

* * *

چوارەم:

یەکێکی تر، بەرهەمەکەی تەلیسمێکە
تەم و مژەو دووکەڵ ئەکا
بۆ مجامەلە پێی بڵێی
پەنجا کەس لەم شتەت دەگا.
ئەڵێ: بەسە..
ئەوانی تر ملیان ئەشکا
ئەبێ بلێی: لەڕێگەی خوا
بینووسە. خەڵك تێی بگا
لای ئەو یاخی بوون (تەخت)ێکە
فیرعەونێتی و سێبەری خوا

ئەمەیان هەر گەلێك جوانە
یاخی بووی تیژ..ئەمەیانە!
* * *

چیرۆکی ئەم یاخی بوونە
وەکو حەکایەتی مێشە
هەویرێکی زۆر ئاو کێشە
وەکو مەسەلەی دەروێشە:
ئەوەی شمشێر لە خۆی ئەدا
هەر دەروێشە.
ئەوەی دووریش زیکر ئەکا
هەر دەروێشە.

١٩٧١/٩/٢٠

دیمەنەکانی نیمچەکاریکاتێر بوون. بەڵام خۆی ئاسایی گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نەدابوو. منیش چونکەسەر لە بەیانی زوو هەڵسابووم و لە شیرێك زیاترم نەخواردبوو. قاوەکەش کاری خۆی تێکردبووم. لەبەر برسێتی حەواسی لەسەر دوانم نەبوو. بۆیە نەمویست لەسەر حسابی گەدەم بدوێم.

پێم ووت:

لەگەڵ ئەوەشدا کە لەگەڵ ئەم توندوتیژییەتدا نەبووم و نابم. بەڵام فەرموو هەر داوەتی من بە. لەتەك ئەم قاوەخانەیەوە چێشتخانەی (مام ئەلیس)هەیە. با بچین دووپارو نان بخۆین.

چونکە هاوڕێکەم ناسایی بوو هیچ بەلامەوە سەیر نەبوو کە بەدەم هەڵسانەوە ووتی:

— چاکە. بڕوات بێ ئێستا بیرم کەوتەوە کە لە دوێنێ نیوەڕۆوە نانم نەخواردووە.

(٥)

$\frac{٥}{٦}$ /١/ ١٩٧٢

لە (یانە) بەبۆنەی دامەزراندنی سوپای عێراقەوە فیلمێکی نایابیان نیشان دا. ئەو شەوە درەنگ چوومەوە. پاش ئەوەی پشوویەکم دا هاوسەرەکەم تازە منداڵەکەی نواندبوو. دەستی لەبێشکەکەبەرداو لەسەر ڕەفەکە. زەرفێکی دایەدەستم و ووتی:

ئەمڕۆ ئەم نامەیەت بۆ هاتووە بابیرم نەچێتەوە. چونکە ئەم منداڵە هێندە گرۆزە ناوی خۆشمی بیر بردوومەتەوە.

نامەکەی دامێ، هەر دەست و خەتەکەم بینی ناسیمەوە هی هاوڕێ ناناسایییەکەم بوو. سەیرم لێ نەهات چونکە جارێك ئەدرێسی خۆم دایە کە گەر بۆی کرا شیعرەکانی نەدڕێنێ و بۆم بنێرێ. لەدڵی خۆمدا ووتم: (تۆبڵێی بەقسەیکردبم و ئیتر بەرهەمەکانی خۆی نەدڕێنێ!)

زەرفەکەم هەڵپچڕی نووسیبووی:

* * *

ژیانتان شاد . ڕێزو سلاو بۆ خۆت و هاوسەرو بەرخەکەتان.

هاوڕێی ئازیز. ئاهەنگی کریسمسم لەشوێنێکیخۆش بەسەربرد. حەزم کرد ئاگادارت بکەمەوە. چونکە چەندم کرد لەپرۆژەی شیعرەوە بۆم نەکرا بەشیعر ناچار لەبەرئەوەی دەستم ناچێتە پرۆژە تابیدڕێنم وابۆم ناردیت. کاشکا ببوایەتە شیعرو خۆم بمدڕاندایە بەڵام چیبکەم؟! نەبوو.

—لەدەرەوە—

دیوار: سپی، یاساوڵ: پۆشتە، چاو: وریا، هەنگاو ڕێکوپێك، ژمارە:٣

وەك پێم ووترا
چوومە ژوورێ.

* * *

—لەژوورەوە—

دیوار: تەڵخ، یاساوڵ: قوڵ ڕووت، چاو: سوور، تاریکی: دەستکرد،

کاسەی ئێسك
کاسەی ئاسن
وایەر، گلۆپ، دڕێل، سنگ، مێخ...
* * *

—مامەڵە—

چای شیرین و جنێوی تاڵ
قسەی نەرم و پرۆجەکتەر

وادەی سپی و هەڕەشەی ڕەش
هیچ. هیچ. هیچی بێ دەنگ.

* * *

-گۆرانی-
باوانەکەم
مەرگ باوکی
هەموو ترسێکی مرۆڤەو
ترسەکانی من، هەتیو بوون
بۆیە دەڵێم:
- ئەگەر ڕۆژێك
تەرمەکەیان هێنامەوەو چاوم نەبوو
دڵنیابە لە چەکمەجەی فرێزەردایە
تەنیا لەبەر ئەوەی
تۆی تیا سەوزی
دەشێ بۆ ئەم کۆستە بگری؟!
- مرۆڤم و دارو بەرد نیم
دەشێ زۆر بەکوڵیش بگریم
بەڵام گیانە
دڵنیا بە
تۆ فرۆش نیم
چۆن نەگریەم؟!
ئەی لە دوای چاو
چی بۆ دووریت بگریێنم؟!
چرۆی سپی و وەنەوشەیی خۆشەویستیت
لە چ چاوێکدا بڕوێنم؟!

- گیانە بگری و من دڵشادم بەو گریانە
منی غەریبی ناو دۆستیش
لەم شارە خۆشی نەدیوە.
کەشەیدای کەلەپچەی زیوە
چاوێکم لە جۆری چاوی
تۆ نەدیوە

با، چۆن دەگمەن بوو ژیانم
هەروا، دەگمەن بێ گریانم
وا، دەگمەن بێ
شین و شەپۆری نەمانم
چونکە خامەی مەرگی خۆمم
خستە مشت و هەتا ئێستە
سەهۆڵی ئەم خەڵکە وەك خۆی
هەر سەهۆڵەو قوڕ هەر خەستە.

خەمناکیەکی زۆر گیانمی سەرشار کرد. لەتەك ئەوەشەوە دڵنیا بووم لە گومانەکەی جارانم، کە دەشێ ئەم هاوڕێیەم لە گروپێکی نا ئاشکرادا کاربکا، دڵنیاش بووم لەوەی ئەو گرووپە وەك گرووپە تەقلیدیەکانی تری ناو عێراق نیە، کە ئاشنای لای ئێمە مانان.

لەگەڵ ئەوانیشدا من لام مەبەست نەبوو چین و چۆنن. بەقەد ئەوەی تەندروستی هاوڕێکەم لا مەبەست بوو. ئەدرێسی خۆشی نەنووسیبوو تا بچمە دیدەنی.

بەڵام ئەدرێسی چی بنووسێ. ئەوێك هەر ڕۆژەی لە شارو کوچەیەکی جیاوازە. تا درەنگانێك لە خەمی دا بێ خەو مامەوە



(٦)
١٩٧٢/١٠/٢
دوو شەممە

دەشێ لە هەندێ لەشارەکانی عێراقدا. ناسیاوو برادەرو هاوڕێم هەبن. بەڵام لەشاری بەسرە کەسم نەناسیوەو کەسم لەوێ نیە. بۆیە سەرسام بووم کە هاوسەرەکەم ووتی:

- نامەیەکت لە بەسرەوە بۆ هاتووە. بەڵام سەیر ئەوەیە. هیچ پوول و مۆرێکی دایەرەی پۆستەی پێوە نیە!

- سەیری چیە؟ ئەوەی ناردوویەتی بە ناسیاوێکدا ناردوویەتی واتە بە دەستیە.

- ئەی کە بەدەستی ناردوویەتی لای نامەبەری پۆستە چی دەکا؟!

- یەعنی دابەشکەری ڕەسمی پۆستە هێنای؟!

- بەڵێ. ئەی منیش لەبەر ئەوە سەیرم لێ ئەهات.

- ئادەی. گورجکە بۆم بێنە.

کە نامەکەی دایە دەستم. دڵە ڕاوکێیەکی سەیرم هەبوو. مرۆڤ لەشتی نادیارو نەزانراو زۆردەترسێ. بەڵام هەر کەدەست و خەتەکم بینی و هی هاوڕێ نائاساییەکەم بوو ترسەکەم نەماو زەردەخەنەیەك گرتمی.

هەم دڵنیابووم لە ئینتیمای هاوڕێکەم بە گرووپێکەوە هەم دڵنیابووم لەوەی ئەو گرووپە لە ئەش و ئمادان و شێوەی تایبەت و کارنامەی نوێی خەباتیان هەیە.

هەروەها دڵنیابووم لەوەی ناوەڕۆکی نامەکە کەڵکی پۆستەی ڕەسمی نەبووە. بوونی هاوڕێکەشم لەبەسرە شتێکی زۆر ئاسایی بوو بەلامەوە. چونکە ئەدرێسی ئەو بێ ئەدرێسی‌یە.

نامەکەم هەڵپچڕی و کەوتمە خوێندنەوەی:

* * *

مامۆستاو هاوڕێی ئازیزم

ژیانی سێ قۆڵیتان شاد، بەختەوەرو بێ وەی بن. ڕێزو نەوازش. شێی شاری بەسرە گیانی لینج کردووین. لێرەهێشتا گەرما تینی‌ماوە. جارنەجارە وەڕسمان دەکا. بەلام تۆمان هەرلەبیرە. سەرسام مەبە کەبەشێوەی (کۆ) قسەدەکەم. چونکە لە زمانی کوردی‌دا، شێوەی قسەکردنی دوانەنی‌یە. ئێستا لەگەڵ ئەو هاوڕێیەمدام کە لەسەرچنار بینیت.

پلەیەك سەرکەوتین و ئێستا هاوڕێ و هاوسەریشین.هەندێك لە هاوڕێیانمان،یارمەتیان داین و لە ژوورێك دا بۆ ماوەی ٢٠ڕۆژ جێیان کردووینەوە.هاوڕێیانم حەزیان کرد قازی‌یەکەمان خەڵکی بەسرە بێ.منیش کردم بە بەزم لەگەڵیان دا ووتم:هەقە ماوەی ی(هەنگوینە مانگ ) یشمان لە (زاخۆ ) بێ.کەچی بە قسەیان نەکردم.خۆت دەزانی کورد ووتوویەتی ( میوان کەری خانە خوێیە ) مەسەلەکەش ئابووری‌یە. چونکە ئەو چەند عانەیەی گیرفانی هەردووکمان کەڵکی چوونە زاخۆی پێوەنەبوو.

شەوی یەکەمی پێکەوە بوونمان. زۆر دڵ خۆش بووین. بۆ یەکەمجار لەساتی دڵ خۆشی‌یەکی زۆردا خولیای شیعرێك دای لەکەللەم.هەر ئەو شەوە مۆڵەتم لە هاوڕێی هاوسەرم خواست قەڵەم و کاغەز بگرم بەدەستەوە.کەچی خەمناکترین و ڕقاویترین پڕۆژەی شیعرم هات بەدەستەوە.بەدەست خۆم نی‌یە و نەبوو.شەو درێژەی کێشاو پڕۆژە شیعر،نەبووە شیعر.

هاوسەرەکەم بە هەقایەتی من و تۆ دەزانێ ڕێی ووتم:مادام پڕۆژەت بۆ نادڕێ بەپەلە بینێرە بۆ زامنکاری شیعرەکانت-مەبەستی تۆ بوو- چونکە گەر نەی دڕێنی یان بۆی نەنێری دەبێ ئەم بیست ڕۆژەی پێکەوەبوونمان لە بری خۆشەویستی باتۆ خێسە لە قەڵەم و کاغەزەکەت بکەیت و منیش خێسە لە تۆ بکەم.

هەق بەو بوو.پێویستی نەدەکرد وا تۆخی بکەمەوە.بۆیە بەم نامەیەدا بۆت دەنێرم.بێ خەم بە لە شێوەی هاتنەکەی.کاری هەندێك هاوڕێمە و لێ یان دڵنیام.

ئەمەش پڕۆژەکەیەو ببەخشە لەم ئەرك خستنە سەرەت.وای حساب بکە ئەم مەشغووڵ کردن و کات کوشتنەت دیاری خۆتە بۆ ژن هێنانی من.دیسان سوپاس.

دەستی بە دەست باوکیەوە بوو

ووتی:بابە تۆ داواکەمت لە بیرە

-کام داوایە؟

-کە پێم ووتیت:بابە حەزم لە هەنجیرە!

ئەم منداڵە ئەوەی ووت و ئۆتۆمبیلێك (ڕاسپاردە )

تیژڕەو هات و باوکی شێلا

ئەمیش تەرمی پلیشاوەی. باوکی بینی

لەسەر تەختی شەقامەکا.

* * *

پاش ماوەیەك هەمان منداڵ بە دایکی ووت

-دایە حەزم لە هەنجیرە

بەلام نەپلیشابێتەوە.

زۆری نەبرد

کۆمەڵێك داگیر کەر هاتن

دایکیان بە زۆر بردە ئەودیو

* * *

منداڵەکە

پڕبە هەمووگەردوون گریا

ووتی:خەڵکە

من حەز لە هەنجیرێك دەکەم

وەکو دایك و باوك و بووکە شووشەی هیچ منداڵێك

وەها نەپلیشابێتەوە

وەکو سنووری سەربەخۆی ئەم ووڵاتە شیرینەی من

هەر گیز نەکوژابێتەوە.

دوای خوێندنەوەی شیعرەکەی ناوی نابوو پڕۆژەی شیعر. نیو سەعاتێك ڕامام و لە دڵی خۆم دا دەم ووت:

( ڕاست دەکەی هاوڕێی ئازیز.لە نامەکەت دەگەم پێویستە شیعری کوردی لە ووشەی ڕێزگرتن و دیمەنی بە ڕووالەت قەشەنگ و بە گەوهەر تەنیا بۆ چەند ساتێك سۆز جوڵێنەر.وازبێنێ).

پێویستە شیعری کوردی لەم قۆناغەیەوە بگوێزرێتەوە قۆناغی بابەت.بەڵێ دەبێ شیعری کوردی لەمەولا بابەت بێ.قووڵ بێ وەك مامۆستایەکی دڵسۆز قسە لەگەڵ خوشك و برای ژیری و سۆزدا پێکەوە بکا.

هەقە ئەو هاوکێشە بابەتییەی ( شیعرە پێویستی ) ئەم سەردەمە بدۆزینەوە. نەك وەك مەسەلەیەکی ماتماتیکی،بەڵکو وەك مەسەلەیەکی جەدەلی ژیان.

ئەو شەوە تا درەنگانێك بیرم لەو بابەتە دەکردەوە.کە نامەی هاوڕێکەم لێمی هورووژاند.

# یاداشتەکانی هاوڕێکەم
# ڕۆڵی گێڕانەوە لەبەڕۆمانکردنی یاداشتدا

سیامەند هادی

لەگەڵ خوێندنەوەی بەرهەمێکی ڕابردوودا دەبێت کاتی نووسینی ئەو بەرهەمە و هەلومەرج و ڕەوشی نووسینی ئەو سەردەمە لەبەرچاو بگرین، واتا ئەو بەرهەمە لەکەیدا نووسراوە و شێوە و تەکنیکی نووسینی ئەوکاتە لەچ ئاستێکدا بووە؟ ئەم ڕوانینەش لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەدەب بەبەردەوامی و بەپێی تێپەڕبوونی کات لەهەموو لایەنێکەوە گۆڕانکاریی بەسەردا دێت. گەلێکجار ڕەوشی سەردەم کاریگەریی بەسەر گوتارو بابەت و ڕوانین و زمانی دەقەوە بەجێدەهێڵێت، ئەوەش بەو مانایە ناکەوێتەوە کە هیچ دەقێك ناتوانێت خۆی لەو پێوەندانە قوتار بکات. سەرەڕای هەموو ئەوانەش ناکرێت ئەو ڕوانینەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا بکەینە بیانوویەك و لەخوێندنەوەی دەقەکانی ڕابردوودا خۆمان لەهەموو کەموکوڕییەك بەدوور بگرین، بەڵکو پێویستە بەپێی سەردەمی خۆی لەهەموو دەقێك بڕوانرێت. واتا ناکرێت دەقێکی کۆن بسەپێودانگ و ڕەوشی هونەریی نوێ بخوێنینەوە. ئەو جۆرە هەڵسەنگاندنانە وامانلێدەکات هەموو بەرهەمێکی ڕابردوو بەلاواز لەقەڵەم بدەین، چونکە بەپێی ئاستی ئەو بەرهەمانەی کە لەئێستادا دەنووسرێن ڕەنگە بەلاواز بکەوێتەوە.

زۆربەی ئەو دەقانەی پێش ڕاپەڕینی١٩٩١ نووسراون(بەتایبەتی چیرۆك و ڕۆمان) وەك ئەدەبێکی بەرگریی بوون و لەوکاتەشدا نەدەتوانرا بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ لەڕۆژنامە و گۆڤارەکانی حکومەتدا گوزارشت لەواقیعی ئەو سەردەمە بکرێت، هەربۆیە پەنا دەبرایە بەر ڕەمزو نووسەرانی ئەوکاتە بۆ گەیاندنی گوتاری دەقەکانیان زیاتر بابەتەکانیان لەڕێگەی چەند ڕەمزێکەوە دەخستەڕوو.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە لێدوانە لە(یاداشتەکانی هاوڕێکەم) کە ڕۆمانێکی شەهید(دڵشاد مەریوانی)یەو لەهەشتاکاندا نووسراوە، بەڵام لەساڵی١٩٩٩دا چاپکراوە. ناوەڕۆکی ڕۆمانەکە باس لەکەسێکی نووسەر دەکات کە بەشێوەی ڕێکەوت کەسێك دەبێت بەهاوڕێی و ئەویش کەسێکی خوێندەوارە و جاربەجارێك شیعریش دەنووسێت. ئەو دوو هاوڕێیە هەموو جارێك بەبێ بەرنامە و بەشێوەی ڕێکەوت و لەچەند شوێنێکی جیاوازدا یەکدی دەبینین و کەسی دووەم شیعرێکی نوێ دەدات بەهاوڕێکەی. کەسی دووەمی دەقەکە سەرقاڵی کاروباری سیاسییەو لەڕێکخراوێکی سیاسی دژ بەحکومەتدا ئیشدەکات، هەربۆیە توشی دەستگیرکردن و دەربەدەری دەبێت و پاشان لەگەڵ خێزانەکەیدا دەچێتە دەرەوەی کوردستان و ماوەیەك لەئەورووپا دەژی. دواتر دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و دەبێت بەپێشمەرگەو لەگەڵ هاوڕێیەکیدا دەکەونە کەمینی لایەنێکی دیکەی دژ بەحکومەتەوەو هەردووکیان شەهید دەکرێن.

ئەم ڕۆمانە لەدوو بەشی تاڕادەیەك لەیەکدی جیاواز پێکهاتووە، جیاواز بەو مانایە نییە کە ئەو دووبەشە لەڕووی بابەت و ناوەڕۆکەوە لەیەکدی جیاوازبن، بەڵکو پێکهاتە و شێوەی گێڕانەوەی دەقەکە جیاوازییان لەنێواندا دروستدەکات. بەشی یەکەمی دەقەکە لەسەرەتاوە دەستپێدەکات تا لاپەڕە(٨٦)، ئەم بەشە دەبێتە بنەمایەکی ڕێخۆشکەر بۆ خستنەڕووی بەشی دووەم. هەربۆیە بەشی یەکەم لەڕووی پێکهاتە و تەکنیکەوە جیاوازە لەبەشی دووەم. بەڵام بەشی دووەم کە لەلاپەڕە(٨٧-١٨٤)ی بەرهەمەکەی گرتۆتەوە، لەیاداشتی هاوڕێ شەهیدەکەی کەسی یەکەمی دەقەکە پێکهاتووە.

گوتاری ڕۆمانەکە بەشێوەیەکی گشتی گوتارێکی سیاسییە و وەك دەربڕینی پەیامێکی سیاسی گرنگی دەقەکە بەڕێوەدەچێت. لەزۆربەی شوێندا گوتارێکی سیاسی دەکاتە بابەت و لایەنە جیاوازەکانی ئەو گوتارە ڕاڤە دەکات، ئەوەش دیاردەیەکی ئاساییە و نموونەی چەند ڕۆمانێکی جیهانیی لەو شێوەیە بوونی هەیە. هەربۆیە دەتوانین بڵێین دەقەکە پێش هەموو شتێك دەقێکی سیاسییە و زیاتر لەتۆماری چەند ساڵێکی دیاریکراوی ئاشکرا دەچێت، بێگومان بەپاڵپشتی چەند لایەنێکی هونەریی و تەکنیکی لەدەرخستنی بابەتەکاندا. لەخستنەڕووی گوتاری دەقەکەدا نووسەر

پەنا ناباتە بەر ڕەمز بۆ دەربڕینی مەبەستەکانی، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەموو شتێك دەردەبڕێت. ئەوەش وا لەخوێنەر دەکات کە مامەڵەیەکی ڕاستەوخۆ و بەرجەستە لەگەڵ واقیعدا بکات و بەکۆمەڵێك شوێنکات و ڕووداوی دیاریکراو ئاوێتەبێت، ئەو شوێنکات و ڕووداوانەش پێشتر لای خوێنەر وەك واقیعێکی بەرجەستە بوونی هەبووە و پێیان ئاشنایە، بەڵام لێرەدا بەحیکایەتێکی جیاوازەوە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

سەرەتا دەکرێت ئاماژە بەوەبدەین نووسەر مامەڵەیەکی زۆر بەرجەستە لەگەڵ واقیعدا دەکات و سەرجەمی ناوی شوێن و کات و ڕووداوەکان دەهێنێت و گفتوگۆیان لەسەر دەکات. واتا هیچ شتێك وەك ڕەمز ناشارێتەوە و بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ لەشتەکان دەدوێت. وەك لەڕۆمانەکەدا هاتووە (لەتاو گەرمای ئەو مانگی نابەی شاری سلێمانی، خۆم کرد بەدۆندرمەخانەیێك دا-ل٥). یان (پایزانی شاری بەغدام لەهەرسێ وەرزەکەی تر پێ خۆشترە. دەمەو ئێوارەیەکی وەرزی پایز ڕێم تێی کەوت. لەمیوانخانەیێك بەپەلە جانتاکەم دانا. بەرەو شەقامی -ئەبونەواس- کەوتمەڕێ تا فریای بەڕێکردنی خۆر بکەوم لەئاوابوونیدا، کە عەکسەکەی بۆ دوایین جار ماڵ ئاوایی لەڕووباری -دیجلە- دەکا -ل١٤). لەهەموو شوێنەکانی دیکەشدا بەهەمانشێوە ئاماژە بەشوێنکات و ناوی شتەکان بەڕاستەخۆیی دەدات.

جگە لەناوەڕۆك دەکرێت لەچەند ڕوویەکی هونەرییەوە لەم دەقە بدوێین، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە بەتەنها لێدوانە لەشێوازی ئەو گێڕانەوەیەی کە دەقەکە لەڕۆیشتن بەرەو یاداشت دەپارێزێت و بەرەو ڕۆمان هەنگاو دەنێت. لێدوانە لەڕۆڵی ئەو گێڕانەوەیەی ئەم دەقە لەبەیاداشت بوون ڕزگار دەکات و وەك ڕۆمان دەیهێڵێتەوە.

بێگومان (گێڕانەوە) یەکێکە لەبونیادە سەرەکییەکانی دەق و بەشێوەیەکی ئیستاتیکی سەرجەمی دەقەکە بەڕێوەدەبات و لایەنە هونەرییەکانی دیکە پێکەوە گرێدەدات. وەزیفەی گێڕانەوە بەتەنها ئەوەنییە حیکایەتێکمان بۆ بەیان بکات و کۆمەڵێك ڕووداوی بەدوابیەکداهاتوو بگەیەنێتە ئێمە، بەڵکو لەپاڵ بەڕێوەبردنی بەسەرهاتی تێکست و پێکەوەگرێدانی لایەنە هونەرییەکانی دیکەدا، دەکرێت گێڕانەوە خاوەنی سیحرێك بێت بۆ پەلکێشکردنی خوێنەر بەدووی ئەو بابەتەی دەیخاتەڕوو. هەر ئەو سیحرەیە وادەکات زۆرجار ئێمە چەندین لاپەڕە بەدووی ڕووداوێکدا بڕۆین و هەست بەماندووبوونیش نەکەین.



(گێڕانەوە) لەم ڕۆمانەدا گێڕانەوەیەکی ئاسایی بەدووی یەکداهاتووە و بەهیچ شێوەیەك كرنۆلۆژیای دەقەکە تێکنەشکێنراوە، واتا ڕووداوەکان بەزنجیرەیەکی ڕێکخراوی بەدوویەکداهاتووی (کات) بەڕێوەدەچن. بەواتایەکی دی (گێڕانەوە)ی دەقەکە لەڕووی بەردەوامیی حیکایەتەوە هیچ ئاڵۆزییەك لەخۆناگرێت و بەشێوەیەکی ئاسایی و خێرا ڕووداوەکان یەك لەدوای یەك دەخرێنەڕوو. بەڵام چەند سیمایەك بە(گێڕانەوە)ی ڕۆمانەکە بەخشراوە، کە پێویستی بەڕامان و وردبوونەوەیەکی لەسەرخۆ هەیە بۆ دۆزینەوەی بونیادی سەرەکی گێڕانەوەکە.

ئەگەرچی بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ و ئاسایی ڕووداوەکان دەدرێن بەگوێی خوێنەردا، بەڵام لەبەریەککەوتنی (دەق/ خوێنەر)دا نووسەر بەهۆی سیحری گێڕانەوەیەکی ڕاستەخۆوە ئەو دوو لایەنە پێکەوە گرێدەدا و ناهێڵێت (دەق) بەرامبەر (خوێنەر) بوەستێت. واتا (دەق) دەبێت بەبەشێك لە(خوێنەر)و بەهیچ شێوەیەك خوێنەر هەست بەوەناکات لەکاتی ڕووداوەکاندا ئامادەبوونی نییە، بەڵکو سیحری ئەو گێڕانەوەیە خوێنەر بەشێوەیەك پەلکێش دەکات کە وەك چاودێرێکی ڕووداوەکان خۆی دەبینێ و دەبێت بەبەشێك لەبونیادی گێڕانەوەکە. ئەو ڕاکێشانەی خوێنەریش بەتەنها لەو بەشە کۆمیدیائامێزەی هەندێك لەڕستەکانەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو ئەو سیحرە لەجوڵەی بەردەوامی گێڕانەوەکەوە دەردەکەوێت. لەخوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا ئەگەر بەوردی لەسەر شێوەی خستنەڕووی ڕوداوەکان بوەستین، دەبینین گێڕانەوە بەهۆی جوڵەی خێرای دیمەن و ڕووداوەکانەوە مەودا نادات خوێنەر پشوویەك بدات و لەو پشویەشدا هەست بەوە بکات ڕووبەڕووی دەقێك وەستاوە. هەربۆیە (ڕاوی) دەقەکە هیچ کەشێکی لەسەرخۆ بۆ ئەندێشەی خۆی درووستناکات تا خوێنەر لەگەڵیدا بکەوێتە ئەندێشەوەو لەو ئەندێشەیەشدا خۆی لەدەرەوەی دەقەکە ببینێ، بەڵکو ئەو بەبەردەوامیی دەجوڵێت و شوێن دەگۆڕێت و کات تێدەپەڕێنێت. ئەو خێراییەش لەجوڵەی کەسێتی و گێڕانەوەدا بەدوای یەکدا ڕووداو دەخولقێنێ و کات دەگوزەرێنێ و شوێنی نوێ تاقیدەکاتەوە، ئیدی خوێنەر دەکەوێتە سەر هێڵێکی خێرای لەڕۆیشتن نەگۆڕدا و بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت خۆی لەو هێڵە قوتاربکات. چونکە قوتاربوونی خوێنەر لەو هێڵە بەتەواوی بەمانای پچڕاندنی لەدەقەکە دەکەوێتەوە.

بەشی دووەمی ڕۆمانەکە یاداشتی کەسی دووەمە و ڕاوی بەشی یەکەمی دەقەکە هیچ ڕۆڵێك لەو بەشەدا نابینێت. واتا ئەو بەشە حیکایەتی هەڵهاتنی هاوڕێی ڕاوی دەقەکەیە لەگەڵ خێزانەکەیدا، کە چۆن لەوڵات دەردەچێت و چەند وڵاتێك دەبڕێت و دوای ماوەیەك ژیان لەئەورەپا دەگەڕێتەوە بۆ وڵات و دەبێت بەپێشمەرگە و پاشان شەهید دەکرێت. ڕاستە ئەم یاداشتە بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەخرێتەڕوو، بەڵام پەیوەندییەکی پتەوی بەبەشی یەکەمەوە هەیە. چونکە بەشی دووەم بەشێك لەژیانی کەسی دووەمی دەقەکەیە و ئەو بەشەش گۆڕانکارییەك بەسەر مەبەستی ڕۆمانەکەدا دێنێت و کەسی دووەم دەکاتە کەسی سەرەکی دەقەکە و ناوەڕۆك و مەبەستی ڕۆمانەکە لەدەوری ئەو دەسوڕێنێتەوە. سەرەڕای ئەوەش ئەو یاداشتە بەشێکی ونبووی بەسەرهاتی ژیانی کەسێکی بەشی یەکەمە و ئەو بەشەش بەبێ یاداشتەکە لاسەنگ دەبێت.

ئەگەرچی یاداشتەکە مێژوویەکی دیاریکراوی نێو بەشی یەکەمە، بەڵام لەهیچ شوێنێکدا هەست بەدووبارەبوونەوەی ڕووداوەکان ناکرێت و هەموو ڕووداوەکان دیمەنە شاراوەو نەزانراوەکانی پشت بەشی یەکەمن. ئەگەر بەوردی لەو دوو بەشەی ڕۆمانەکە بڕوانین، بەتەواوی هەست بەجیاوازی گێڕانەوەی ئەو دوو بەشە دەکەین. ڕووداوەکانی بەشی یەکەم لەنێو وڵاتدا ڕوودەدەن و ڕووداوەکانی بەشی دووەم لەدەرەوەی وڵات. ئەوەش بەشێوەیەك لەشێوەکان ئیشکردنە بەدوانەی (ئێرە/ ئەوێ). تەماشا دەکەین ڕووداوەکانی ئەوێ لەگێڕانەوەدا زۆر سارد بەڕێوەدەچن وەك ساردی ژیان لەوێ. لەبەرامبەر ئەوەدا ڕووداوەکانی ئێرە گەرموگوڕییەکیان تێدایە. لەڕووی (زمان)و خستنەڕووی (شوێنکات)و وێنەو دیمەنەکانەوە جیاوازی هەیە لەنێوان ئێرەو ئەوێدا. لەبەشی یەکەمدا بایەخێکی تایبەتی بەدیاریکردنی کات و شوێنی ڕووداوەکان دەدرێت و لەسەرەوەی هەموو بەشێکدا کاتەکە دیاریکراوە، بەڵام لەبەشی دووەمدا تەنها کاتەکان تا ئەودەمە دیاریکراون کە کەسی دووەم لەوڵات دەچێتە دەرەوە، ئیدی دوای ئەوە پڕ دەبێت لەحیسابی پارە و ئاماژە بەساڵ نادرێت. لێرە جوڵەو کردارێکی زۆر هەست پێدەکرێت، بەڵام لەوێ زیاتر قسەکردنی تێدایە، ئەوەش لەتەنهایی و نامۆییەوە سەرچاوە دەگرێت.

مامەڵەکردنی نووسەر لەگەڵ کەسێتیدا زۆر مامەڵەیەکی ئاساییەو کەسێتییەکان بەشێوەیەکی دوور لەئاڵۆزی خراونەتەڕوو. نە وەسفیان دەکرێت و نەڕابردوویان دەزانرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر تێبینی بکەین دەبینین شێوە مامەڵەیەکی هونەریی لەبەرامبەر خوێنەردا لەگەڵ کەسێتییەکاندا کراوە. بەپلەی یەکەم دوو کەسێتی ڕۆڵی سەرەکی دەقەکە دەگێڕن، ئەویش دوو هاوڕێن. لەسەرەتادا خوێنەر وا هەستدەکات کەسی یەکەم و ڕاوی دەقەکە مەبەستی سەرەکییەو هەموو ڕووداوەکان بەدەوری ئەودا دەسوڕێنەوە، بەڵام دواتر دەبینین بەهۆی یاداشتەکانەوە کەسی دووەم دەبێتە جێگەی مەبەست و هەڵسوڕێنەری گرێچنی سەرەکی ڕۆمانەکە. کەسی یەکەم ڕۆڵی ڕێخۆشکەرێك دەبینێ و دەروازەی حیکایەتێك بەڕووی ژیانی کەسی دووەمدا دەکاتەوە. بەو شێوەیەی گوتاری دەقەکە بەهۆی کەسی دووەمەوە دەخرێتەڕوو. لەوێدا کەسی یەکەم لەڕووی

هونەرییـەوە رۆڵـی قوربانییـەك وەردەگرێـت، لـەپێناو دەركـەوتنی كەسێكی دیدا كە كەسی دووەمە. گرنگیدان بەژیانی كەسی دووەم وادەكات ژیانی كەسی یەكەم بكەوێتە پەراوێزەوە. چونكە روانینی نووسەر دەتوانرێت لەڕێگەی كەسی دووەمەوە ئاشكرا بكرێت.

ئەو دوو كەسێتییە دوو كەسی جیـاوازن و لەدەقەكـەدا بـەهۆی چـەند دەلالەتێكـەوە ئامـاژە بـەو جیاوازیانـە دراوە كـە ئـەو دوو كەسـێتییە لەیەكـدی جیادەكاتـەوە. بەمانایـەكی دی خوێنـەر وا هەسـتدەكات كەسی یەكـەم كـە رۆڵـی راوی دەبـینێ لەسـەرەتای دەقەكەدا هەڵگری گوتاری دەقەكەیە و نووسـەر دەیـەوێت مەبەستی بابـەتی دەقەكـە لەڕێگـەی ئـەوەوە بخاتـە بـەردەم خوێنـەران، بـەڵام نووسـەر لەگـەڵ بەرێوەچوونی رۆمانەكـەدا وردەوردە رۆڵـی كەسـی یەكـەم كاڵدەكاتـەوە و دەیكاتـە پردێك بـۆ پەرینـەوەی روانینـەكانی خۆی. هەربۆیە كەسی یەكەم لەكۆتایی بەشی یەكەمدا ئەوەندە لاواز دەبێـت توانـای ئەوەشـی نامێنێـت گوزارشـت لەشـەهیدبوونی هاوڕێكـەی بكـات. ئـەوەش بـەوە پاسـاو دەداتـەوە كـە یاداشـتەكانی وەك خـۆی بخاتـەڕوو. ئـەوەتا لـەكۆتایی بەشـی یەكەمـدا دەڵێـت (كۆسـتەكە زۆر گـران بـوو. دەسـەڵاتی باسـكردن و وەسـف كـردنیم نییـە. دەفتـەرێك لەسـەر تەپڵەكەكـە دانرابـوو دەسـتم بـۆ بـرد. هاوسـەرەكەم وتـی: ئـەو بـۆی دانـای. تـۆ زۆر پەرێـشان بـووی. بـێ قەزابی پیاو چۆن دەبێ وابێ! خۆ بەشی دووجاری تری واناكەی. بـەرگی دەفتەرەكـەم هەڵدایـەوە لێـی نووسـرابوو: یاداشـتەكانم لـەدەرەوەی كوردسـتان-ل٨٦). ئیـدی لێـرەوە بەشـی دووەمـی رۆمانەكـە دەسـتپێدەكات، كـە لەیاداشـتەكانی هـاوڕێ شـەهیدەكەی راوی دەقەكە پێكهاتووە.

ئەگـەر بەتـەنها لەبەشـی دووەم بـڕوانین، ئـەوا دەقەكـەمان بەیاداشـتی كەسێك دێتـە بەرچاوو ناكرێـت وەك رۆمانێك مامەڵـەی لەگەڵـدا بكـەین. بەشـی یەكـەمیش لەحیكایـەتی یەكـدیبینینی بەرێكـەوتنی دوو كـەس پێكهـاتووە، بـەڵام ئـەوەی رێگـە لەبەیاداشتبوونی سەرجەمی دەقەكە دەگرێت، درووستكردنی شێوە پەیوەندییەكی ئۆرگانییە لەنێوان ئەو دوو بەشەدا. نووسەر لەبەشی یەكەمدا چەند بۆشاییەك دەخوڵقێنێ كە رەنگە خوێنـەری ئاسایی بەتـەواوی هەست بەو بۆشاییانە نەكات. ئەو بۆشـاییانەش بەشی یەكەم بەتەواونەكراوی بەجێدەهێڵن و لەخوێندنـەوەی ئـەو بەشـەدا لایـەنێكی زۆر سـەرەكی ژیـانی كەسـی دووەم بەشـاراوەیی و هەڵواسـراوی دەمێنێتـەوە. هەربۆیـە سـەرجەمی بەشـی دووەم هەوڵدانـە بـۆ پڕكردنـەوەی بۆشاییەكان و ئاشكراكردنی ئـەو بەشـە ونبووەی ژیانی كەسی دووەم، كە لەبەشی یەكەمدا بەهەڵواسراویی بـەجێهێڵراوە. ئاوێتـە بـوونی ئـەو دوو بەشـەش بونیـادی سـەرەكی دەقەكە پێكەوە گرێدەداو لـەبوون بەیاداشت قوتـاری دەكـات. ئەو كارەش بەپاڵپشتی چەند لایەنێكی هونەریی دەقەكە دەكات بـەرۆمان و لەیاداشت دووری دەخاتـەوە. ئـەوەش بـەو مانایـە ناكەوێتـەوە كـە یاداشت شـێوە نووسـینێكی لاوەكییـەو بەكـەمتر تەماشـا دەكرێت، بـەڵكو لێـرەدا تـەنها مەبەسـت لـەبوون بـەرۆمانی دەقەكەیـە، چـونكە شـێوە تێكـەڵبوونێك لـەنێوان رۆمـان و یاداشـدا هەسـتپێدەكرێت لـەم دەقـەدا و رەنگـە هەنـدێك كـەس وەك یاداشـت تەماشـای ئـەم دەقـە بكـات. چـونكە گـەلێك یاداشـت هەیـە لەچـەند رووەیەكـەوە لـەڕۆمان نزیكدەبنـەوە. سـەرەڕای ئـەو رۆڵـەش بەشـی دووەمـی ئـەم رۆمانـە رێخۆشـكەرە بـۆ دەركـەوتنی زیـاتری كەسـی دووەم و وایلێـدەكات ببێتە كەسی سەرەكی دەقەكە و هەڵگری گوتاری رۆمانەكە.



# یاداشتەكانی هاوڕێكەم

دڵشـاد مـەریوانی

جگە لەهەموو ئەوانەش لەم رۆمانـەدا نووسـەر دەروازەی گفتوگۆ لەسـەر چـەند بابـەتێكی ئـەدەبی و مێـژووی و سیاسـی دەكاتـەوە و روانینی خۆی دەربارەیـان دەردەبڕێت، كە ئەوانـەش وەك نـاوەڕۆكی دەقەكە جێگـەی لێدوان و قسە لەسـەركردنن. هـەروەها كاتێك كەسی دووەمـی رۆمانەكـە دەڕوات بـۆ ئـەورووپا لەیاداشـتەكانیدا بـەوردی باسی ئەو شوێنانە دەكات كە پێیدا تێدەپەڕێت. لەگەڵ ئاماژەدان بەبواری كۆمەڵایـەتی و سیاسی چـەند وڵاتێكی ئەورووپا. واتا هـەر لەخۆیـەوە باسـی چوونـە ئـەورووپا ناكـات. ئەوانـە هـەمووی جێگـەی لەسەر وەستانن، بەڵام ئێمە لێرەدا زیاتر لەسـەر هونـەری گێڕانـەوەی دەقەكە وەستاین كە چۆن بەشێوەیەكی هونـەریی بونیـادی دەقەكـەی لەبوون بەیاداشت قوتاركردووە و كردوێتی بەڕۆمان.

*یاداشتەكانی هاوڕێكەم-رۆمـان-نووسـینی: دڵشـاد مـەریوانی، چاپەمەنی زاموا، چاپی یەكەم_١٩٩٩.

بەشێك لە دەستنوسێکی بڵاونەکراوەی دڵشاد مەریوانی

# عەلی بەردەشانی

# بەیتی کیسەڵ

لە ووتاری یەکەم و دووەم دا باسی چۆنێتی دەستکەوتنی ئەم بەیتانەم کرد. بۆیە لەم ووتاری سێیەمەدا پێویستمان بە دووپات کردنەوەی نیيە.

هەروەها باسی کۆلێکتەران و چۆنێتی نەوارەکان و ناوو شوێنی گوێندەکانمان کردووە. لەگەڵ مێژووی تۆمارکردنیشیان.

بۆنەی بەیتەکە:

گۆیینـدە دەربـارەی بەیتەکـە هـیچ نالـێ. دیـارە ووتنـی نـاوێ چونکە عەلی بەردەشانی لەم بەزمانەی زۆرە- وەك لێی دەگێڕنەوە- لــە ووتــاری یەکــەمیش دا ئیــشارەتی شــەڕە شــیعری خــۆیی و (قوڵەشین)مـان کـرد کـە شایەری جنۆکانە. بەردەشـانی ئـەم بـەیتی بەزمانەی هەڵبەستووە لەبەر چەند هۆیەك ئەوەی ئێمەی پەی پێ بەرین.

یەکــەم: بــەزم و پێکــەنین و سەرســوڕمان دروســتکردن لای کۆمەڵانی خەڵك. کە ئەم کارە کاری شایەرەو هیوای دڵخۆشکردنی کۆمەڵانی خەڵك و گۆڵمەز نانەوەیە.

دووەم: هونەر نواندنی خۆی لە ڕووی دەرخستنی فراوانی خەیاڵی و دەسەڵاتی بەسەر هونەری شیعریدا.

ســێیەم: دەشــێ لــە هەنــدێکیان دا مەبەســتی هــەبووبێ و ویستبێتی ناڕاستەوخۆ مـەرامێکی خـۆی دەربـڕێ یـان لـە کەسـێك بخوێنێ کە ئەم ڕەخنەی لە ڕەفتارو هەڵوێستی ئەو هـەبووبێ، بەڵام لەبــەر چــەند هــۆیێکی بابەتییانـەی کـاتی خـۆی، نەیویـستبێ ڕاستەوخۆ ئەو ڕەخنەیەی خۆی ئاڕاستەبکا، یان ڕەق و تەق زەمی بکا.

چوارەم: دیسان دەشێ هەندێك لەم جۆرە بەیتانەی بە مەبەستی ئـەوە هەڵبەسـتبێ کـە ناڕاسـتەوخۆ ئامۆژگـاری یـان ڕێ نمـایی کەسێکی پێ بکا تا ووریای بکاتەوە لە ڕاست و دروستی واقیعێك. یان ئاست و پلەی کێشەیێك کە پێویستی بە شیکردنەوە هەبووبێ و ئەم ڕای خۆی تیادا دەربڕیبێ، بەڵام بە هێماو ناڕاستەوخۆ.

پێنجـەم: دەشـێ هەنـدێك لـەم بەیتانـەی لەسـەر ژیـانی خـۆیی و هەڵوێستیو ئەو کێشەو مل ملانێیانەبێ کە عەلی بەردەشانی خۆی هەی بووە، لەو سەردەمەدا لەگەڵ کۆمـەڵ یـان کەسـانی دەوروبـەری وەلێ نەیویـستووە ڕاسـتەوخۆ بەخۆیـدا هەڵـدا، چونکە لـە کۆمـەڵی کوردەواریدا ئێستاش مـەتح و ستایشی خۆکردن بەکارێکی دزێوو ناشایـستە دراوەتـەوە قەڵـەم. پەنـدو قـسەی نەسـتەق و حەکایـەتی گوێ ئاگردانمان زۆرن لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا کە ڕاستی ئەو دابە دەردەخەن و بە کارێکی نابەجێی دادەنێن.

لەســەرێکی تریــشەوە عــەلی بەردەشــانی کــە غــەریانی خــۆی شوبهاندووە بە زیندەوەری تری وەك کیسەڵ، دەشێ مەبەستی خۆ بەزل زانین و پلەو ئاست بـەرزی خـۆی بێ، لەچاو ئاست و پلـەی غەریمەکانیدا -لەمەشدا هەقی بووە- بۆیە خۆی بە مرۆڤ و ئەوانی بە زیندەوەر داوەتە قەڵەم.

ڕاییك دەربارەی بۆنەی بەیتی کیسەڵ:

به بڕوای من بەیتی کیسەڵی بۆ کابرایێك نووسیوە، ئەو کابرایە زۆر کەللە ڕەق و بێ ئەقڵ بووە، بۆیە شوبهاندوویەتی بە کیسەڵی ڕەق و تەق هەمیشە نەش و نما نەکردووی خۆ هێشتووەوەلە قاڵبێکی نەگۆڕو سستدا، دەشێ ئەو کابرایە برایێکی هەبووبێ و لەسەری هەڵی دابێتێ بەیتەکە باسی ناوچەی دۆڵی (دۆڵە ڕووت) دەکا. لەناوەکەیەوە ئاشکرایە کە ڕووتەن و کەم ئاوە. گوندانی مالوومە، چاڵاوا، قۆمەرغان، مەولان، سێدەر، شارستێن... تاد، کە هەموو سەر بە ناوچەی دۆڵێ-ن تا ئێستاش گەواهی ئەو کەم ئاوییە دەدەن و کێشەی ئاوو جۆگە بەردەوامە. بۆیە دەشێ عەلی بەردەشانی کشتێکی کردبێ و لەسەر ئاوکردنە سەری و ئاودانی لەگەڵ ئەو کابرایەدا لێیان بووبێتە هەرا. لەهەراکەشدا کابرا ویستبێتی بە واسیتەو پەنا بردنە بەر ئەم و ئەو... هەق بدا بەخۆی و عەلی بێبەش بکا. بەڵام کێ دەرەقەتی عەلی بەردەشانیی شایەری خۆشەویستی میللەت و ئەورەحمان پاشای بەبە دێ؟

کابرا دەبوو بزانێ لەو شەڕەیدا دەیدۆڕێنێ و دەرەقەتی عەلی نایە. هەر بۆیەش عەلی پێی دەڵێ: (حەقمەق-نەحمەق) و شوبهاندوویەتی بە کیسەڵ. دەبوو کابرا بیزانیبا کە کەسێك تفەنگی (مەجاری لوولە تەنگ)ی پێ بێ، مانای ئەوەیە دیاری پاشایەو پاشای بەبە بەدەستی خۆی کردوویەتییە شانی، ئیتر کێ لە هەقی دێ؟! بە تایبەت لەو سەردەمەدا نەك تفەنگ بەڵکە کەم کەس ساچمە زەنیشی هەبووە چ جای (تفەنگی مەجاری لوولەتەنگ)! واتە مەجەڕی-هنگاریای ئێستا. لوولە تەنگیش مانای ئەوەیە فیشەکی خواردووە نەك ساچمەو بارووت! عەلی بەردەشانی یەکجار بەوە دڵتەنگ بووە کە کابرا هێندە کەللە ڕەق و بێ ئەقڵ بوو هیچ ئیعتبارێکی بۆ چەکەکەی شانی نەکردووە.

ئەوەتا ئەم دێڕانەی ئەو دڵتەنگییەی پێوە دیارە:

کیسەڵ کوڕێکی حەقمەقە
شەڕێشم لەگەڵ دەکا
مەتحێ چەکانم ناکا!!

هەربۆیەکە عەلی ئەو بەزمەی بەسەر دێنێ کە لە بەیتەکەدا خۆی باسی دەکا.

هەر ئەو ڕایەشمان کورتەی باسی بەیتەکەیە، بۆیە دێینە لای تێکستەکە خۆی بابزانین گۆیندە چی دەفەرموێ.

بڕوانە عەلی بەردەشانی ل٧٦ محمد توفیق ووردی

## بەیتی کیسەڵ

ئای... خالق هەرئەتۆی بۆخۆ
زەوییێکم هەبوو لە دۆڵێ
کردم بە ماش و پەمبۆ
چووم ئاوی لێ نێم بۆخۆ
کیسەڵ لێی گرتبووم جۆ
دەم گوت کیسەڵ لێرە بڕۆ
ئێرە نییە مەکانی تۆ
خۆلاسە لێمان بووە شەڕ
تاووم دایە دەستەو خەنجەر
خەنجەرێکم دا لەسەر
نەی دەبڕی وەک ئارووی تەڕ
کیسەڵ ئاورێکی وادا
تەمای بوو لاقیم بادا
تەمای بوو ڕانیم ڕانێ
وەک مالۆسێ لەلانێ
کیسەڵ لێم چووە نشێلانێ
پرسیم کیسەڵ لەکوێیە؟
لەبانێ خڕکە ڕێیە
لەوێش دەکا شەڕێیە
دەبا بۆی وەدەرکەوین
هەمووی شان و مل قەوین
هەمووی دەکەڵە کەڵە
شاخی سەربەقۆو بەدراوە
ئەو عالەمەی هەڵناوە
بە کەندی هەڵی گێڕاوە
کیسەڵ بەخۆو بەبراوە
پەمبۆی لەمن تێکداوە
بەشێ کراسم نەماوە
بانگم دەکرد چەلەنگێ
دەبۆم بێنە تفەنگێ
مەجارێ لوولە تەنگێ
کیسەڵ دی ڕەنانە... گوێ[*]

[*] لێرەدا لە گوێیندە حاڵی نەبوم ئایا:

١-ڕەنانەگوێ: گوێ دەزرنگێتەوە لەبەر شریخەی تفەنگەکە.

کیسەڵ کوڕێکی حەقمەقە
شەڕێشم لەگەڵ دەکا
مەتحێ چەکانم ناکا
دەبڵێن بە کاک خدری
ڕێیەکە ئەولان بگری
نەیەڵن کیسەڵ هەڵبری
کیسەڵ گەیییە دەرگی ئاشی
لەوێ گەیییە کاک ڕەشی
وەگای نا وەک باراشی

لەوێ ڕاتێپەڕی بوو
جۆ تێرێکی بەوەی بوو
سێ جرتێکی لێ بەربوو
سێ سەعاتان لەهۆش چوو
سێدەرکی سار، گەیییە بەردەسووران
کەویاتی دەچوو بۆ تووران

سەرنج لەسەر بەیتەکان بە گوێرەی ژمارەیان:

٤-کیسەڵ جۆگاکەی لێ گرتبووم و نەی دەهێشت ئاوی ماش و پەمووەکەم بدەم، دیارە ئەو سەردەمە لە دۆڵە پووت باوی پەموواندە بەرهەمهێنان بووە.

١٢-تەمای بوو پاشقولم لێ بگرێ. ئەی بە مانای لە پشتەوە زەفەرم پێ بهێنێ و نامەردانە شەڕەکە بکا. ئەی بە مانای لە پشتەوە کاریکاو بە هانا بردنە بەر ئەم و ئەو بەسەر عەلیدا زاڵ ببێ.

١٧-بەرزایی خڕکە ڕێی لێ گرتووم. دیارە (خڕکەڕێ) ناوی جێیێک بووە لە دۆڵێ.

٢٢-*دەشێ (شاخی سەربەخۆ) بێ بە کردنی خ- بە - ق یان هەر جیاییێک لەو ناوە وای ناوبێ.
*بەدراوە- بەدر ئاوا- دەشێ هەر شوێنێک یان چەند ماڵێک بێ، وایان پێ ووتبێ.

٢٨-ئەم (چەلەنگێ)یە لەم دێڕەدا دەمانخاتە بەردەم سێ پرسیار:

١-ئایا ژنی عەلی ناوی (چەلەنگێ) بووە؟ بەو حسابەی ئەو (ێ) کراوەیە بۆ ژن بەکاردێ لەکاتی بانگ کردن دا و ژنیش هەبوون ناویان (چەلەنگێ) بووە.

٢-ئایا هەر بەمانا زمانیەکە بۆ مەتح عەلی بەکاری هێناوە؟ وەک ئەوەی بڵێ: ئادەی کوڕی ئازا ئەو تفەنگەم بدەیێ.

٣-ئایا برادەرێکی نزیکی عەلی. یان براێکی لەخۆی گچکە تری ناوی (چەلەنگێ) بووەو داوای لێ کردووە تاوبداتە تفەنگەکەیی و بیداتێ؟

٣٠-مەجاری لوولە تەنگێ: تفەنگی مەجەڕی- ئەڵمانی لوولە تەنگ. چونکە مێژوو ئەوەمان بۆ دەور دەکاتەوە کە تفەنگی ئەڵمانی یەک فیشەک خۆر لەو سەردەمەدا لە کوردستان هەبووە.

٣٨-دەرگی عەشی: ئەمیش دەشێ ناوی جێیێک بووبێ.

٤٠-دیارە چۆن جافانی کۆچەر گایان بارکردووە بۆ گوستنەوەی شمەک، هەروەهاش لەو سەردەمەدا باراشیان بە پشتی گا بردووە بۆ ئاش. بۆیە دەڵێ کاک ڕەشی کیسەڵی گرت و وەک باراشی خستیە سەرپشتی گاێێک و توند شەتەکی داو بەستی بە پشتیەوە.

٤٢-جۆ: جۆگا
تێر: قووڵ. چونکە ئاوەکەی مەیلەو سەوز دەنوێنێ.
بەوەی: ترسناک. زەحمەت بۆ پەڕینەوە واتە، کیسەڵ بە پشتی گاوە گەیشتە جۆگەییێکی قووڵی نارەحەت. بێ گومان بازی بەسەردا دەداو دەپەڕێتەوە.. (بڕوانە دێڕی دوای ئەم)

٤٣-کە گا بەباری کیسەڵەوە بازیدا.. کیسەڵ باییێکی بەهێزی لەترس دا لێ بەربووەوە. دیارە ئەمە قەشمەری کردنی عەلیە بە کابرا کیسەڵ کە لەگەڵ کەللە ڕەقیەکەشدا ترسنۆک بووە.
(بڕوانە دێڕی دوای ئەم)

٤٤-کابرا کیسەڵ لە ترسێدا، سەرە ڕای بایەکە سێ سەعاتیش لە هۆش خۆی چووە.

٤٥-
*دەشێ بە (سێدەر)ی ئێستایان ووتبێ (سێدەرکی سار- سێدەری سارد).
*بەردە سووران: ناوی جێیەک بووە.

٤٦-کەویاتی: زەردباوی ڕەنگی لەترسان.
واتە لە ترسنۆکیدا ڕەنگ زەردی و باسی ترسنۆکی مام کیسەڵ دەگەیشتە تووران (تورکیا).

---

٢-ڕەنان ئەنگوێ: ڕەنان- نازانم چیە، بەڵام، ئەنگوێ: ئەنگاوتن: لێدان بە فیشەک وتیرە. بەڵام زیاتر خاڵی یەکەم دەیگرێتەوە ئیتر نازانم گەر ڕای تر هەبن.

# تایبەتمەندێتی ئەدەبی.. (دڵشاد مەریوانی) شەهید

ڕەئوف حەسەن

بۆ یەکەمینجار لە یادەوەریی ساڵڕۆژی شەهیدکردنی (دڵشاد مەریوانی)دا.. لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی شەهیددا.. لە بەهاری ١٩٩٢ دا لە سلێمانی بۆمان سازکرد.. خوێندرایەوە.

ڕەئوف حەسەن



ڕۆژی شەممە ٦ ی کانون- ١٩٧٢/ ئەندامانی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی

ڕیزی دواوە، لەڕاستەوە: ڕەئوف حەسەن- احمد سالار- حەمە ڕەشید هەرەس- دڵشاد مەریوانی

ڕیزی پێشەوە: لەڕاستەوە: مستەفا ئەحمەد -کەمال سابیر- تەها باراوی

ئەمەش کارێکی سانا نییە.. ئەدیبو هونەرمەندی داهێنەرو ڕۆشنبیرو لێهاتوو خاوەن جورئەتی گەرەکە.. جورئەتو تەحەددا لە دەربڕینو وێنەگرتنی تابلۆو بۆچوونی نەبینراوو نەزانراودا.. ڕەفزی وشەو دەستەواژەو قۆکابولەرییە سواوو مێردەزمە ئاساکانی

با لەمەش زێتر پشتگوێ خرێت.. با ترسنۆکانە لە پەناو پەستێودا هەزاران تۆمەتت وەپاڵخەن.. پێویستت بەوە نیەو نەبووە لایەنێك.. دامودەزگەییێك لەنێو شەهیدەکانیدا ڕیزتبکات.. گەورەیی شەهید لەوەدایە لە حزبێکدا لە قاڵب نەدرێت.. ئەوە ئاواتو خواستی خۆتبوو.

دڵشاد مەریوانی دژی هەموو قاڵبو قەفەزو دەروازە داخراوەکانبوو. چ بەقەڵەمو چ بەزارو چ بەشێوازی ژیان.. بەرگەی جەهالەتو پاشڤەڕۆیی نەدەگرتو هەرگیز لەتەکیاندا نەسازاوە.. قەڵەمو ژیانی بریتی بوو لە جاڕنامەییێکی ئاودامان پرۆتستۆ.. ناڕەزایی.. ڕەتدەکردنەوە.. بەگژاچوون.. بۆیێ دەکرێت بەرهەمەکانی بەئاسانی لە زۆربەی بەرهەمی نووسەرانی دی جیا بکرێنەوە.

تایبەتمەندێتی لە ئەدەبو هونەرداو لە گشت جۆرەکانی دیکەی تێکستدا پێناسەیێکی دیاریکراوو نەگۆڕی نییە.. هێندەی لای خۆمەوە پێیبزانمو درکم پێیکردبێت.. جۆرێکە لە شێوازی دەربڕینو ستێتیکاو وێنەگرتنو وێناکردنی بیرو بۆچوونەکان لە بۆتەییێکی نائاساییداو.. بەرجەستەکردنیان تا ڕادەی ئیستیفزازکردنی زەوقو بیرو لێکدانەوە داسەپاوو باوەکان.. تا ڕادەی جێ پێلێژکردنی پێشینە چەقبەستوکان.. یاخود هەر لە بنەڕەتەوە هەڵیان تەکێنێتو.. بەبیرو شێوازی جوداو سەردەمانە جێیان بگرێتەوە.

نێو فیکرو ئەندێشەی کەلەپووری تەنانەت کولتوری نەتەوایەتیشمان.

پێموایە هەر ئەم ئەرکە یاخود ئەمجۆرە دەسپێکانە لە بونیادی نەتەوەدا دەبنە مایەی وەرچەرخانە مێژوییێکان.. جۆرە دابڕانێك دەدەنە چەمکەکان‌و چەمکی نوێ‌و نائاسایی دێننە بەرهەم.. ئەمەیش کەمتازۆر لە هزری نەتەوەدا ڕەنگدەداتەوە.

بەنیسبەت ئەدەبی دلشاد مەریوانییەوە.. دوو شێوازی جوێی بۆ ئەم مەبەستە پێرەوکردووە.. شێوازی هێجگار ناسك‌و نازدارو لیپاولیپی خۆشەویستی‌و ئەڤین.. بەپێچەوانەیشەوە شێوازە جیرە مامناوەندە سازشکارانەکە سەرجەم تایبەتمەندییەکانی لەدەستدەدات‌و دەچێتە خانەی گوتاری رامیاری‌و فەلسەفی ئاسایی رووتەوە..

دلشاد مەریوانی هەر لە زووەوە پەیی بەم نهێنی پیشەیە کردووەو.. یێکێکە لەو ئەدیبە دانیسقەو دەگمەنانەی کە بەهەردوو شێوازەکە جێگەی تایبەتمەندی خۆی گرتووەو.. بەتواناو وزەو مەعریفەییێکی لەبن نەهاتووەوە هاتە مەیدانەکەو.. مامەڵەییێکی سەرنجراکێشی ئەوتۆی لەگەڵ بیروبۆچوونە ژەنگاوی‌و بێمروەتەکانی پێشوودا کردووە.. خوێنەر بەناچاری لەبەردەم تەعبیرەکانیدا رابمێنێت‌و.. بکەوێتە جیهانێکی نوێی شارستانییێوەو.. جارێکی دی باڵ بەخەیاڵە پەرو باڵکراوەکانی بگرێتەوە.. ئەمە.. سەرەڕای بەکارهێنانی جورئەتە ئەدەبی‌و تەحەدداکردنە پڕ جۆش‌و خرۆش‌و زیندوێتێکە.. سیحری قەناعەتپێکردنیشی لە دووتوێدایە.

بروانن لە کام گۆشەی ناسك‌و نازدارەوە تابلۆی تایبەتمەندانەمان بۆ دەنەخشێنێت.. لە چیرۆکی (بەرمەدەن خنکام)دا دەڵێت: لەم شارەدا

(کتێب دەکرن بۆئەوەی پەپولەی تێدا وشکبکەن ٨٥-١)

وشەکان وەك باڵی ڕەنگاو ڕەنگی پەپوولە زوڵاڵن.. وەڵێ هاوکێشەییێکی بەئازارو دژوارە.. ئازارەکە لای نووسەر ئاشکراترو گەورەتری دەبێت:

(تۆ بڵێی لە شارێکدا کە پەپوولەی تێدا وشکدەکرێت.. ئاسمان باران ببارێنێ؟! زەوی شینبێ‌و دار بەربدا؟! تۆ بڵێی گیا ئاوڕنگ بگرێت‌و سی خوێن پاکبکاتەوەو لێو زەردەخەنەی بچێتە سەر؟!٨٥-١)

لە کوێوە دەمانهێنێت بۆ کوێ؟! چیرۆکەکە سەبارەت بە شێتێکی شاری سلێمانییەو.. دەمانبیست دەیوت (بەرمەدەن خنکام).. بەڵام وەك (دلە) نەماندەزانی:

(ئەوەندە ناسکبوو.. باڵەکانیشی وەکو سنگی سییان تێدابوو هەناسەی پێدەدان.. بۆیێ کە باڵیان دەگرت.. دەیووت: بەرمەدەن خنکام..٥٨-١)

لەو جیهانە پڕ لە وشەی (کتێب) و (پەپوولە) و (سنگ) و (شینایی) و (ئاوڕنگ) و (زەردەخەنە)و.. هتدا.. بێزارییێکی ئەوتۆ دەردەبڕێت لەوەدەچێت دەستیان نابێتە بینی نووسەر خۆی‌و هاوار بکات (بەرمدە خنکام).. بگرە لەمەش زێتر گومان لە سروشت دەکات بتوانێت لەم شوێنانەدا کاری ڕەنگینی خۆی بکات‌و.. ئەمە بەجۆرێك لە بێمروەتی‌و نەمانی پرەنسیپەکانی قیەم‌و ڕەوشت دادەنێت‌و سەرەتای ئاڵۆزی‌و شیرازەتێکچوونی ژیانە.

لە چیرۆکی (ماسی..تەور..فیوز)دا.. هەمان مەبەست بە تەعبیری زبرو تیژتر وێنەدەگرێت:

(-ماسی زۆر بێوەیە.. کەچی بروانن بەزیندوویی چۆن بەتەور ئەیتلێشێننەوە.. ئەم گێتییە پڕ تەورە.. ئەزانی ئەم تەورە چەند شتی قەباحەتی کردووە؟!.. مێشکی پژاندووە.. ئێسکی شکاندووە.. خوێنی رژاندووە.. نەك ئاو.. ئەم گێتییە پڕ گورگ‌و تەورە.. گێتی ماسی بێوەی نییە١-٣٤)

لە چیرۆکی (تەرمی عەول)دا.. چیرۆکنووس سەرسامە لەوەی. ئەم هەموو کەللەسەرو مێشك‌و دڵانەی ناو ئەم دنیا بەرینە ١-١١) تۆ بڵێی ئیشیان چی بێت‌و بۆچی بیر لە سادەترین شتی ئینسانیانە ناکەنەوە؟! تا.. لە چیرۆکی (دانهێڵ‌و شتنی تریش)دا.. بەشێوە ناسك‌و هۆشمەندانەکەی دەستدەکاتە ئیستیفزازکردن‌و دەڵێت:

(خۆکێشانێك بەپێنج فلسە.. گۆشت‌و ئێسك‌و خوێنم دەکێشم. بەس ئەوەندە.. تا ئێستا زانست ئەوەندەی لەدەست هاتووە.. دەبێ لەمەولا ئالەتە کێشەرەکان واز لە گۆشت‌و ئێسك‌و خوێن بهێنن‌و.. وایان لێبکرێت - هەست‌و خەون‌و خۆزگەکانی مرۆڤ‌و زۆر شتی تری وا بکێشن ٢٥-١)

لێرەدا وەك بیرمەندێك‌و مرۆڤ ویستێك نرخی مرۆڤ لە بۆدییەکەیدا نابێت‌و شتە گیانییەکان دەکاتە پێوانەی نرخی مرۆڤ.. بروانە ئەم بەراوردە تایبەتمەندە:

(نیو ئادەمیزاد هەیە.. چارەك هەیەو.. شتی تریش هەیە.. کەچی (نیو پیاڵە) چای حیز نییە ٢٥-١)

لە ڕۆمانی (شەهید خەسرەو)دا.. هێشتا دەستخەتە.. بەشێك لە چارەکە پیاو‌و نیوە پیاوەکان ئاشکرا دەکات‌و دەڵێت:

)من نازانم بۆ ناویان ناون جاش.. جاش گوناهی چییە وا ناوی بزڕێنرێ ٢٢-٧)

ورده ورده -دلە- بەرەو کێشە کۆمەڵایەتییە بڤەو یاساغەکان دەچێت.. هەر دەڵێیت دووربینێکی بەهێزی لە چاواندایە.. یان میکرۆسکۆبێکی ئەلیکترۆنی لە مێشکدایە

(پارچە شووشە فڕێنەدرێ.. قاچی منداڵەکان دەبڕێ.. هەڵناگیرێ‌و کەسیش نییە دەخڵی بکات.. بەس پارچە نان.. هەڵدەگیرێ‌و قایمدەکرێ نەك گیاندارێکی رووتەڵە لێی تێربێ ٢٧-٥)

ئەمجا زێتر لە سنووری کیشوەرە یاساغەکان نزیکدەبێتەوەو.. کێشەییێکی هێجگار پڕ مەترسی مرۆڤایەتی‌و شارستانێتییانەی (ئافرەت) دەوروژێنێت‌و وەك لەکەییێکی شورەیی دەیدات بەرووی گشت داب‌و نەریت‌و ڕەوشتە پووچەڵەکانی کۆمەڵداو دەڵێت:

(لەناو شاردا.. کچ شووشەیە کۆلۆنیایە

لەناو جامخانەی ماڵدایە.

هەر شووشەییێك سەرمۆر نەبێت

دەبێ بشكێ.. دەبێ وردبێ

با خاوەنی خاوێنترین كۆلۆنیا بێ.. ٥-٣١)

لە چیرۆكی (گەوهەری كچێنی)دا.. زۆر بەڕاشكاوی لەسەر زاری خاتوونە كەسێتیەكەی چیرۆكەكە دەڵێت:

(لەم كۆمەڵەی منیشدا.. ئەو (گەوهەرە) مانای هەموو نرخێكە لای خەڵكی.. مانای هەموو شتێكە.. چەندە كۆمەڵێكی كەساسە ئەم كۆمەڵە.. كە ئەستووری ئەقڵی قایمی بەقەدەر پەردەی ئەو گەوهەرەیە. ٤-٣٤)

دڵشاد لە دەسنیشانكردنی سەبەبكاری شێواوی فیكرماندا بەهاوكێشەییێكی تایبەتمەندانەی قووڵ پەنجە دەخاتەسەر لایەنێكی سەرەكیو.. پێوەندی نێوان مرۆڤو گڵۆپو ئەمجا برسێتیو فیوزكردن دەكاتە بنەمای هاوكێشەكەیو دەڵێت:

(برسێتی گەر لە سنووری تەحەمولكردندا بێت.. ئەوە لایتەو تیشكە.. زۆر شتی لەوەپێش نەبینراوی پێدەبینرێت.. خۆ ئەگەر لە سنووری تەحەمولكردندا نەما.. ئەوە ترسناكە.. فیوز دەسووتێتو.. هەموو گڵۆپەكانی ژیریو خێرو بەزەیی سكووت پێدەكات.. ١-٣٣)

خۆشەویستی مرۆڤ.. چ لە ئەدەبو چ لە ژیانی دڵشاددا نموونەییێكی كەم وێنەو دەگمەنە.. بەتایبەتیش بەرامبەر تێكۆشەرانی كرێكارانو چەوساوەكانو بەبیری زانستیانەی ماركسیو لینینیو بەشێوازێكی ئەدەبی تایبەتمەندو سەرنجراكێشەوە پێماندەڵێت: تەنیا لە كۆمەڵگەی كۆمۆنیزمیدا سەرگەردانییەكانی مرۆڤ چارەدەكرێن:

(گڵۆپەكان بێتاوانن.. بۆیێ لەدایكبوون تا رووناكبن.. دابگیرسێن.. تاوانیان چییە كە كارەبایان نادەنێو نایانبەستن بە یێكەوە!؟ رێكیانخەن ! بیانبەستن بەیێكەوە ! بەگوێرەی پێویست كارەبایان بدەنێ. تا زۆر كز نەبن.. یان لەبەر تیشك زۆری نەتەقن.. ئەوسا دەبینی: گڵۆپەكان نازدارنو.. وەك هێشووە رووناكی.. زەوی.. گەردوون رووناكدەكەنەوە.. ئەوسا تاریكیو گورگو تەور.. نابنە مێردەزمەی جەور ١-٣٥)

لێرەدا تاوانی گشت ناتەباییێكان دەداتە پاڵ نەبوونی ئەو پێڕەوە مرۆڤدۆستانەیەی وڵاتیان كردۆتە شەوەزەنگ.. لە شیعری (ژوورەكە)دا دەڵێت:

(پێش هەڵواسین.. داوای كرد هاوسەرەكەی بێت..

– گیانە! دەزوەكەت بۆ پێوەكرا؟

–بەڵێ گیانە

– دڵنیا بوویت لەوەی چاوەكانت كزنینو ژوورەكەمان تاریكبوو؟

– بەڵێ گیانە..

گەشایەوەو روویكردە گاردەكەیو وتی:

– چاوپێكەوتنەكەمان تەواو.. كارم نەما..

فەرموو بمبەن ٢-٦٤)

(لەچیرۆكی دانهێڵو شتی تریش)دا.. بەم دایەلۆگە كورتو تایبەتمەندانەیە.. هاوكێشەی نێوان (پارەو جیاوازی چینایەتی) ساغدەكاتەوە.

– ئەرێ پارە بەرگەی ئەم ژیانە ناگرێت! یان ژیانەكە بەرگەی پارە ناگرێت؟

– هەردووكی راستن.. هەریێكەیان بۆچینێكی تایبەتی خۆی.. ١-٢٥)

بەمجۆرە تا دەگاتە ئەوەی بانگەشەی ئاشكرای بیرو هەڵوێستی خۆی بكاتو.. لە شیعری (گریان)دا.. لەگەڵ "كلۆڤیس هۆگ"ی شاعیری مەزنی كۆموونەی پاریسدا بڵێت:

(پەیمان.. پەیمانە تا دوا بت

بتەكانیش پێشێل دەكەین

داسی مەرگ لە دروێنەی مرۆڤ دەخەین

بەبازوومان.. لە تەختەی سێدارەكانتان

كورسی خوێندن بۆ منداڵان دروستدەكەین.. ١٤-٣)

هەروەها لە شیعری (چاورەشەكەم)دا دەڵێت:

(لەوەتەی فاشستەكان.. رەشەكان سەردەبڕن

من لە ژیانداو زیاد لە جاران

شەیدای چاوە رەشەكانم

هەر بەمەرجێ تۆ شیرین بی

تۆ شیعرێكی كۆمۆنین بی.. ٦٤-٣)

تایبەتمەندێتی ئەدەبی نەتەوایەتی دڵشاد مەریوانی.. چەندە پوختو مرۆڤایەتیانەیە.. هێندەش لە ئەدەبی نەتەوایەتی شاعیرانی دی جیاوازە.. نەخاكو خۆڵ دەخواتو.. نە دارو پەردوو دەپەرستێتو.. لە نامەی دووەمی (دڵدارانی شۆڕش)دا.. بە خۆشەویستەكەی دەڵێت:

(من چی لە خاكێكی وشكی رزگاركراو بكەم! كە خەڵكەكەی مردوو بن.. كەنازدارەكانی بەرد بن.. كەتامی سەربەستی لەناو جەماوەرێكی لێبوردەو خاوەن دڵو زەردەخەنەدا نەچێژم! ٤-٧)

لە كاتێكدا بەم هوشیاریو مرۆڤدۆستییەوە بیردەكاتەوە.. ئەوەش چاك دەزانێت كە نەخشەو پیلانێكی بێمرۆتانە بەرامبەر نەتەوەی كوردو خاكی كوردستانەكەیشی داڕێژراوەو.. بەم تەعبیرە دڵگیرو وشە بێوێنانە باسی دەكات.

(هاوڕێی خۆشەویستم! كاكی گەورەم ! وڵاتەكەی ئێمە قاڵبێك كێكی شیرین بوو.. لە ئاهەنگی زلهێزەكانی جیهاندا كوتكوتكراو.. هەر قاشەی خرایە گەرووی نەرەشێرێكی دەبەنگەوە.. ئیدیكە شیعر چی لەم حساباتە دەگۆڕێت؟! خۆت بۆ هەڵە دەكەیت!! ئێمە پێویستیمان بە فەلسەفەیێكی زانستیانە هەیە.. ٦-٣٤)

دڵشاد چۆن رەفزی خاكی بێمرۆڤو كوردستانی بێنەتەوە دەكات.. هەروەها رەفزی مرۆڤو نەتەوەی بێهەستو هۆشو..بێزەردەخەنەو بێخۆشەویستی دەكاتو.. دەڵێت:

(كەسێك نەتوانێ یێك مرۆڤی خۆشبوێو بۆی دڵسۆزبێ..

ناتوانێ نەتەوەییێکی خۆشبوێ.. یان دڵسۆزی چینەکەی خۆی بێت..

خۆشەویستی سوننەتی ژیانە.. خۆشەوستی نوێژی مرۆڤە بۆ مرۆڤ.. ٦-٣٥)

هەمدیسان وریایانە دەزانێت وڵاتەکەی نەك بەهەشتی سەرزەمین نییە.. بەڵکو وڵاتێکی ئاساییەو.. تەنانەت ناخۆشیشەو ژیان تیایدا گەلێ زەحمەتە.. بەلام هوشیارانەتر نایەلێت هاوکێشە نازدارەکەی لاسەنگ ببێتو.. بەخۆشەویستییێکی مەسیحانە پارسەنگی دەداتەوەو دەڵێت:

(ئەم وڵاتە لە هەموو وڵاتێك ناخۆشترەو.. لە هەموو وڵاتێکیش خۆشەویستترە.. ٦-٩٢)

دیارە زۆر دڵگوشراوو بێزارە.. زۆر تووڕەیە.. بەڵام جڵەوی هۆشی بزرناکات:

لەم سەردەمە گەلێك تووڕەم
سەرم ساغەو دڵیان وەك بلوور شکاندووم
دڵم وەك بلوور شکاوە
هاوڕێکەم بۆ بدۆزەوە
بیدۆزەرەوە.. تا بزانی
گەر پارچەکان بدەن لەیێك
بەدرزی شکان دەنووسرێ
چەندم کوردستان خۆشدەوێ ٧٢-٣

دڵشکانی دڵشاد..زێتر لە هاوکێشەکەی گۆرانی مەزن خۆیو دەرویش عەبدوڵلا بێنازەکەی قەوەو کۆمەڵگە لیخنەکەیان دەچێ:

بەلێ دیارە.. لەناو قەومی بەستا قەدری سنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا

ئەمجا شەهید دڵشاد گرێیی دڵیو چاوانەی برینەکانی دەکاتەوەو بەوپەڕی هێمنییەوە دەڵێت:

(خەڵکانی ئەم وڵاتە بەستەزمانن دیارە لۆمەیان ناکەم.. چونکە زرووف دەرەوەی خۆیان وایلێکردوون.. شاعیرو ئەدیبو هونەرمەند بە کەسێکی جیقو فلیقی خەیاڵاوی گوناه بزانن.. لەبەرئەوە.. ئەگەر کۆماندۆییێکیان تێدا هەڵکەوێت.. لەبری ئەوەی ڕێزی لێبگرن.. باوەڕ بە گیانبازییێکەی ناکەنو ودان بە تواناو شۆڕشگێڕێتی دەرەوەی قەڵەمەکەیدا نانێن.. بەڵکە دەشێ نەك هەر پێیبڵێن فشەکەر.. تەنانەت تۆمەتی سیخوڕیو پەیوەندیی ناشایستەشی بدەنەپاڵ.. ٦-٩٠)

شەهید ئەم گلەییانە لە بەختی خۆی دەکاتو کۆماندۆ شاعیرەکەش هەر خۆیەتیو بەرلەوەی بەدەستی دوژمن شەهید بکرێت.. چەندان جار لە ژیانیدا بە فیشەکی وتەی ژەهراوی دڵی پێکراوەو مێشکی پژێنراوە.

(تۆ ئەی مەرگی سەرە ڕێگەم
دەزانم تۆ دروێنەی گەردنم دەکەی
بەڵای ئەی خۆت.. لەدوای مەرگی
من چی دەکەی!! ٣-١٢)

ئەگەر ئەمە بیرکردنەوەی کاتی مەرگی خۆی بێت بەدووی نەیارو دوژمنەکانیدا. ئەوا لەگەڵ هاوڕێ گیانبازەکانیداو.. لە ساتەوەختی پێکرانی بە فیشەکی دوژمن.. بەپێچەوانەوەی پێشوەوە دەڵێت:

(تفەنگەکەم لێوەربگرەو بمکوژەو دەرچۆ.. کاتی ئەوە نییە هاوڕێ گیان.. سۆزم پێمەفرۆشە.. فلیمی هیندی نییەو.. واقیعی کوردستانە بمکوژەو دەرچۆ.٧- ٩٠)

دڵشاد مەریوانی لە ژیانیدا داوای لە خۆشەویستانو دڵسۆزانی دەکرد.. دوای مەرگی.. ژیانی ئاسوودەیی خۆیان بە باسی رۆژانی رەشی ژیانی شەهید خەمناك نەکەن.. بۆیێ منیش لە کۆتاییدا دەڵێم:

ئەمانەی باسمکردن.. چەند نموونەییێکی هێجگار کەمن لەو تواناو دەسەڵاتە ئەدەبییە تایبەتمەندییانەیو.. لە هەمان کاتیشدا.. گەرچی چەند نموونەییێکی زۆر کەمن لە تەعبیری هونەریی بەرزو جوانو.. بیری زانستیانەو هەڵوێستی چینایەتیو نەتەوایەتی پوختو بێگەردی وەك خۆی باڵابەرزو.. لەو بڕوایەشدام.. بەدانسقەیش بەرهەمی قەڵەمی شەهید نابینین بەو داهێنانو بیرو فەلسەفەیە هەوێن نەکرابنو.. بەتەعبیری نازدار وێنەی تایبەتمەندانەی پڕ لە جۆشو جوانکاری نەڕازێنرابنەوە.. لەگەڵیدا دەڵێم:

(کە بووم چەوساندنەوەش هەبوو
بەڵام نامرم.. هەتا پێکەوە نەمرین
ئەوسا ئەی ئینسان
رۆژە رەشەکانی ژیانی من
هەرباس مەکە
باسەمفۆنیاکەت خەمناك نەبێو
ئاسوودە بژی..١٠-٢)

سەرچاوەکان.. یان ئەو بەرهەمانەی شەهید کە نموونەکانم لێوەرگرتوون:


١. دڵشاد محەمەد ئەمین / بە پەنجەکانم دەنبینم / سلێمانی ١٩٧٨
٢. دڵشاد محەمەد ئەمین / سەمفۆنیای وەنەوشە / بەغدا ١٩٧٧
٣. دڵشاد محەمەد ئەمین / بن بە تیشك / سلێمانی ١٩٧٧
٤. دڵشاد مەریوانی / دڵدارانی شۆڕش / سلێمانی ١٩٧٣
٥. دڵشاد محەمەد ئەمیین / دێریاسین / سلێمانی ١٩٧٨
٦. دڵشاد محەمەد ئەمین / یێکەم هەنگاو / سلێمانی ١٩٧٣
٧. دڵشاد مەریوانی / شەهید خەسرەو / ڕۆمان (دەستنووس)

# ڕێنووسی کوردی و ئاهەنگی شیعری کوردی

Dilşad Merîwanî

# Rênusî Kurdî w Àhengî şî’rî Kurdî

دڵشاد مەریوانی
سلێمانی ١٩٨١

**ئەم نامیلکەیە :**

تایبەتە بە قوتابیان و لاوان و ئەو نارەزوومەندانەی دەیانەوێ بە شێوەیێکی زانستی فێری :

١. ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی.
٢. ڕێنووسی کوردی بە پیتی لاتینی.
٣. ئاهەنگەکانی شیعری کوردی و شێوەی کێشانیان... بن.

*** پێشکەشە بە وانەی دەیانەوێ کورد خاوەنی خۆی بێ.**

د. م.

## پێشەکی

ئەم ڕێنووسە کوردییە پوخت و جوانەی ئێستەمان.. چ بە پیتی عەرەبیی و چ بەپیتی لاتینی گونجێنراو و دەستکاریکراو.. بەرهەمی دەستپێشخەری و ڕەنج و تەنانەت قوربانیدانی چەندین گەورە نووسەر و ڕۆژنامەنووسی نەتەوەکەمانە.. کە هەوڵیان دا کەمتازۆر لەو ڕێنووسە دەقاودەق عەرەبییە ڕزگامان بکەن و.. بە ڕێنووسێکی لەبار و ئاسانتر بۆ نووسینەوەی فەرهەنگ و کولتوورەکەمان بە هەردوو جۆرە پیتەکە بەهرەمەندمان بکەن و.. هەر ئەم پێشەکییە بە شایستەترین شوێن دەزانم کە هەر هیچ نەبێت بەکورتی ئاوڕێك لەو دوو گەورە نووسەر و ڕۆژنامەوانە بدەمەوە، کە لەم مەیدانەدا ڕۆڵی پێشڕەوانەیانەی خۆیان بینیوە.

یێکەمیان: مامۆستا حسێن حوزنی موکریانی (داماو).. دوای کڕینی چاپخانە و پیتەکانی چاپکردن لە ئەڵمانیا.. ئەمجا لە ڕێگەی بەیرووتەوە ساڵی 1915 بۆی هاتە حەڵەب و.. کاتێ بینی پیتە کوردییێکانی تێدانییە، هەر لەوێ فۆرم (قاڵب)ی چەند پیتێکی وەك (پ، چ، ژ، گ، ڤ..)ی داڕشت و بۆ دروستکردنیان ناردنی بۆ ئەڵمانیا.. چونکە پێیوابوو ناکرێت لێیگەڕێت و وەك چاپەمەنییێکانی ساڵانی پێشتر ئەمیش هەروا بەردەوامبێت و.. دواتر بەهەر دەردیسەرییێك بوو لەساڵی 1926دا چاپخانەکەیان بۆ ڕەواندز گواستەوە و.. هەر لەو ساڵەدا گۆڤاری (زاری کرمانجی) پێدەرکرد.. سەیر لەوەدایە ئەم پیاوە مەزنە لەمەدا پێش فارسەکان کەوتووە و.. ئەوان دواتر بۆ ڕێنووسی خۆیان سوودیان لە زوربەی ئەو پیتانەی ئەو قاڵبی بۆ داڕشتبوون، وەرگرت.

دووەمیان: جەلادەت ئالی بەدرخان.. کە دواتر دەوری ئەمیش لە دانانی پیت و بەکارهێنان و چارەسەرکردنی گرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە پیتی لاتینی لەوەی (داماو) کەمتر نەبوو.. چونکە تا ساڵی 1932 کە میر جەلادەت بەدرخان گۆڤاری (هاوار)ی لە شام دەرکرد.. هیچ چاپەمەنییێکی کوردیمان لە مێژووی نەتەوایەتیماندا نەبوو بەو پیتە چاپکرابێت کە ئەو بۆ یێکەمینجار بەکاریهێنا.. ئەمە جگە لەوەی چەندین واژە و دەنگی کوردی هەبوون تا ئەودەمە لە پیتی لاتینیدا هێمای تایبەتییان نەبوو، یاخود مشتومڕ لەسەر ئەوە بوو ئایا ئەو هێمایانە بەرامبەر کام واژە و دەنگ بەکاربێنن؟! بەتایبەتی هێماکانی [(Q و K) و (H و X و لەبری (ق) و (ح) و هتد].. میر بەشێکی ئەم گرفتانە و گەلێکی دیکەیشی ساغکردنەوە.

ئەم بەرهەمە ناوازەیەی دڵشاد مەریوانی شەهیدیش.. وێڕای ئەوەی لەڕووی زانستییەوە نرخ و بەهاییێکی بەرز و باڵای هەیە، لە هەمانکاتدا لەڕووی مێژووی ژیان و مەرگی نوسەر خۆیشییەوە نرخ و بەهاییێکی بەرز و باڵاتری هەیە.. چونکە خولیای شیعری نوێی کوردی و.. دۆزینەوەی هاوئاهەنگەکانی لەنێو بەیتە فۆلکلۆرییە دەوڵەمەندەکانی کوردیدا و.. بەراوردکردن و جۆری دابەشکردنی بڕگەکانیان و شێوازی هونەریی بەکارهێنانی کێشە جیاوازەکانی و.. هەمدیسان ڕوونکردنەوەی هەردوو شێوازی ڕێنووسی کوردی (بە پیتی عەرەبیی و لاتینی گونجێنراو).. بەشێکی زۆری ژیانی خۆی بۆ تەرخانکرد.. بەتایبەتیش جەختکردن و پێداگرتنی لەسەر

نووسینی کوردی بەپیتی لاتینی و بە دەرزوتنەوە و ڕاهێنانی قوتابیان و نووسەرانی کورد لەسەر نووسین بەم تەرزە پیتانە.. دواجار بووە مایەی ئەوەی گیانی خۆی لەم پێناوەدا بکاتە قوربانیی و.. ئەمە ببێتە بیانوویێکی سەرەکی لەو بیانووانەی خوێنەکەیان پێ حەڵاڵ کرد.

لە بەڵگەنامەییێکی ئەمنە سوورەکەی سلێمانیدا کە دوای ڕاپەڕینە جەماوەرییێکەی بەهاری 1991 بەدەستمانکەوت.. بڕیاری ئیعدامکردنی (دە) تێکۆشەری تێدابوو.. هەشتەم ناو، ناوی (**دڵشاد محەمەد ئەمین فەتاح مەریوانی**) بوو.. کە لەڕۆژی 1989 - 03 - 13دا ئیعدامکراوە و.. لەبەرامبەر ناو و مێژووەکەدا.. سزای کوشتنەکەی بە سێ خاڵ خراوەتەڕوو:

1- وتنەوەی وانەی کوردی بە تیپی لاتینی.

2- بڕوابوونی بە جیابوونەوەی کوردستان لە ئیراق.

3- یێکێك بوو لە ئەدیبانی شاخ (شۆڕش).

جارێکی دییش هەر ئێرە بەپەسەندترین شوێن و باشترین بۆنە دەزانم بۆ خستنەڕووی ئەم هەقیقەتە و.. لەهەمانکاتیشدا بۆ ئاماژەدان بەو لایەنە سیاسییە ناوبراوەی تانها دانەری ئەم نامیلکەیە بەشەهیدی حزبەکەی دانانێت.. جا ئەم نەهجەی ئەو لایەنە و بەهەر مەبەستێکی دیکەیش بێت شایانی ڕێز و سوپاسە و.. بەنیسبەت شەهید دڵشاد و کەسوکار و دۆستەکانیشییەوە مایەی شانازییە.. چونکە فەرامۆشکردنی خۆی و تەرمە بزربوۆکەکەی، بووە مایەی ئەوەی دڵشاد لە بازنەی تەسکی ئەواندا قەتیس نەبێت و.. لە بازنەکە دەرچێت و.. ببێتە شەهیدی هەموو میللەت، بگرە هەموو ئینسانییەت.. بێگومان بەمەیان هەزاران هێندەی دی نەمر و شکۆدارتر دەبێت.

دانەری جوانەمەرگ بەو تین و توانا لەڕادەبەدەرەیەوە، ئەو بۆچوونەی ڕەتکردەوە کە پێیوایە بۆ مرۆڤی لێهاتوو وا باشترە خۆی بە تەنها بوارێکەوە خەریکبکات.. سەدان نووسەر و هونەرمەندان هەن لە تاکە بوارەکەی خۆیشیاندا هیچیان بەهیچ نەکردووە.. کەچی دڵشاد لە هەموو کایەکاندا (شیعر، چیرۆك، ڕۆمان، شانۆنامە، مۆسیقا، تەمسیل، ڕەخنە، توێژینەوە، زمان، وەرگێڕان، سیاسەت، هتد).. نە هەر جێپەنجەی دیارە.. بەڵکو بەتاکی تەنیا لەنێو میللەتەکەماندا و لەسەردەمێکی دیاریکراودا بووە دیاردەییێکی سەربەخۆ.

شەهید هەموو هەڵسوکەوتێکی نێو هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکی بە ڕەفتاری سەرکردەییێکی سەردەرچوو و بەهەیبەت دەچوو.. نەتەوە بندەستت و دواکەوتووکان لە ماوەی بیست سی ساڵدا ئەوجا دەتوانن چەند کەسایەتییێکی زۆر کەمی وا بەرهەمبێنن کە ئومێدی ئەوەیان لێدەکرێت وەرچەرخان بخەنە نێو مێژووەکەیانەوە.. بۆیێ ئەمجۆرە کەسایەتییانە هەردەم لەهەموو لاییێکەوە گەمارۆدەدرێن و بەهەر پیلانێك بێت زووبەزوو بێسەرو شوێنیان دەکەن.

بابەتی ڕێنووسی زمانەکەمان و توێژینەوەی شێوازی نوێی شیعری کوردی لەسەر بنچینەی کێشە بڕگەییێکان.. دوو بوارن لەو بوارانەی کە دانەر خولیاییێکی سەیری لەتەکیاندا هەبوو و.. دەتوانم بڵێم وەك ئوستازێکی پرۆفیشناڵ کاری تێیاندا دەکرد.. ئەوەی بە وردی سەرنجی ئەم نووسینەی بدات ئەوەی لا ئاشکرا دەبێت تا چەند تێیاندا لێزان و بەسەلیقە بووە.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا و هەر بۆ نموونە ئەو تێبینییە هێجگار ورد و تایبەتمەندەیتان دەخەمە بەرچاو.. کاتێ ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە مەرج نییە کێشی پەنجە (یان سیلاب) لە شیعردا واتای نوێیایەتی بدات.. بەڵکو ئەم هونەرە نوێیە ئەو شیعرانە دەگرێتەخۆی کە لە کێشی جیاوازی بەیتە فۆلکلۆرییێکانماندا هەن.. چونکە هەرچی شیعری دنیا هەیە –بەو شیعرە عەرەبی و کوردی و فارسی و تورکیانەشەوە کە بەپێی شانگزە بەحرەکەی (فەراهیدی)ش دانراون– دەکرێ حسابی کێشی (بڕگە– پەنجە)یان بۆ بکرێت.. بۆیێ ئاماژە بەوە دەدات کە چۆن دواتر شاعیرانی نوێخواز بۆ خۆجیاکردنەوە لەو کێشە چونییێکانەی شیعری کۆن.. هاتن لەتاکە شیعرێکدا کێشی جۆراوجۆریان بەکارهێنا وەك (ئەی چاو چەشنی بازی قەفەز... گۆران).. ئەمەو دەیان تێبینی وردی دیکە لەم نامیلکە قەوارە بچووك و بەها سەنگینەدا دەدۆزیتەوە.

ڕەوف حەسەن

نەورۆزی – 2006

### هۆی دانانی ئەم نامیلکەیە

پرس و داخوازی : قوتابیان، لاوان، شیعر دۆستان، ئارەزوومەندان دەربارەی ئەلفابێتای کوردی و فێربوونی زانستیانەی ڕێنووسی کوردی بە هەردوو جۆرەکانی پیتی لە عەرەب وەرگیراوەو پیتەکانی لاتینی . هەروەها شارەزایی پەیداکردنیان لە جۆرەکانی ئاهەنگی شیعری کوردی و شێوە کێشانیان، ناچاری کردین دانانی ئەم نامیلکەیە بە کارێکی پێویست بزانین.

ئارەزوومان وابوو بە شێوەیێکی ساکار و ڕۆشن بنووسین ونموونەی فرەی وەها بەکاربهێنین کەبە کەڵکی زۆربەی ئاستە هۆشیاری و خوێندەوارییێکان بێ، تا بە کەڵکی قوتابییێکی پۆلی یێکەمی ناوەندی و قوتابیانی زانستگە و گشت ئارەزوو مەندێك بێت، کە دەیانەوێ شارەزایی لەم بابەتەدا پەیدا بکەن.

هەر بۆ ئەم مەبەستەش : سەرەتا کورتە باسێکی مێژوویی بەکارهێنانی پیتە عەرەبییێکان دەکەین، چۆنێتی خواستنیان، شێوەی گونجاندنیان و بەکارهێنانیان، بەکارهێنانی

زانستیانەیان، پاشان ئاهەنگەکانی شیعری کوردی لە شاعیران، نوری شێخ صالح، ڕەشید نەجیب، ئەوڕەحمان بەگی نفوس... تد.. بە دواوە، پراکتیککردنی برگەییان، ئەمانە لە بەشی یێکەم و دووەمدا، لە بەشی سێیەمیشدا فێربوونی ڕێنووسی کوردی بە پیتەکانی ئەلفابێتای کوردی، پراکتیککردنی ئەو پیتانە بۆ نووسینی هەندێك تێکست .

هیوادارین ئەم نامیلکەیە جێی خۆی بگرێ و ئەو خزمەتەی لێی چاوەڕێ دەکرێ بیگەیەنێتە مەبەستدارانی ئەم بابەتە.

**د . م .**

## بەشی یێکەم

## کورتە باسێکی مێژوویی ڕێنووسی کوردی

پێویستە دان بەو ڕاستییەدا بنێین کە ئێمەی کورد بەرهەمی نووسراومان زۆر کەم بوو لەچاو نەك نەتەوانی شارستانی ئەوروپای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا، بەڵکە لە چاو زۆربەی نەتەوانی دراوسێ و ناوچەکەیشدا، سەرەڕای ئەوەی نووسین بە کوردی گەلێك نوێیە و لەو ڕووەوە لەوان دواکەوتووتر بووین.

کورت و کوردی با بڵێین: لەبەر داگیرکردنی هەمیشەیی کوردستان لە لایەن میللەتانی دراوسێوە، مۆڵەتی ئەوەمان نەدراوەتێ زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێ، مۆڵەتی شارستانی و ئاوەدانی و ئاسوودەیی و دیموکراتیانەی ژیانیان نەداوە بەم نەتەوەیە، بۆیە زانا و منەوەر و بلیمەتەکانیشمان بەزمانی کوردی نەیان نووسیوە، بەڵکە زۆربەیان زانستێکی هەیان بووبێ لە خزمەتی داگیرکەراندا بەکاریان هێناوە، لە خزمەتی بیری ئەواندا بەکاریان هێناوە، مەگەر تاك و تەراییکی وەك ئەحمەدی خانی، حەزرەتی نالی... و بەرەودوا. ئەو هۆیانە و گەلێکی تر، کارێکی وایان کرد، خوێندەوار و ڕووناکبیران و نووسەرانی کورد.....تد. پەنا ببەنە بەر ئەم پیتە عەرەبیانەی ئێستە پێیان دەنووسین. واتە ئێمەی بێ دەدان، تاقمێکمان خواست -لە ترسی لە برساندا نەمردن- کە قەوارەی دەم و پێوانەی پووك و مەلاشووی جیاوازەو.. دەبوو بە تاشین و ڕنین دەستکارییێکی ئەوتۆی بکەین بە کەڵکمان بێ.

ئەو کۆششە بۆ بەکارهێنانی -تاقمی ئەلفابێتای- عەرەبی بۆ ڕێنووسی کورد، بە حاڵەتی دەستنووس لە مێژە، بەلام بۆ چاپ لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدی بیستەمەوە بەدیارکەوت و گرنگی پێدرا.

لەگەڵ بەکارهێنانیدا، کۆمەڵێك گیروگرفتی بۆ دروست کردین دەبوو چاریان بکەین:

ئێمەی کورد پیتی (پ، چ، ڕ، ژ، ڤ، گ) مان هەیە و عەرەب نییەتی، بۆیە منەوەرە بەتەنگەوە هاتووانمان:

لە پیتی (ب)------------- (پ)یان دروستکرد .

لە پیتی (ج)------------- (چ) یان دروستکرد.

لە پیتی (ز)------------- (ژ) یان دروستکرد .

لە پیتی (ف)-------------(ڤ) یان دروستکرد .

لە پیتی (ك) -------------(گ) یان دروستکرد .

تا ئەو کەم و کورتییەی تاقمی ئەلفابێتای عەرەبی هەیەتی بۆ کورد چارەسەری بکەین :

جگە لەوانە: بۆ پیتی (ڕ)ی ئێستە، لە سەرەتادا دووجار پیتی (ر) یان دەنووسی (رر) بۆ نموونە: وشەی (سڕبوون)یان بەمشێوەیە دەنووسی(سرربوون)، تا خوێندەوار بتوانێ (ڕ)ی لاواز لە (ر)ی لەراوە و قەبە جودابکاتەوە .

هەروەها هێمای حەوتێکی گچکەیان خستە سەر (ل)ی لاواز تا هێمای (ڵ)ی قەبە ببەخشێ.

پاشان بۆ (ڕ)ی قەبەش، وەك مەسەلەی (ڵ)ەکە، ئەو حەوتە گچکەیان بەکارهێنا.

پیتەکانی: (ص، ڃ، گ، ڨ، ڗ، .......) یان وێڵکرد،

چونکە لە زمان و نووسینی ئێمەدا ئەو دەنگانە نین .

گشت ئەوانەی باسمان کردن، بەنیسبەت پیتەکانی دەنگەوە، ئەو گۆڕانکارییانە کران، بەلام بە نیسبەت پیتە هەواییێکانەوە "ڤاول"، بەمشێوەیە ڕەخسێنران :

١.سەری کورت ------------ ە، ـە

٢.وای کورت -------------- و

٣.واوی قووڵ ------------ وو

٤.واوی کراوە ------------- ۆ

٥.یای کورت -------------- ی

٦.سەری کراوە ------------- ا

پیتە هەواییێکان هی کوردییان بۆ دانان. واتە هێشتا، دوو پیتی هەوایی تر مابوون پێویستیان بە چار هەبوو:

١- ئەو پیتە هەواییانەی پێی دەڵێن : واوی سلێمانی، کە لەم جۆرە وشانەدا هەن:

**سوێر، کوێر، کوێخا، خوێ، شوێن، نوێن، گوێرەکە، خوێن....تد.**

ئەم واوە تایبەتە، وەك لە نموونەکاندا دەیبینین بە دوو پیت دەربڕاون (وێ)، مامۆستا **تۆفیق وەهبی** شانبەشانی ئەمە واوی خانەقینیشی دەستنیشانکرد کە وەك (ئوی – Õ – تورکی وایە). بۆیە چاری دەربڕینیان وای پەسەند کرد . کەلە بری : واوی سلێمانی، (ۆ) واتە واوێکی سەردار بنووسرێ . بەمشێوەیە:

**سوَر، کوَر، کوَخا، خوَ، شوَن، نوَن، گوَرەکە، خوَن . . . . . تد.**

دوای ئەو بە ماوەییەکی زۆر ماوۆستا مارف خەزنەدار بۆ یێکەمجار لە گەڕانەوەیدا بۆ وڵات، نموونەی ئەم هێمایەی بە پیتی کانزایی هێنا بۆ چاپخانەکانی عێراق و.. چەند بابەتێکی بەرهەمی خۆی پێ چاپ و بڵاوکردەوە.

هەندێك لە نووسەرانیش بە گوێیان کرد.. بەڵام تا ئێستە بڵاونییە و نووسەران بەردەوام نین لەسەر بەکارهێنانی.. چ بەهۆی ڕاهاتنی هەڵە باوەکەوە.. چ بەهۆی نەبوونی ئەو هێمایە لە هەموو چاپخانەییێکدا.. یان بەهەر هۆییێکی ترەوە بێ.

بۆیە ئەو پیتە هەواییە ئێستەیش گیروگرفتی ماوۆستایانی زمان و ئەدەبی کوردییە، لەکاتی دەرزوتنەوەی پرۆگرامی قوتابخانەکاندا.

بە نیسبەت پیتی هەوایی: واوی خانەقینیشەوە، کە ماوۆستا تۆفیق وەهبی وای دانا واوێکی خاڵدار بێ (ۆ). واتە وشەی (قووڵ) کە بە شێوەی خانەقین بنووسرێ بەمشێوەیە بێ (قۆل).. چونکە شێوەی زمانی خوێندن و نووسین و بەرهەمی نووسەران پێنووس نەبوو، هەر زوو پشتگوێ خرا. دیارە ڕۆژگارێك گەر کورد بووە خاوەنی خۆی دەبێ بۆ هێما دەربڕینی دەنگ و هەوا. هێمای وا بە تایبەت بۆ زانایانی زمان و بابەتەکانی زمان بەکاربهێنرێ.

٢- پیتی هەوایی نۆیەم، بێ هێما مایەوە. ماوۆستا تۆفیق وەهبی لەم ڕووەوە کۆششێکی کرد. گەر ڕووناکبیران و خوێندەواران و نووسەرانی کورد، کاتی خۆی، چارەکەی ماوۆستایان قبوڵ بکردایە. ئێستە ئەو گرفتەمان نەدەبوو.

چارەکە بەمشێوەیە بوو:

ئەم پیتە هەواییە لە ووشەی (بردن)دا، لە نێوان پیتەکانی (ب-ر) و . (د-ن)دا هەیە. واتە وشەی (بردن)، چوار پیت نییە و شەش پیتە .

ماوۆستا پێشنیاری کرد ئەو ووشەیە بەمشێوەیە بنوسرێ (بڵردڵن). واتە چوکلەییێکی بێ خاڵ (ڵ) لەبری پیتی نۆیەمی هەوایی بنوسرێ . تا بزانرێ ئەو پیتە بوونی هەیە و هێماکەی ئەوەتا. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە. چەند ڕستەییێك بە هەردوو جۆری ڕێنووسەکە دەنوسین. ڵ

١- پیتی نۆیەمی هەوایی - بێ هێما-:

**(دەستێك ڕانڵک و چۆغەی دەست دڵرووم کڵردو بڵردڵم بۆ بڵراکەم. لەو کاتانەدا نڵمنڵم باران دەباری. ناچار چوومە شڵوێنێکی نڵسڵرمەوە تا تەڕنەبڵم)**

بەڵام وەك ووتمان: کەسی وا دووی ئەم پێشنیارە نەکەوت. بۆیە ئەو پیتە هەواییە بێ هێما مایەوە.

ئەوە بە کورتی باسێکی مێژووی پیتەکانی زمانی کورد و شێوەی ڕێنووسی بوو. ئینجا نۆرەی ئەوە هات پیتەکان بە گشتی بناسین و شارەزایی یاسا بنەڕەتییێکانی ڕێنووسی کوردی بین.

**پیتەکانی ڕێنووسی کورد -بە هێمای عەرەبی-**

وەك هەموو زمانانی تر، زمانی کوردییش لە دوو جۆرە هێما پێکهاتووە

١- پیتەکانی دەنگ -کۆنسینانت- ژمارەیان ٢٩یە.. هێماکانیان ئەمانەن:

ئ، پ، ب، ت، ح، ج، چ، خ، د، ر، ڕ، ز، ژ، س، ش،

ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، ڵ، م، ن، و، هـ، ی.

٢- پیتە هەواییێکان -ڤاوڵ- ژمارەیان ٩یە.. هێماکانیان ئەمانەن:

ا، ە، و، ۆ، وو، وێ، ی، ێ، ڵ * ،

١- با پیتەکانی دەنگ بشوبهێنین بە ٢٩ کونی شمشاڵێك کە هەر کونەیان بەپێی شوێت و دووری و نزیکی لەجێ ی فوو پێدا کردنی شمشاڵەکەوە . ئاهەنگی تایبەتییان هەیە.

بەڵام بەبێ ((فوو-هەوا)کە بێدەنگن و نقەیان نایە.

٢- با، پیتە هەواییێکانیش بشوبهێنین بەو هەوایەی لەگەرووەوە دێتەدەرەوە، بێئەوەی بەر ئامرازەکانی مەلاشوو، پووك، زمان، لێو. . تد.. بکەون.

واتە بیئەوەی بەر شمشاڵەکە بکەون و پیایدا تێپەڕبن.. هیچ ئاهەنگێکی دیاریکراویان نییە و.. لێیان حاڵی نابن.. واتە لە ئەنجامدا

---

*چونکە پیتی هەوایی نۆیەم هێمای نییە، هەر چوکلەکەی ماوۆستا تۆفیق وەهبییان دانا.

ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ: وەك چۆن بەبێ ئاوێتەبوونی هەوای فوو لە کونەکانی شمشاڵەکەدا -هەر کونە بە گوێرەی شوێن و دەنگی خۆی - ئێمە هیچ دەنگێکی لێ حاڵی بوومان دەست ناکەوێت .

هەر بەم نموونەیە . هەر بەم لۆجیکە - منگق - دەتوانین دەستنیشانی یاساکانی ڕێنووسی کوردی بکەین.. دیارە لێرەدا مەبەستمان یاسا بنەڕەتیێکانی ڕێنووسی کوردییە.. چونکە لە (هۆی دانانی ئەم کتێبەکەدا) ئەوەمان بەدیار خستووە، کە باسەکەمان ئەکادیمی نییە.

**بەکشتی یاسا بنەڕەتییێکانی ڕێنووسی کوردی**

١- مادام هەوای فووی ئامادەکراو، دوای ئەوە دەکەوێ کە شمشاڵەکەمان ناوە بە لێوەوە، ئەوسا فووەکەی پێدا بکەین .

واته : هەمیشه پیتەکانی دەنگ دادەنرێن، ئەوسا پیتەکانی هەوا دادەنرێن.

واته:هەمیشه و لە هەموو نووسینێکدا پیتی دەنگ پێش دەکەوێ ئەوسا، پیتی هەوایی دێ بە شوێنیدا .

واته:ناشێ بەهیچ شێوەیێك پیتی هەوایی لە هیچ وشه و برگەییێکدا، لەسەرەتادا دابنرێ .

بۆ نموونه:

ناشێ نووسینی وا هەبێ:

ێوا، ۆرا . . . . . تد.

بەڵکه دەبێ بەم شێوەیه بێ:

کا، کە، کو، کوو، کۆ، کۆ – کوێ، کی، کێ.

کە ئەوانه هەر نۆ پیته هەواییێکانن لەگەڵ پیتێکی دەنگ بۆ نموونەی دروستبوونی دەنگی ناهەنگی برگەکه .

٢– هەرگیز ناشێ دوو پیتی هەوایی بکەونه تەنیشت یێکەوە، وەك چۆن نابێ دوو فووی هەوا بکەین ئەوسا شمشاڵ بنێین بە لێومانەوە، کە هیچی لێ دەرناچێ واته، نموونەی وا، هەرگیز نابێ: ۆێ، ێه، اێ، ە ا، . . . . . تد .

٣– هەر بەوشێوەیه، دوو پیتی دەنگ ناکەونه تەك یێکترییەوە، خۆ، ئەگەر کەوتن، ئەوا جووت دەبن و هەردووکیان دەنووسرێن. بەڵام لە کاتی خوێندنەوەدا پیتی دەنگی یێکەم – ئەوەی دوای پیته هەواییێکه– دەنگی زوڵاڵ دەبێ بەسەر پیتی دەنگی دووەمدا، واته بە ئاستەم گوێمان لە دەنگی دووەم دەبێ، بۆ نموونه:

وشەی: دەست، پیتی(س) زاڵ و زوڵاڵه بەسەر پیتی (ت)دا، کاتی خوێندنەوە.

وشەی: پێبوت، پیتی(و) بەسەر پیتی(ت)دا زاڵ و زوڵاڵه.. کاتی خوێندنەوە.

وشەی: هەڵگرت، پیتی (ر) بەسەر پیتی (ت)دا زاڵ و زوڵاڵه لەکاتی خوێندنەوەدا.

چونکه لە هەرسێ نموونەکەدا، دواین دوو پیتی (ست، وت، ڕت) لە پیتەکانی دەنگی و تەك یێکتری کەوتوون، واتا لە خوێندنەوەدا، مەگەر زۆر لە خۆمان بکەین، دەنا پیتەکانی دەنگی دوایی، بەئاستەم دێنەگوێ.

٤– پیتی(ی)ی پەیوەند، واته ئەو (ی)یەی وشەییێك دەبەستێ بە وشەییێکی ترەوە، گەر، لەدوای هەر وشەییێکەوە هات ئەو وشەیه گەر دواین پیتی هەوایی بوو، ئەوا (ی)یێکه لە پیتەکانی دەنگ دەبێ (١).

وەك: دێیَ ئێمه، Dêy ême

دەبینین مادام پیتی(ێ) کە دواین پیتی ووشەی (دێ)یە.. چونکه لە پیته هەواییێکانه پیتی (ی) پەیوەندیمان بە هێمای پیتی (ی y) دەنگ نووسی .

خۆ ئەگەر پیتی (ی) ی پەیوەندی کەوتە نێوان دوو ووشەوە کە ووشەی یێکەمیان، دواین پیتەکەی لە پیتەکانی دەنگ بوو.. ئەوا پیتی(ی)ی پەیوەندە کەبە هێمای (ی)ی هەوایی دەنووسین.

وەك: ماڵ ی ئێمه، ماڵی ئێمه، Maĺî ême.

مادام دوایین پیتی ووشەی یێکەم (ماڵ) پیتی (ڵ)یه و. لە پیتەکانی دەنگە، کەواته (ی)ی پەیوەندەکە بە هێمای (ی î) هەوایی دەنووسین.

نموونەی تر:

کاروانی گەرمیان Karwan î germyan

پیتی(ی)ی پەیوەندمان بە (ی î) هەوایی نووسی، چونکه دواین پیتی ووشەی یێکەم، واته پیتی پێش (ی)ی پەیوەند لە پیتەکانی دەنگ بوو (ن).

گەرمای بەتین Germa y betîn

پیتی(ی)ی پەیوەندمان بە(ی y) دەنگ نووسی، چونکه دواین پیتی ووشەی یێکەم، واته پیتی پێش (ی)ی پەیوەند لە پیته هەواییێکان بوو (ا a) .

پیتی(ی)ی پەیوەندمان بە(ی y) دەنگ نووسی، چونکه دواین پیتی ووشەی یێکەم، واته پیتی پێش (ی)ی پەیوەند لە پیته هەواییێکان بوو (ا a) .

٥– هەروەها پیتی (و) ی پەیوەندی لێکدەر، هەمان دەستووری (ی)ی پەیوەندی و لێکدەرەی هەیه چونکه، ئەمیش لە خانەی هەردوو جۆرەکانی پیتی ڕێنووسی کوردیدا هەیه، واته (و)ی دەنگ هەیه (u)، (و)ی هەواییش هەیه (w).

نموونه:

ئەحمەد و مەحموود Ehmed u Mehmûd (و)ی پەیوەندیمان بە هێمای (و u )ی هەوایی نووسی، مادام دواین پیتی ووشەی یێکەم (د) لە پیتەکانی دەنگه.

کاڵێ و خونچه Kaĺê w Xunçe (و)ی پەیوەندیمان بە هێمای (و w)ی دەنگ نووسی، مادام دوایین پیتی ووشەی یێکەم (ێ ê) لە پیته هەواییێکانه .

نموونەی تر:

سیروان و شۆڕش Sirwan u Şoriş

---

(١) چونکه دوو جۆر پیتی (ی) مان هەیه، دەنگ و هەوایی، کە لە هێمای پیتەکاندا بە عەرەبی دەرناکەون، بەڵام لە هێمای پیتەکان بەلاتینی دەردەکەون، لەجێی خۆیدا باسی دەکەین.

پیتی (و) ی پەیوەندی (u) بە هەوایی دەنووسرێ لە بەر(ن) ی پێش خۆی کە پیتی دەنگە .

دێ و شار Dê w Şar

پیتی(و)یپەیوەندیمان (w)بە دەنگ نووسی مادام پیتی پێش خۆی (ێ) لە پیتە هەواییێکانە.

بە گشتی ئەوانە خاڵە سەرەکی و یاسا گرنگەکانی ڕێنووسی کوردی بوون، گەر لە نووسیندا ڕەچاویان بکەین ناکەوینە هەڵەوە. ماوەتەوە سەر نەشێواندنمان لە مەسەلەی بوونی دوو جۆر (ی ، و) جارێك لە خانەی پیتەکانی دەنگدا، جارێك لە خانەی پیتە هەواییێکاندا.. لە بەشی هاتوودا لێیان دەدوێین.

{ چۆنێتی جوداکردنەوەی هەردوو جۆر پیتی:

(ی-ی) ، (و - و)ی پەیوەند لێکدەر }

وەك لە باسەکانی پێشوودا بۆمان دەرکەوت و باسمانکرد، دوو جۆر (و)مان هەیە:

١- (و) لە حاڵەتێکدا، کە سەر بە پیتەکانی دەنگە و، لە نووسینی لاتینیدا هێمای(w)ی هەیە.

٢- (و) لە حاڵەتێکدا، کە سەر بە پیتە هەواییێکانە و، لە نووسینی لاتینیدا هێمای (u)ی هەیە.

هەروەها دوو جۆر (ی)مان هەیە:

١- (ی) لە حاڵەتێکدا، کە سەر پیتەکانی دەنگە و، لە نووسینی لاتینیدا هێمای (Y)ی هەیە .

٢- (ی) لە حاڵەتێکدا، کەسەر بە پیتە هەواییێکانە و، لە نووسینی لاتینیدا هێمای(î) ی هەیە.

بەڵام ئێمە لە بەشی یێکەمی بابەتی ئەم نامیلکەیەدا جاری باسی ڕێنووسی کوردی بە هێمای پیتی عەرەبی دەکەین. لە نووسین بە پیتەکانی هێمای عەرەبیشدا -وەك هێمای پیتە لاتینییێکان نین تا جیاوازییان لە جۆری هێماکەدا هەبێ و، لە کاتی خوێندنەوەدا پێی بزانین- بەڵکە بۆ هەردوو جۆر (ی)، یێك هێمایان هەیە و هەردوو جۆر (و)یش، یێك هێمایان هەیە، کەواتە دەبێت فێر ببین: چۆنیان لەیێك جودابکەینەوە .

بۆ جوداکردنەوەیان پەنا دەبەینە بەر دوو یاسای ڕێنووس کە لێی دوواین.

١- سەرەتای هیچ برگەیێك بە پیتی هەوایی دەست پێ ناکات، کەواتە هەر (و، ی)ێك کەوتنە سەرەتای برگەوە یێکسەر دەبێ بزانین ئەوە لە توخمی پیتەکانی دەنگە.. وەك :

یار (ی) لێرەدا لە توخمی پیتی دەنگە .

وێر (و) لێرەدا لە توخمی پیتی دەنگە .

نموونەی تر:

ئەم (ی)یانە هەموویان لە توخمی پیتی دەنگی (Y)ن:

یاس، یان، یێك، یێخە، . . تاد.

ئەم (و)انە، هەموویان لە توخمی پیتی دەنگی (W)ن:

وان، وەرە، ووشە، ووڵات، وەستا،.......تاد.

٢- هیچ برگەیێك بەبێ هەوایی نەناوی برگەی لێ دەنرێ نەدەشخوێنرێتەوە.

واتە: لەهەر برگەیێکدا، دوای پیتی یێکەمی برگەکە کە دەبێ بێ، هەر (و، ی)ێکمان بینی دەشێ لە توخمی پیتە هەواییێکان بن.

وەك: باری، دوو برگەیە (با، ڕی)، برگەی دووەم (ڕی) دەبێ یێکسەر بزانین (ی) لێرەدا لە توخمی پیتە هەواییێکانە.

خورما، دوو برگەیە (خور، ما)، برگەی یێکەم (خور) دەبێ یێکسەر بزانین (و) لێرەدا لە توخمی پیتە هەواییێکانە، دەنا ئەو برگەیە نە ناوی -برگە- دەبێ و نەدەشخوێنرایەوە.

نموونەی تر:

ئەم (ی)یانە هەموویان لە توخمی پیتە هەواییێکانن:

هاری، شەرمەزاری، بیر، تیر، بی، لیرە، شین، قین،.... تاد.

ئەم (و)انە، هەموویان لە توخمی پیتە هەواییێکانن:

کورد، کون، کاردو، ڕوبار، لێبوردن، سورمە،....تاد.

بەوشێوەیە، بەهۆی بەکارهێنان و پراکتیك کردنی ئەو دوو یاسایەی ڕێنووس، دەتوانین بە هێمای پیتە عەرەبییێکان ڕێنووسی ئەو دوو توخمە (و،ی)یە جودابکەینەوە، تا دەگەینە بابەتی ڕێنووس بە هێمای پیتەکانی لاتین، ئەوسا هەر بە تەواوی لەم گرفتەش ڕزگار دەبین.

## برگە - چی یە ؟

لە باسەکانی ڕابوردوودا بەهۆی یاساکانی ڕێنووسەوە، شتێك لە ئاوێتە بوونی پیتی دەنگ و پیتی هەوایی حاڵی بووین، ووتمان شمشاڵ دەنرێ بە لێوەوە ئەوسا فوو دەدرێ، واتا هەمیشە پیتی دەنگ دەکەوێتە سەرەتای نووسین و، پیتی هەوایی دووی دەکەوێ. واتە لە ئاوێتەبوونی ئەو دوو توخمە پیتە دەنگ دروستدەبێ، بەو دەنگەش دەوترێ برگە .

برگە جگە لەو ناوە ناوی تریشی هەیە.

کەرت-برگە-سیلاب-هیجا-پەنجە .

بەڵام ئێمە لەم باسەماندا تەنیا ووشە یان ناوی (برگە) بەکاردێنین .

پێناسەی برگە: بەو گوژمە هەوایە دەڵێن کەلەیێك ساتدا لە گەرووەوە دەردەچێ و بە ئالەتەکانی گەروو (زمانە بچکۆلە، مەلاشوو...تاد)، تێدەپەڕێ و لە لێوانەوە دەرباز دەبێ وەك دەنگێك.

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر برگەمان هەیە:

برگەی کورت:

لە پیتێکی دەنگ و پیتێکی هەوایی پێکدێ وەك:

کا، شە، وی، ئا، شوو، دێوبۆ، با، لە.....تاد .

برگەی درێژ:

له پیتێکی هەوایی که بکەوێته نێوان دوو پیتی دەنگ یان سیّ پیتی دەنگەوە پێکدیّ وەك:

خام، شەم، چوون، ڕۆن، شون-شوێن، خۆم، سیم، سێو،...تاد

مانگ، سارد، ئاسك،...تاد .

واته : لەوە حاڵی بووین که زمانەکەی ئێمه وەك گشت زمانانی گروپی هێندۆ ئەوروپی-هیندۆ ئێرانی- برگەییه، له ئاوێته بوونی پیتی دەنگ و پیتی هەوایی (برگه) دروستدەبیّ. له ڕست بوونی برگه (وشه) درووستدەبیّ. له ڕستبوونی ووشه (ڕسته) دروستدەبیّ. له هۆنینەوەی ڕستەش ( پەرەگراف - تێکست - دەق) دروستدەبیّ.

نموونه:

١- نەورۆز جەژنێکی نەتەوایەتی یه :

نەو، ڕۆز، جەژ، نیّ، کی، نە، تە، وا، یە، تی، یه .

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ ٨ ٩ ١٠ ١١

٢- کەم دەژیم و کەڵ دەژیم

کەم، دە، ژی، م و، کەڵ، دە، ژیم .

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧

٣-بەرخی نێر بۆ سەربڕین باشه .

بەر، خی، نێر، بۆ، سەر، ب*، ڕین، با، شه .

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ ٨ ٩

*(ب): پیتی هەوایی نۆیەمی (لەگەڵ) که باسمان لێوە کرد به پیتی عەرەبی هێمای نییه دەنا وا دەنوسریّ (bi) بۆیه برگەیه .

## بەشی دووەم :

له باسەکانی ڕابردوودا فێری چۆنیەتی ڕێنووسی کوردی بووین و له یاسا گرنگەکانی حاڵی بووین .

لەم بەشەی دووەمدا باسی چۆنیەتی کێشانی شیعری میللی و فۆلکلۆری و نوێی کوردی دەکەین و بە گشتی هەوڵدەدەین هەندێك زانیاری لێوە وەربگرین .

### سەرەتایێك :

هەتا چارەکی یێکەمی سەدەی بیستەمیش.شاعیرانی کورد له نووسینی شیعری هونەریدا، پەیڕەوی بەحرەکانی عەرووزی عەرەبیان دەکردو پێبەپێی کێشی ئەوان شیعری کوردیان دەنووسی.

نەك هەر شاعیرانی کورد بەڵکه شاعیرانی تورك و فارسیش، شانبەشانی شاعیرانی عەرەب بەو کێشانەی عەرووز شیعریان دادەنا. به گشتی بەو جۆرە ئەدەبە (عەرەبی، کوردی، تورکی، فارسی) لەو قۆناغەدا دەڵێن (ئەدەبی ئیسلامی).. واته گشت ئەو شاعیرانەی پێڕەوی عەرووزی عەرەبی-تەفعیله-یان کردووه.

له ساڵانی سییێکانی ئەم سەدەیەوە، کۆمەڵێك شاعیری منەوەر و گەنج و گەلویست و خێرخواز: شێخ نوری شێخ ساڵح، عەبدوڵڵا بەگی گۆران، ڕەشید نەجیب، ئەوڕەحمان بەگی نفووس.. بەرەبەرە وازیان له دانانی شیعری کوردی به کێشی عەرووز هێنا و گەڕانەوە لای کێشه خۆماڵییەکانی ئەدەبی میللی و فۆلکلۆری کوردی.. پاشان لاساییکردنەوەی کێشی شیعری نوێی تورکی و ئەوروپایی.. واته کێشه برگەییەکان جگه له هونەر نواندنی خۆشیان بۆ گۆڕینی شێوەی دابەشکردنی برگه له دێڕی شیعری کوردیدا.

وازهێنانی ئەو شاعیرانه و هاوڕێیانیان له عەرووزی عەرەبی و گەڕانەوەیان بۆ کێشه برگەییەکان شیعری کوردی. لەبەر تەنیا ویست و حەزی خۆیان نەبوو.. بەڵکە:کەوتنی دەوڵەتی عوسمانی، بەرپا بوونی جەنگی جیهانی، ماف وەرگرتنی هەندێك له میللەتانی ناوچەکه، بلاّوبونەوە و نەشونماکردنی بیری نەتەوایەتی-زاڵبوونی بۆرژووا-، درووستبوون و سەرکەوتنی کۆماره یێکگرتووەکانی یێکێتی سۆڤێت، بلاّوبوونەوەی کتێبی سۆسیالیستی، پێشکەوتنی چاپەمەنی و بلاّوبوونەوەی کتێبی فەلسەفی، به تایبەتی بیری مارکسی و پاشان مارکسی لەنینی، کزبوونی ڕۆڵی دەرەبەگ.. دروستبوونی هەندێك کارگه و فابریقه و کۆمپانیا...تاد.

ئەوانه و گەلێك هۆی گرنگی لەو بابەته، ئەو بارو دۆخەیان ڕەخساند که ڕوناکبیرانی کوردیش گرنگی به سامانی نەتەوایەتی کورد بدەن، به تایبەتی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و شیعری میللی باو.

جگه له نەشونمای بیری کوردایەتی، بیری پێشکەوتنخوازی مرۆڤایەتی سۆسیالیستی - سەرەتاتکێی له بیری خوێندەواران و ڕووناکبیرانی کوردا دەکرد، به تایبەتی که هەردوو جەنگه جیهانییێکه نەخشەی ڕۆژهەلاّتیان گۆڕی.

تەکنیکی نویّ و سەردانی شارستانێتی ئەورووپا له ڕۆژهەلاّت، بەهۆی فراوانبوون و گورجبوونی ڕیّ و هۆکانی هاتوچۆوە، بەهۆی ئیستعمارکردنی ولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست له لایەن زلهێزه سەرمایەدارەکانەوە وەك: ئینگلیز و فەرەنسا ....تاد .

ئەمانه هەر هەمووی هۆی کاریگەر بوون بۆ بزووتنی بیری خەڵکی و هەنگاونانیان به فێربوون و خوێندن و خۆ هۆشیار کردن، هەر وەك چۆن هۆبوون بۆ پێشکەوتنی ئەدەب و هونەری کوردی.

*** *** ***

**کێشە بڕگەییەکانی کوردی کامانەن؟**

کێشە برگەییەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری و میللی، پاشان شیعری هونەریی نوێی کوردی دوای وازهێنانی لە عەرووزی عەرەبی ئەمانەن، وا بە نموونەوە لێیان دەدوێین.

دیارە کێشی وردتر لەمانە هەن، بەڵام ئێمە باسی شیعر دەکەین و ئەو کێشە وردانە هی یاریی منداڵانن وەک:

هەللور بللور ئەکامە،

خەجەکە خەجەکە مەگری،

هۆ ڕێوی ڕێوی... تاد، بۆیەلێیان نادوێین .

**هەنگاوی یەکەمی گۆڕانکارییەکە:**

**ڕزگاربوون لە عەرووزی عەرەبی... ئەم کێشانە بوو:**

**١-کێشی حەوت بڕگەیی:**

ها . تووم . لە . لای . ئەو . لا . یە .

خەر . ما . نم . لە . بەر . با . یە .

کا . ڕو . کاس . پیم . پێ . ناك . ڕێ .

لە . بەر . چا . وی . لەی . لا . یە .

(فۆلکلۆر) .

واتە : دێڕی یەکەم چەند برگە بێ، دەبێ، دێڕەکانی دوای ئەو هەر هێندە بن، دەنا ئاهەنگی خوێندنەوەکەیان تێکدەچێ و.. هەر ئەم تێکچوونەشە پێیدەڵێن: فلان شاعیر شیعری لەنگی زۆرە، واتە: نەبە سەلیقە نەبە زانست شارەزا و لێزانی کێشی شیعر نییە .

**٢-کێشی هەشت بڕگەیی**

ئەی.تۆ.یە.کە.فت.بۆ.لە.کە.

من.دێم.لە.دەس.تم.ڕا.مە.کە.

تۆ.تۆ.پی.یا.ری.کر.د.نی.

وەك.کو.لە.کەی.ڕۆ.حی.م.نی.

سەرنجێك:

کێشی نۆ برگەییمان نییە، تەنیا یێك شیعر و یێك بەیت نەبێ، ئێستە نموونەی شیعرەکەم لە بەردەستدا نییە.. بەهی شاعیر ع.ع.شەونم تێگەیشتبووم کە پەیوەندیم پێوەکرد، وتی هی من نییە.. بۆیە تەنیا نموونەی بەیتەکە دەنووسم کە هی گۆرانە.

ب.نوو.سە.ب.پر.سە.مە.تر.سە.

چەند.دێ.ڕێك.شیع.ری.جوا.نت.بە.سە.

**٣-کێشی دە بڕگەیی:**

ڕە.شە.ڕی.حا.نە.خۆ.می.پێ.ڕەش.کەم .

لەد.وای.با.ڵا.کەت.دڵ.بە.کێ.خۆش.کەم.

(فۆلکلۆر)

**٤- کێشی یازدە بڕگەیی:**

هەر.چەن.دە.کەم.ئەو.خە.یا.لەی.پێی.مەس.تم.

بۆم.ناخ.ڕێ.تە.ناو.چوار.چێ.وەی.هەڵ.بەس.تم

(گۆران)

**٥-کێشی دوانزە بڕگەیی:**

قژ.کا.ڵی.لێو.ئا.ڵی.پر.شن.گی.نی.گا.کاڵ.

ئەی.ك.چە.جوا.نە.کەی.سەر.گۆ.نا.نەخ.تێ.ئاڵ

(گۆران)

**٦-کێشی سیازدە بڕگەیی:**

ئەی.ت.ری.فەی.ما.نگی.س.پی.دەر.کی.دە.لا.قە

با.پیس.نە.بی.خۆت.مە.دە.لەم.کور.دی.عێ.را.قە

(گۆران)

**٧-کێشی چواردە بڕگەیی:**

ئێ.وا.رە.یە.وا.هەڵ.گ.رە.سا.گۆ.زە.یی.تا.زە

ڕێی.کا.نی.قو.بان.مون.تە.زی.ری.جیل.وە.یی.نا.زە

(گۆران)

**٨- کێشی پانزە بڕگەیی**

بوو.کی.ڕا.زا.وەی.خە.یا.لم.گیا.نە.کەم.ست.فا.تی.مە

تا.قە.پر.شن.گێ.کی.چا.ووت.ئەو.پە.ڕی.ئا.وا.ت.مە

(هەردی)

**٩-کێشی شازدە بڕگەیی:**

هە.موو.ڕۆ.ژێ.لە.بەر.سەی.ری.ب.تی.ئەو.بەژ.نو.با.ڵا.یە .

لە.سەر.ڕێ.یا.ئە.وەس.تم.من.هە.تا.کو.ئا.وی.پێم.دا.یە.

(هەردی)

*** *** ***

بەگشتی ئەوانە.هەر نۆ کێشە سەرەکییەکەن لە شیعری کوردی دا. پێویستە ئەوەش ئاگاداربین کە دەتوانین هەر بە هۆی ئەم برگانەوە شیعرەکانی (ئەدەبی ئیسلامی) واتە شیعرە کۆنەکانیش بکێشین کە بە پێی عەرووزی عەرەبی دانراون .

ئەو نۆ کێشە سەرەکییەی باسمان کرد و نموونەمان بۆ هێنانەوە، بۆیە ناومان نان کێشە سەرەکییەکان، چونکە هەر کێشێك لەوانە لەڕووی چۆنایەتی ناوەوەیان، خۆیان لەناو خۆیاندا دەبن بە چەند بەشێکەوە.

واتە: هەر کێشێك بهێنین لەو نۆ کێشە، چەند سیستمێکی تایبەت و جیاوازی هەیە لە ڕووی ئاهەنگی ناوەوەی، لەڕووی دابەشبوونی ژمارەی برگەکانی.. بۆ نموونە:

کێشی دوانزە برگەیی.ژمارەی برگەکانی ١٢یە، بەڵام ئەم کێشە خۆی بۆخۆی: لە ڕووی چۆنایەتی دابەشبوونی برگەکانی لە ناوەوە، چەند سستمێکی جیاوازی هەیە بۆ دابەش بوونی برگە و گۆرینی ئاهەنگی ناوەوەی :-

قژ کاڵی، لێو ئاڵی، پرشنگی، نیگا کاڵ

قژ. کا.ڵی، لێو . ئا.ڵی، پر.شن.گی، نی.گا.کاڵ

١ ٢ ٣   ١ ٢ ٣   ١ ٢ ٣   ١ ٢ ٣

١ ٢ ٣   ١ ٢ ٣   ١ ٢ ٣   ١ ٢ ٣

ئەی.ك.چە، جوا.نە.کەی، سەر.گۆ.نا، نەخ.تێ.ئاڵ

ئەی کچە،جوانەکەی، سەرگۆنا، نەختێ ئاڵ

وەك بينيمان لە رووى چەندايەتييەوە ١٢ برگەيە، بەڵام لە رووى چۆنايەتى ناوەوەى دابەش بوونى برگەكان(٤) هەنگاو، هەر هەنگاوەى سێ(٣) برگەيە .

٣+٣+٣+٣ ------- ١٢

ئێستە نموونەيێكى تر دێنينەوە لە رووى چەندايەتييەوە هەر (١٢) برگە بێ، بەڵام لە رووى چۆنايەتى ناوەوەى و دابەش بوونى برگەكانى، سيستمەكەى جياوازە و ئەم نموونەيەمان(٣) هەنگاوە و هەر هەنگاوەى (٤) برگەيە.

واتە: ٤+٤+٤ ------- ١٢

فەرموون بۆ نموونەكە:

قژى لاجان، خاوو پەخشان، لەسەر گۆنا

ق.ژى.لا.جان، خا.وو.پەخ.شان، لە.سەر.گۆ.نا

١ ٢ ٣ ٤   ١ ٢ ٣ ٤   ١ ٢ ٣ ٤

١ ٢ ٣ ٤   ١ ٢ ٣ ٤   ١ ٢ ٣ ٤

چەند.دێ.رێ.كن، وەك.شيع.رى.جوان، لە.دى.وا.نا

چەند دێرێكن، وەك شيعرى جوان، لە ديوانا

واتە : دەشێ كێش (١٢) برگەيى، يان هەركێشێكى تر، لە(نۆ) كێشە سەرەكيێكە هەرييەكەيان وەك ئەم نموونەيەى نيشانماندا خۆى لەناو خۆيدا چەندەها سيستمى چۆنايەتى دابەشبوونى برگەيى هەبێ و بەپێى سيستمى ئەو دابەشبوونەش ديارە ئاهەنگەكەى دەگۆڕێ.

واتە: دەشێ كێشى (١٢) برگەيى، بۆ نموونە، لە رووى چۆنێتى ئاهەنگى ناوەوەى كێشە سەرەكيێكە.. ئەم چەند جۆر سيستمى دابەشبوونى برگەييەى هەبێ:

٣+٣+٣+٣ ---------- ١٢

٤+٤+٤ ---------- ١٢

٢+٥+٥ ---------- ١٢

٥+٥+٢ ---------- ١٢

٥+٢+٥ ---------- ١٢

٤+٢+٦ ---------- ١٢

٣+٢+٥+٢ ---------- ١٢

٥+٣+٢+٢ ---------- ١٢

٤+٤+٢+٢ ---------- ١٢

٢+٤+٢+٤ ---------- ١٢ ..............تا دوايى .

وەك ووتمان دەشێ چۆن ئەم كێشەمان بە نموونە شيكردەوە لە رووى چۆنايەتى ناوەوەى دابەشبوونى برگەكان و گۆڕينى سيستمى ئەو دابەشبوونە و ئاهەنگەكەشى، هەر كێشێكى سەرەكى تريش لە (نۆ) كێشەكەى شيعرى كوردى بەم شێوەيە لە رووى چۆنايەتى ناوەوەى وەك ئەو نموونەيەى هێنامانەوە وەهابن و جەنجاڵتريش، گرنگ ئەوەيە شاعيرى كارامە ئەمانە رادەهێنێ و دروستدەكا و دەرەخسێنێ و جوانسازييان تيادا دەكا، نەك ئەم ياسايانە شاعيرى كارامە دروستبكەن، چونكە دەبێ هەردەم ئەوە لەبير نەكەين كە ئەم ياسايانە، دواى شيعر و شاعيران پێيان زانراوە و لە بەرهەمى شاعيران دروستكراون و هەڵهێنجراون .

*** *** ***

شاعيرانى رابەرى ئەو گۆڕينە، ناوبراوان و هاوڕێيانيان، ئەو شاعيرانەش كە چ هاوچەرخيان بوون و ياردەريان بەو گۆڕينە هەبوو.. چ ئەوانەش كە دواى ئەوان هاتن، شيعرى كورديان لەو ئاستە گۆڕانەدا بەرەڵا نەكرد.

بەڵكە هەر ئەو گۆڕانكارييە هەنگاوى يێكەم بوو، شاعيرانى رابردوو خۆشيان هەر بەو يێكەم هەنگاوە رازى نەبوون .

واتە رازى نەبوون ئەو كێشە سەرەكييانە بەو شێوەيە لە يێكترى تەريكبن.. واتە رازى نەبوون شيعرێك لە سەرەتاوە تا دوايى هەموو دێرەكانى (٨) برگەيى بن يان (١٠) برگەيى يان هەر كێشێكى سەرەكى تر.

بەڵكە لەگەڵ پێشكەوتنى شارستانێتى و جەنجاڵبوونى ژيانداا بە كارێكى عەمەلييان نەدەزانى و، ئەو كێشە سەرەكييانەش بەو قەوارە و سيستمەى هەيانە جۆرێك لە (رۆتينى) كێشەكانى (عەروزى)ى تێدا بوو.

بۆيە لە هەنگاوى دووەمدا، هەر لە (نۆ) كێشە سەرەكيێكە هاوكێشەى شيعريان درووستكرد، واتە هەندێك لەو كێشە سەرەكييانەيان ئاوێتەى يێكترى كرد.. وا لەم بەشەدا، ئەو گۆڕانكارييەش روونده‌كەينەوە.

*** *** ***

**هەنگاوى دووەم:**

ئاوێتەكردنى نۆ كێشە سەرەكيێكەى شيعرى كوردى و پەيدابوونى سێ هاوكێشەى شيعرى سەرەكى:-

شاعير و خەياڵى شاعير ئەو بابەتانەى لێى دەدوێ قاڵبى ئەو (نۆ) كێشە سەرەكييەش بەرگەى نەگرتن.. بەڵكە شيعرى كوردى لەم سێ هاوكێشەيەدا خۆى دييەوە .

**هاوكێشەى يێكەم:**

**(كێشى هێندەكانى چوار برگەيى)**

دەشێ شيعرێك ژمارەى برگەى دێرەكانى، واتە كێشى دێرەكانى، چوار برگەيى و هێندەكانى وەك خۆى بێ بەرەوژوور، بۆ نموونە ئەو دێرانەى شيعرەكەيان لێ دروستدەبێ ژمارەى برگەى دێرەكانى لە:

٤، ٨، ١٢، ١٦، پێكهاتبێ چۆن ؟

ئەو ئاسمانە شينەى ژوور سەر --------٨برگەيە

کۆتری سپی تیا خول ئەدا-----------٨ بڕگەیە
بە بێ فەقەر ---------- ٤ بڕگەیە
مژدەی گوڵ بە بلبل ئەدا ----------٨ بڕگەیە

هەروەها شاعیر دەیتوانی دێڕی (١٢) بڕگەیی و (١٦) بڕگەیش لە هەمان شیعردا بەکاربهێنێ، مادام ئەو کێشەی پێی داناوە (هاوکێشەی شیعری هێندەکانی چوار بڕگەییە) .

نموونەی تر :

لە دوو تاقگەی ---------------- ٤
نیگای خاوی چاوەکانتا ---------------- ٨
لە برژانگی ---------------- ٤
جوان چنراوتا ---------------- ٤
بە ئاشکرا و بە دزییەوە ----------------٨
ماسیی هەموو حەزەکانم گلبەرەوە ------------ ١٢

ئەو شیعرەش دەتوانرا دێڕی (١٦) بڕگەیشی تێدا بێ، مادام شاعیر بۆ دانانی شعرەکە کێشی هێندەکانی چواری بەکارهێناوە .

واتە دەشێ شیعرێك بەمشێوەیە دابڕێژرێ، گەر بە کێشی هێندەکانی چوار بڕگەیی داڕێژرابێ .

٤----
٨---------
١٦------------------
١٢-------------
٨---------
٤----
١٢-------------
١٦------------------
..............تا دوایی.

گرنگ ئەوەیە لەم، هاوکێشەیە دەرنەچێ ١٦,١٢,٨,٤.

کەواتە لەم هاوکێشەیەدا، سێ کێشی سەرەکی لە (٩) کێشەکەی هەنگاوی یێکەمی گۆڕانکارییێکە ئاوێتەی یێك بوون، جگە لەوەی دێڕی(٤) بڕگەیی تیادا داهاتووە .

**هاوکێشەی دووەم :**

**((کێشی هێندەکانی پێنج بڕگەیی))**

دەشێ شیعرێك ژمارەی بڕگەی دێڕەکانی، واتە کێشی دێڕەکانی، پێنج بڕگەیی و هێندەکانی وەك خۆی بێ بەرەو ژوور .

بۆ نموونە ئەو دێڕانەی شیعرەکەیان لێ درووست دەبێ، ژمارەی بڕگەی دێڕەکانی لە ١٥,١٠,٥ پێکهاتبێ، چۆن؟

گۆڕراوم . بەڵێ .ئەبێ پێیلێنێم
کە من گۆڕراوم
عەشقت وەك جاران تەئسیر ناکا، تێم
ئەی نووری چاوم .

ئەو شیعرە دەتوانرا دێڕی (١٥) بڕگەییشی تێدا بێ
مادام شاعیرەکەی بە کێشی (هێندەکانی پێنج بڕگەیی) داڕشتووە

نموونەی تر:

بە باسی دێوو خێو و جنۆکە
نەك خەو، ئەشمردم
شەو بە شەرواڵە هەڵواسراوەکەم ڕۆحیان ئەبردم

واتە دەشێ شیعرێك بەم شێوەیە دابڕێژرێ گەر بە کێشی هێندەکانی پێنج بڕگەیی داڕێژرابێ.

لەم هاوکێشە شیعرییەشدا دوو کێشەی سەرەکی هەنگاوی یێکەم ئاوێتە بوون کێشی (١٠) بڕگەیی و کێشی (١٥) بڕگەیی جگە لەوەی دێڕی (٥) بڕگەییشی تیادا هاتووە و نوێیە.

**هاوکێشەی سێ یەم:**

**((کێشەی هێندەکانی حەوت بڕگەیی))**

دەشێ شیعرێك ژمارەی بڕگەی دێڕەکانی واتە کێشی دێڕەکانی، حەوت بڕگەیی و هێندەکانی وەك خۆی بێو بەرەو ژوور .

بۆ نموونە ئەو دێڕانەی شیعرەکەیان لێ درووست دەبێ، ژمارەی بڕگەی دێڕەکانی لە ١٤، ٧ پێکهاتبێ، چۆن ؟

دەشێ شیعرێك بەم شێوەیە بێ ئەگەر بە کێشی هێندەکانی حەوت بڕگەیی داڕێژرابن :

کاتی نووسینی ئەم باسە نموونە لەبەردەستدا نەبوو چ لەبەر کەمی سەرچاوە، چ لەبەر ئەوەی شاعیران ئەم هاوکێشەیەیان بە دەگمەن بەکارهێناوە، مەگەر ئاوێتەی هاوکێشەی تریان کردبێ کەلە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین.

لەم هاوکێشەیەشدا، دوو کێشی سەرەکی ئاوێتە بوون کێشی (٧) بڕگەیی و کێشی (١٤) بڕگەیی .

*** *** ***

پێویستە ئەوە بزانین ئەو دوو هەنگاوی گۆڕانکارییەی باسمان کردن و بە نموونەوە لێی حاڵیبووین، زیاتر بۆ شیکردنەوە و ئاسانکردنی تێگەیشتنێتی، دەنا شاعیرانمان هەن هەر لە هەنگاوی یێکەمدا وەستاوون و، بە و سێ هاوکێشە شیعرییەی لە هەنگاوی دووەمدا لێی دووایین تەنانەت یێك شیعریشیان نەنووسیوە ئیتر ئەی لە بروانە بوونەوە بێ بە هەنگاوی دووەمی گۆڕانکارییێکە، ئەی لە لێ نەزانین و سەلیقە دەرەقەت نەهاتنەوەبێ .

بۆیە ئەو خاڵانەمان ڕوونکردنەوە چونکە لە بەشی داهاتوودا باس لە هەنگاوی سێیەمی ئەو گۆڕانکارییە دەکەین کە ئەویش ئاوێتەکردنی هەموو کێشە سەرەکی و هاوکێشە شیعرییێکانە بە یێکتری لە هاوکێشەییێکی شیعری نوێدا، کە کەم شاعیرمان هەن بەم

شێوەیەی (گۆران) دەرەقەت هاتووە، دەرەقەت هاتن، لێرەدا تەنیا مەبەستمان فۆرمی شیعرە، مەبەستمان کێش و سیستمی ئاهەنگی چۆنایەتی دابەشکردنی برگەکانە لە ناوەوەی دێڕی شیعردا، نەک شاعیرانمان زوێر بن و خراپ لە مەبەستمان حاڵی بن .

*** *** ***

**هەنگاوی سێ یەم**

**کێشی هاوکێشەی ناوێتە :**

وەک لە سەرەوە ووتمان ئەم کێشە شیعرییە هاوکێشەییێکی ئاوێتەیە دەشێ هەر کام لەم جۆرە دێڕانەی تیادا بێ:

١. دێڕی ٣ برگەیی
٢. دێڕی ٤ برگەیی
٣. دێڕی ٥ برگەیی
٤. دێڕی ٦ برگەیی
٥. دێڕی ٧ برگەیی
٦. دێڕی ٨ برگەیی
٧. دێڕی ١٠ برگەیی
٨. دێڕی ١١ برگەیی
٩. دێڕی ١٢ برگەیی
١٠. دێڕی ١٣ برگەیی
١١. دێڕی ١٤ برگەیی
١٢. دێڕی ١٥ برگەیی
١٣ . دێڕی ١٦ برگەیی

واتە دەشێ شاعیرێکی کارامە و جوانساز، شیعرێک دابنێ، بە گوێرەی سەلیقە و شارەزایی خۆی لە کردنی ئاهەنگی ناوەوەی دێڕەکاندا، چەندین دێڕ لەو (١٣) دێڕە بەکاربهێنێ .

بە مەبەستی چاکتر حاڵیبوون، چەند نموونەییێک دەهێنینەوە لەم گۆڕانکارییەی هەنگاوی سێیەم، واتە لە (کێشی هاوکێشەی ئاوێتە)

نموونەکان:

١- ئەی چاو چەشنی بازی قەفەز هەڵۆەری پەرت ١٣برگە
کوا؟باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دولبەرت ١٤ برگە
کوانێ؟دوو چاوی مەستی کوانێ؟ ٨برگە
کوانێ؟برۆی پەیوەست کوانێ ؟ ٨برگە
کوانێ زووڵفی ڕەش کوانێ ؟ ٥برگە
کوڵمی ئاڵ و گەش ؟ ٥برگە
کوا هەیکەلی جەمال؟ ٦برگە
کوا حسنی بێ میسال؟ ٦برگە

واتە:لە نموونەی هاوکێشەی یێکەم پێنج جۆر لە١٣جۆرەکەی لێیدواین بەکارهاتووە(٦، ٥، ٨، ١٤، ١٣).

٢- لە ژێر ئاسمانی شینا ٧برگە
لە پاڵ لووتکەی بەفرینا ٧برگە
کوردستان گەڕام ٥برگە
دۆڵاو دۆڵ پێوام ٥برگە
نە لە شار و نە لە دێ ٧برگە
نەمدی کەس ٣برگە
وەک تۆ جوان بێ ٤برگە
تۆیت و بەس ٣برگە
کچە کوردێک دڵ پێی شاد بێ ٨برگە
وەک فریشتە و پەریزاد بێ ٨برگە

واتە: لە نموونەی دووەمدا پێنج جۆری تر بەکارهاتووە: (٨، ٤، ٣، ٥، ٧).

*** *** ***

١- لەجەرگی پەردەوە، تك تك،
دڵۆپی عوور ئەڕژا ١٤برگە
بە نووکی تەئسیری ٦برگە
تەڕەب، ئەهاتە خرۆش، تالعی سوور، ئەپژا ١٤برگە
بە ئاهی دڵگیری ٦برگە
کەمان، شەهیق و زەفیری:فریشتەیی ئەلکان ١٤برگە
ئەکەوتە ناودڵی مردوویش، هەناسەیی هەیەجان ١٥برگە
نەوایی مۆسیقی ٦
کەمەخرەجی سیحری ٦
تەلێکە، پێ ئەکەنێ، یاکونێکە، حوزن ئەگری ١٥
مەتاعیبی گوزەران ٦
هێواش.هێواش.ئەتکێتە دەروونی ئینسانێك ١٣
کە ڕەمزی لەززەتە، میفتاحە بۆ تەلیسمی ژیان ١٥
ژیانی ئینسانێك ٥

واتە : لە نموونەی سێیەمدا پێنج جۆری تر بەکارهاتووە: ١، ٧، ١٥، ٦، ١٤.

*** *** ***

ئەو نموونانە بەسن بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.پێویستە سەرنجی خوێندەران ڕابکێشین بۆ ئەوەی :شیعر خوێندنەوە جگە لە دەنگ لە باری و ڕەوانگۆیی کە پەیوەندیان بە سەلیقەوە هەیە.شارەزایی و لێزانی دەوێ لە کێش و هاوکێشی شیعری، واتەخوێندنەوەی شیعر هونەرە و پێویستی بە خۆ پەروەردە کردن و ڕاهێنان هەیە، بە تایبەتی شیعری نوێی چاك، بۆیە دەبێ ئاگاداری ئەوە بین و بەهۆی لێ نەزانینی خۆمانەوە گلەیی لە شیعری نوێ نەکەین و بێ تێگەیشتن لە ناوەڕۆك و گەوهەری شیعرێك بە دەنگی بەرز بۆ کەسی نەخوێنینەوە تا لە خۆڕا دەبینین.

## بەشی سێیەم

### «ڕێنووسی کوردی بە پیتەکانی لاتین»

پێویستە پێش هەموو شت پیتەکانی ئەلفابێتای لاتینی بناسین و شارەزایان بین، پراوەییێکی زۆریان لەسەر بکەین ئەوسا بکەوینە پێنووسین – پراکتیکیان لە نووسینی ووشە و ڕستە و پەرەگراف و دەق .

وەك لە بەشی یێکەمدا باسمان کرد، پیتەکانی دەنگ ٢٩دانەن، ئەمەش هێماکانیانە:

خشتەی پیتەکانی دەنگ

| هێمای عەرەبی | پیتی بچوك | پیتی گەورە | هێمای عەرەبی | پیتی بچوك | پیتی گەورە |
|---|---|---|---|---|---|
| و | . | , | ع | ‘ | ‘ |
| ب | b | B | غ | X | X |
| پ | p | P | ف | f | F |
| ت | t | T | ڤ | v | V |
| ج | c | C | ق | q | Q |
| چ | Ç | Ç | ك | k | K |
| خ | X | X | گ | g | G |
| ح | h | H | ل | l | L |
| د | d | D | ڵ | ĺ | Ĺ |
| ڕ | ř | Ř | م | m | M |
| ر | r | R | ن | n | N |
| ز | z | Z | و | w | W |
| ژ | j | J | ه | h | H |
| س | s | S | ی | y | Y |
| ش | ş | Ş | | | |

پیتە هەواییێکانیش (٩) دانەن :

ئەمەش هێماکانیانە:

| هێمای عەرەبی | پیتی بچووك | پیتی گەورە | هێمای عەرەبی | پیتی بچووك | پیتی گەورە |
|---|---|---|---|---|---|
| ا | a | A | ۆ | o | O |
| ـە | e | E | وێ | ö | Ö |
| و | u | U | ی | î | Î |
| وو | ü | Ü | ێ | ê | Ê |
| | | | ـد | i | I |

هەمان دەستووری یاساکانی ڕێنووسی کوردی کە لە بەشی یێکەمدا لێی حاڵی بووین لێرەش دووبارە دەبنەوەو پێویست ناکا سەر لەنوێ دووبارەیان بکەینەوە .

جگە لەو یاسایانە ئەم یاسایانەش دەچنە سەر ڕێنووسی کوردی بە پیتەکانی لاتینی .

١–سەرەتای هەموو ڕستەیێك بە پیتی گەورە دەنووسرێ وەك :من دەنووم .

Min denûm .

خۆ ئەگەر ڕستەکە درێژ بوو (، )ی کەوتە نێوان ئەوا سەرەتای دوای وێرگول هەر بە پیتی بچووك دەنووسرێ تا دوای خاڵەکە – ڕستەی دوای خاڵ – دیسان سەرەتاکەی بە پیتی گەورە دەنووسرێ .

وەك: من و تۆ تینوومانە، چونکە شتی سوێرمان خواردووە

Min u to tinûmane ,çunke şitî
sôrman xwarduwe.

٢– ناوی مرۆڤ و شوێن و کارەساتی ناسراو.. گەر بکەوێتە ناوەندی ڕستەشەوە هەر یێکەم پیتی بە پیتی گەورە دەنووسین.

وەك:

تۆ وەرە و کاروان بێنە.

To were w Karwan bêne.

قادر دەچێ بۆ بەغدا .

Qadir deçê bo Bexda

٣– هەروەها کورتکراوەی ناویش بە پیتی گەورە دەنووسرێ ئەگەر چی بکەوێتە ناوەندی ڕستەشە وەك:

مامۆستا ت.و.پسپۆڕ بوو (١) .

Mamosta T.W. pispoŕ bû.

٤–مێژوو بە ژمارە بە پێچەوانەوە دەنووسرێ .

| | |
|---|---|
| ١٩٨١ /٥/٤ | 04.05.1981 |
| ١٩٧٣/١٠/٢ | 02.10.1973 |

ئەو چوار یاسایە دەخەینە سەر یاساکانی بەشی یێکەم و دەستدەکەین بە پراوە و پراکتیك کردنی نووسین:

(١) ت.و : کورتکراوەی ناوی –تۆفیق وەهبی–یە.

بەس بێ و بەس بچۆ، بەس خۆت بنوێنە
بەس بە تیلەی چاو، جەرگم دەربێنە

Besbêw bes biĉo, bes xot binwêne,
Bes be tîley çaw cergim derbêne

چاوت ڕەشە بە خومارەوە
مەمکت سێوە بە دارەوە
خودا داویە مەی شارەوە

Çawit řeşe be xumarewe
Memkit sêwe be darewe
Xuda dawye mey Şarewe

بۆ هاوڕێی ئازیزم کاک بروسکە

پێشکەشە

ڕێزو و نەوازش

تکایە سبەی بفەرموون بۆ ئەو ئاهەنگەی بە بۆنەی چەژنی

نەورۆزەوە سازمان کردووە .

سوپاس بۆ ئامادەبوونتان

هەر شادبن

برای دڵسۆزتان

هەلۆ

Bo hawŕêy āzîzim Kak Biruske
Pêşkeşe
Ŕêz u newaziş
Tikaye sibey bifermûn bo éw áhengey be boney cejnî newrozewe sazman kirduwe.
Supas bo ámadebntan
Her şad bin.
Biray diĺsoztan
Heĺo .

دوای ئەو چەند نموونانە.. هەندێك شیعری کوردی بە پیتەکانی لاتین دەنووسین و.. دوایی بەم باسە دێنین هیوادارین سوودی خۆی گەیاندبێ و سەرکەوتن بۆ ئێوەی هێژا.

پراکتیك

بە سەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم

شریتی عەمری ڕابوردووم وەکو خەو دێتە بەر چاوم

Be sersamî leser lutkey biĺindî gencî westawim
Şirîtî 'emrî ŕaburdûm weku xew dête ber çawim

ئەی ڕەقیب هەرماوە قەومی کورد زمان

نای شکێنێ دانەری تۆپی زەمان

'Ey ŕeqîb her mawe qewmî kurd ziman
Nay şikênê danerî topî zeman

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە

چەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتووە

'Em ŕojî saĺî tazeye Newroze hatewe
Cejnêkî konî kurde be xoşîw behatewe

گوڵ و خونچەی بەهارانیش لە تۆ نەشمیلەتر نابێ

نەمامی عەرعەری کۆرپەش لە تۆ خنجیلەتر نابێ

Guĺ u xunçey beharanîş le to neşmîletir nabê
Nemamî 'er'erî korpeş le to xincîletir nabê

چاوەکەت کاتێ بە ئێما مەیلی جامی مەی ئەکا

هەرچی مەی ئەیکا لەگەڵ ئەو، ئەو لەگەڵ ئێمەی ئەکا

Çaweket katê be êma meylî camî mey êka
Herçî mey eyka legeĺ ew, ew legeĺ 'êmey eka

*** *** ***

خۆزگە ژیانم هەمووی شەو ئەبوو

دوژمن خەریکی شیرین خەو ئەبوو

من لەگەڵ یارا، سەر لەسەر سەرین

پشتم لە دنیا ڕووم هەر لەو ئەبوو

Xozge jîyanim hemûy şew ebû
Dujmin xerîkî şîrîn xew ebû

Min legeĺ yara ser leser serîn
Piştim le dinya rûm her lew ebû

داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێت قەت بەر ناگرێ

سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ

پیاو ئەبێ بۆ سەندی حەققی لە مردن سڵ نەکا

هەر بڕوخێ بە نییە تاکو نەسەندرێ، نادرێ

Darî ázadî be xön áw nedrêt qet ber nagirê
Serbexoyî bê fîdakarî ebed ser nagirê

Pîaw ebê bo sendinî heqqî le mirdin siĺ neka
Her biŕûxê bês nîye, taku nesendrê nadirê




Additional Letters

# تەمەنێك لە بێدەنگی

سیڤا دڵشاد مەریوانی

پێم دەڵێن بێدەنگی
ڕاست ئەکەن بێدەنگم
تەنیا گوێ ئەگرم
من هەمیشە گوێ بۆ دەنگی تۆ هەڵئەخەم
پێم مەڵێ ئەستەمە گوێت لەدەنگم بێت
من هەمیشە گوێ ئەگرم.. کۆڵ نادەم
گوێ لەشاخ و
لەکانی و ڕووبارو
داروبەرد ئەگرم
گوێ لەپشیلەکانی کۆڵان و
لەکوکوختیەکانی سەربان و
گوڵە باخەکانی باخەکەمان ئەگرم
گوێ لەمناڵانی ڕەش و ڕووتی ناو بازاڕو
لەدیوارەکانی ئەمنەسوورەکەو
لەپیتە لاتینییەکان ئەگرم
گوێ لەبێدەنگی ئەگرم
کۆڵ نادەم.. دڵەکەم
لەدەنگی ئەوانا گوێ لەدەنگی تۆ ئەگرم
من کۆڵ نادەم... دڵەکەم
گوێ لەدەنگی خاك ئەگرم
ئەڵێم ئاخۆ لەژێر کام خاکدا بیت
ئەو خاکەی نێرگزی لێ ئەڕوێ
یان ئەو خاکەی گوڵاڵە سوورەی لێ ئەڕوێ
من کۆڵ نادەم، هەربێدەنگ ئەبم... گوێ ئەگرم
تا ئەو ڕۆژەی دەنگت لەبەهەشتێکی دوورەوە بانگم ئەکات
تا ئەو ڕۆژە هەر گوێ ئەگرم



# کورتە یادگارێك لەگەڵ سەرەتای ژیانی ئەدەبی جوانەمەرگ دڵشاد مەریوانی دا

ئەکرەم قەرەداخی

ساڵی ١٩٦٤ خوێندکاری پۆلی چوارەمی زانستی بوم کە برای خۆشەویستم عەلی توانا هەواڵی ئەوەی دامێ کە خەریکی دروستکردنی کۆمەڵەیەکن بەناوی کۆمەڵەی " بوژاندنەوەی سامانی کوردی" و داوای لێ کردم کەمنیش بەشداری لە یەکەمین کۆبوونەوەی ئەو کۆمەڵەیەدابکەم. کەپێم وت لە کوێ دەبێت، وتی لە ماڵی دڵشاد مەریوانییە.

-ماڵی دڵشاد لە کوێیە؟

-لە کۆڵانەکەی تەنیشت ئەوقافە لە بەردەرکی سەرا.

-سەعات چەند؟

-سەعات چواری عەسر.

کە لە کاتی خۆییدا لە دەرگام دا، کورێکی باڵا بەرزی دەم بە زەردە خەنە دەرگاکەی لێ کردمەوە و پێم ووت...

--ماڵی کاك دڵشادە؟

-بەڵێ خۆیەتی و دڵشادیش خۆمم.

ئەوە یەکەم جارم بوو دڵشاد مەریوانی ببینم.

و هەر کە چوینە ژورەوە، زۆر بەدڵ و بەخۆشی پێشوازی کردم و بەخێرهاتنێکی گەرمی کردم و ئەوەندەشی پێ نەچوو برای بەرێزم کاك فەرەیدون عەبدولقادر و کاك عەلی توانا و کاك عومەر ساڵح (کە ئەو کاتە ناوی خۆی نابوو بێزار ساڵح) یەك لە دوای یەك گەیشتن.

لە پاشتردا یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمەڵەکەمان دەستی پێکرد. لە پێشدا دڵشاد مەریوانی قسەیکرد زۆر بە گەرمی جارێکی دی بەخێرهاتنی کردین و پێی ڕاگەیاندین کە لەم ڕۆوە ئەم ماڵە ماڵی خۆتانە و بنکەی کۆمەڵەکەشمانە.

ژورەکەی دڵشاد لە ماڵی باوکیدا کەوتبووە خواروی خانوەکەوە، تا ڕادەیەك بە تەنها و سەربەخۆبوو، ڕێك بەرامبەر بە دەرگای حەوشەو بوو، واتە ئەوەی دەهاتە ژورەوە بەسەر بەشەکەی دیکەی ماڵەکەدا هاتووچۆی نەدەکرد، لەبەرئەوە شوێنێکی زۆر گونجاو بوو.

لەناوژورەکەدا دوو ڕەفەی زۆر درێژ هەبوون کەسەرانسەر ژمارەیەکی زۆر کتێبیان لەسەر ریزکرابوو و بەشی زۆری کتێبەکان عەرەبی بوون.

باوکی پیاوێکی ئەدەب دۆست و حەزی بەڕوناکبیری دەکرد، وەك دڵشاد خۆی باسی دەکرد هەموو جارێك کە هاتوچۆی بەغدای دەکرد بەپێی خواستی دڵشاد چەند کتێبێکی بۆ دەکڕیو بۆی دەهێنایەوە.

بەشێکی زۆری کتێبەکان ئەدەبی بوون و لە ناویشیاندا هەندێك کتێب دەربارەی ڕەخنەی هونەری هەبون هەر ئەو ڕۆژە بڕیارماندا ئامانجی کۆمەڵەکەمان چی بێت؟ بە کورتی کۆمەڵەکەمان لە سێ خاڵدا کۆ دەبۆوە.

ا-بایەخدان بە کۆکردنەوەی سامانی کەلەپوری کورد بە هەموو جۆرێك.

ب-هەوڵدان بۆ دەرکردنی گۆڤارێك یا ڕۆژنامەیەك کە بەدەست بینوسینەوەو بەچەندەها نوسخە بلاوی بکەینەوە.

ە-هەوڵدان بۆ پێشخستنی ئەدەب و هونەری کوردی بە نوسینی چیرۆك و شیعرو پەخشان و بابەتی فیکری.

کاك فەرەیدون کە وەك بیرم بێت ئەوکاتە هەندێك نوسینی بەناوی (ماهی دەشت)ەوە بلاوکردبۆوە، لەگەڵ کاك عومەر ساڵحدا ڕۆڵێکی زۆریان بینی لە چەسپاندنی برگەی سێیەمدا واتە بایەخدان بە ئەدەبی هاوچەرخ و بلاوکردنەوەی چونکە لەو ساڵەدا لە هەموو کوردستاندا تاکە یەك ڕۆژنامە یا گۆڤاری کوردی نەمابوو، حکومەت هەر هەمووی داخستبوو.

لەبەرئەوەی یەکێکی دی لە ئامانجەکانی کۆمەڵە بایەخدان بوو بە هونەری کوردی. هەر لەوێدا بڕیاری دروستکردنی لیژنەیەکماندا بەناوی لیژنەی هونەر وامان بەباش زانی کاک عومەر چاوشین بکەین بە سەرۆکی ئەو لیژنەیە و لە پاشتریشدا وەک دێتە بیرم هەر لە پارەی پیتاکی ئابوونەی خۆمان توانیمان کە مانچەیەکی بۆ بکڕین و پەیمانی دا کە بگەڕێت بە دوای ئەو گۆرانییە فۆلکلۆرییانەی لەناوچوون و سەرلەنوێ تۆماریان بکاتەوە.

ئیتر هەمو هەفتەیەک لە ڕۆژی دیاریکراودا لەماڵی دڵشاد کۆدەبوینەوە، لە هەموو کۆبوونەوەکاندا دڵشاد دەنگێکی دیارو ڕۆحێکی سوک و خۆشەویستی هەبوو، هەمیشە ئەو زەردەخەنە جوانە بەسەر لێویەوە بوو، هەرگیز تورەبوونی نەدەزانی، هەر کە پێویستی بەسەلماندنی ڕایەک یا بیرۆکەیەک، یا قسەی بیرمەندێک بوایە ڕێک هەڵدەستاو لەسەر ڕەفەکان کتێبێکی دادەگرت و پەڕەیەی هەڵدەدایەوە بۆی دەخوێندینەوە جارەجارەش دەیکردە سوعبەت و چەند نوکتەیەکی بە دوای یەکدا دەگێڕایەوە.

هەر لەو کۆبوونەوانەدا بیرۆکەی یەکەم فیلمی کوردی باسدەکراو کاک عومەر ساڵح لە پەیوەندیدا بوو لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی کوردا. دڵشاد لە مەشدا زۆر هاندەر بوو، زۆرجار دەیوت دەتوانم بەشێک لەو پارەیە پەیدا بکەم و خەمتان نەبێت.

لەپاش چەند مانگێک بڕیارماندا، یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەکە زۆر بەنهێنی بگرین، کۆنفرانسەکە لە ماڵی کاک عەلی توانا کرا، ڕۆژێک لەدەمەو ئێوارەوە، دەستی پێ کرد تا بەرەبەیان لەو کۆنفرانسەدا چەندین وتار خوێندرایەوە، و لە پاشدا کۆمەڵێکی زۆر ڕاسپاردەو بڕیارمان چەسپاند کە هەر هەموویان لەسەر شریتێک تۆمارکرا (کە داخەکەم نازانم چی بەسەر هاتووە). لە کۆنفرانسەکەدا هەڵبژاردن کرا وەک لە بیرمدا مابێت: کاک عومەر ساڵح بە زۆرینەی دەنگ بوو بە سەرۆکی کۆمەڵە، کاک دڵشاد مەریوانی بوە جێگری سەرۆک و کاک فەرەیدون عەبدولقادر بوە سکرتێری ئیداری کۆمەڵە و سکرتێری ڕۆشنبیریش درایە من و عەلی توانا بوە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر لە پاشدا بڕیارماندا پێویستە مۆڵەتێک بۆ کۆمەڵەکەمان وەربگرین، ئەوکاتە حکومەت بەدوای یەک پەڕەی کوردیدا دەگەڕا و زۆر قاچاخ بوو، و خاوەنەکەی دوچاری هەموو کێشەو دەردە سەری و زیندانێک دەبووەوە، بۆیە وامان بەباش زانی پەیوندی بە پارتی ئەو کاتەوە بکەین. بە داخەوە ئەوکاتەش سەرەتای جیا بوونەوەی مەکتەبی سیاسی بوو لە سەرۆکایەتی پارتی ئەوکاتە.

کاک فەرەیدون و کاک دڵشادی جوانەمەرگ ڕەزامەندیان پیشاندا کە بچن بۆ شاخ و مۆڵەتەکە وەربگرن، وابزانم کاک عومەریشیان لەگەڵ بوو کە چووبوون بۆ ماوەت لەوێ مامۆستایان خوا لێخۆشبوان ئیبراهیم ئەحمەد و عەلی عەسکەری و نوری شاوەیسیان بینیبوو و ماوەیەک مانەوەو بڕیاری هەموو هاوکارییەکیان لێ وەرگرتبون و زۆریان پێ خۆش بوبوو و هەندێک ڕێنمایی و چاودێریشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە، یەکێک لەوانە گۆڕینی ناوی کۆمەڵەکەبوو بۆ: (کۆمەڵەی ژیاندنەوەی کەلپۆری کورد) و هەر ئەوکاتە پێشنیازەکەمان بەباش زانی و بڕیارماندا کە ناوەکەی بگۆڕینو ئەوانیش کە هاتنەوە زۆر بە وردی هەموو شتێکیان بۆ گێڕاینەوە لە هەمووی خۆشتر ئەوەبوو کە بڕیاریاندا بوو گۆڤارەکەی کۆمەڵە لە دەرەوە چاپ بکەن و بەڕۆنیۆ بڵاوی بکەنەوە...

چەند ساڵێک ئەو کۆمەڵەیە بەنهێنی لەسەر ڕێبازی خۆی بەردەوام بوو، هەر کۆبوونەوەیەک لە ئەنجوومەنێکی ڕوناکبیران دەچوو کە گەلێک باس و خواس و بابەتی ئەو سەردەمەی تێدا باس دەکراو دڵشادی جوانەمەرگیش کۆنووسی کۆبوونەوەکانی لە دەفتەرێکی گەورەدا دەنووسیەوە و لە پاشدا ئیمزای پێ دەکردین و دەفتەرەکەی دەئاخنیە ناو دارەڕای بنمیچی ژورەکەیەوە. (خۆزگە ئەو دەفتەرەم جارێکی دی بەرچاو بکەوتایەتەوە).

لە پاشتردا دڵشاد زۆر حەزی بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی سارتەر و سیمۆن دیبۆڤوار دەکرد، زۆرجار لەو بارانەوە قسەی بۆ دەکردین، هەستم دەکرد وەک ڕۆشنبیرێک حەز بە فەلسەفەی وجودی دەکات، و ئەوکاتە گۆڤاری ئاداب لە لوبنان دەردەچو، سەرنوسەرەکەی (سهیل ئدریس) بوو، بەرهەمێکی زۆری لەسەر بونگەرایی و بونگەراکان بڵاودەکردەوەو دڵشاد زۆر بە شەوقەوە دەیخوێندنەوەو زۆریش بۆ ئێمەی دەگێڕایەوە، جارە جارە ناچار دەبوین گۆڤارەکە بکڕین یا ئەوەی ئەو ببەینەوەو سەرلەنوێ بیخوێنینەوە و لەوکاتەوە دەقمان بە خوێندنەوەی ئەو گۆڤارەوەگرت و ژمارە بە دوای ژمارەدا بەدوایدا دەچوین، داخەکەم لە پاشتردا خوێندنی زانکۆ ئێمەی لە یەکتری جیا کردەوە من چووم بۆ زانکۆیەکی دورو ڕێگای زانستم گرتەبەر ئەو چو بۆ زانکۆی بەغدا و لەبەشی کوردی وەرگیرا و کاک فەرەیدون لە زانکۆی مستەنسریە وەرگیرا و ئیتر پەرەوازەبووین. جارەجارە بەنامە یەکتریمان ئاگادار دەکردەوە، من توانیم بەهەر حاڵێک بێت و بە پارەیەکی زۆر مۆرێک بۆ کۆمەڵە لە بەغدا لای مۆرهەڵکەنەکان دروست بکەم بەناوی (کۆمەڵەی ژیاندنەوەی کەلەپۆری کورد) یەوە دڵشاد ئەم هەنگاوەی زۆر پێ خۆشبوو، هەموو جارێک دەیوت ئەو مۆرە لەدایک بونەوەی منە چونکە ئیتر کۆمەڵە دەژی و نامرێت.

# دڵشاد مەریوانی و چەند وردە بیرەوەرییەك

ئازاد جندیانی

گەرچی لەنێوان باوکم و حاجی ئەمینی فەتاح دا دۆستایەتی و ئاشنایەتییەکی کۆن هەبوو کە پەیوەندی کوردایەتی بناغەی ئەم ناسیاوەتییەی رەنگ رشتبوو، بەڵام بەهۆی هەلومەرجی شۆڕشەوە دەرفەتی ئەوە نەرەخسابوو من و دڵشاد یەکتر بناسین، تا لەساڵی ١٩٧١دا ئێوارەیەکی هاوین میوانێکی کڵاش پەڕۆی باڵابەرزی سیما هێمن بووە میوانی کەپەرەکەمان، کەسمان نەماندەناسی، دوای دانیشتن نامەیەکی دایە باوکم و یەکسەر دوای خوێندنەوەی دەم و گفتی باوکم بەرامبەری گۆڕاو دیارە ئەمەش بۆ منێکی پۆلی یەکەمی ناوەندی خۆ بەزلزان و قسەگەورە و دەم لەشیعر سوو دەرفەتێکی باش بوو، بۆیە هەر کەزانیم میوانەکەمان شاعیرە یەکەمین شەومان زۆر بەخۆشی بەسەربرد بەتاتیبەت بۆ من چونکە یەکەمین شاعیری گەنج بوو کە بیناسم (زووتر چەند جارێك لەمەجلیسی مام هەژارو دڵزاردا گوێگر بووم).

دۆستایەتی من و دڵشادی جوانەمەرگ ڕۆژ دوای ڕۆژ گەرمتر دەبوو، ئەو مامۆستاو منیش قوتابییەکی پڕ پرسیاری چەتوون، ئەو دەیویست وردەوردە فێرتی شت ببم من پەل و پۆی زۆرم دەهاویشت.

** ** **

دوای حەفتاو پێنج و لەنەفیاتی دا چوومە بەغداو بەدوایدا گەڕام شەوێك لەئوتێل عەبدوللا دۆزیمەوە، زۆرمان دەم و چاوی یەکتر لێستەوە، هەر ئەوشەوە لەباڕێکی بەغدا دانیشتین و وتی بەداخەوە دەستگیرانەکەم چۆتەوە سلێمانی و لێرە نییە تا بەیەکترتان بناسێنم و هەر بەو بۆنەیەشەوە ئەو شیعرەی خۆی بۆخوێندمەوە کە بەناوی (شوشە خان)ەوە بۆ شیرینی نووسیبوو کە کەف و کوڵێکی ڕۆمانسیانەی هاوسەنگی پێوە دیاربوو، هەر لەو دانیشتنەدا وتی: شیرین منی لەزۆر شت گێڕایەوەو بووە هۆی ئەوەی هاوسەنگی خۆم لەدەست نەدەم و ئەو پارسەنگەی بۆ ڕاست کردمەوە کە لەئەنجامی نەچوونە ناو شۆڕشدا لەڕووی دەروونییەوە بۆم دروست بوو.

** ** **

ئەو وەختەی هەواڵی شەهید بوونیم پێگەیشت، لەڕۆژنامەی (ڕێبازی نوێ)دا نووسەر بووم کە شەهید یوسف شەریف سەرنووسەری بوو، هەواڵی شەهیدبوونەکەیم دارشت و بلاومان کردەوە کە ڕەنگە یەکەمین کەس بووبم هەواڵی ئیعدام کردنی دڵشاد مەریوانی هاوڕێ و مامۆستام بەڕەسمی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەدا بلاوکردبێتەوە.

# چەپکێک نامە ودڵنامە

شیرین. ك



منیش وەکو زۆر کەسی تر هەر لەقۆناغی هەرزەکاریمەوە بەردەوام دەفتەرێکم هەبووە جار بەجار ئەو رووداوانەم تیا دەنووسی کە بەلامەوە بایەخدار بوون، بەڵام بەدرێژی و روونی نا، بەڵکو زۆرجار بەرستەیەك یان پەرەگرافێك کە هەر خۆم لێی تێدەگەیشتم، هیچ کاتێکیش دەفتەرێکم پڕ نەکردۆتەوە بەو یادەوەریانە، چونکە هەر لەو قۆناغەی تەمەنمەوە وردە وردە کەوتبوومە نووسینی دەق لەبابەتی پەخشان و شیعرو کورتەچیرۆك و ئەجۆرە شتانە.. واتە ئەوەی لە ناخما بوو تەعبیرم لێدەکرد بۆیە کەمتر پێویستم بە یاداشتنامە هەبوو، چونکە زۆر جار ئەو یاداشتنامانە وەکو هەناسەدان و تەعبیرێکە لە پەنگخواردنەوەی ناخ.

لەقۆناغی دووەمی زانکۆدا بووم کە دڵشاد بووە مامۆستام و ناسیم، زۆری نەبرد شتێکی لەلام دروستکردو بووە جێی سەرنجم، هەستم دەکرد شتێك بەرەو ئەوم رادەکێشێ. جار بەجار لەدەفتەرەکەمدا سەرنج و تێبینییەکانم وگۆڕان و بەرەوپێشەوەچوونی هەست و سۆزی خۆم بەرامبەری و رەفتارو هەڵسوکەوتی ئەویشم بەرامبەر بەخۆم تۆمار دەکرد.. دیسان ئەمەش بەچەند رستەیەکی کورت یان پەرەگرافێك و شێوازێك کە رەنگە هەر خۆم لێی تێگەیشتبێتم، ئەمەش وەکو سلکردنەوەیەك نەکا بەردەستی یەکێك بکەوێ و بیخوێنێتەوە..

رۆژان تێپەڕین ئێمە بووینە هاورێ.. ئەو رۆژەی من و دڵشاد پێکەوە دانیشتین و هەمور شتێکمان بۆ یەکتری درکاندو لەسەر شتە مەبدەئییەکان رێکەوتین (کە ئێستا بیری لێدەکەمەوە یان دەیخوێنمەوە زیاتر لەپەیماننامەو مۆرکردنی بەڵێنێکی فیکری دەچێ تا دڵداری) ئەو سەردەمە ئێمە بەئایدۆلۆژیاکان مەحکووم بووین و سێبەری قورسی ئەو ئایدۆلۆژیایانە بەسەر هەست و سۆزمانەوە بوو، چرکەکانی رۆمانسیەتی لێدەکردین بەوپەڕی جدیات.. بەهەرحاڵ منی رۆمانسی هەر ئەو رۆژە لەدەفتەرەکەمدا نووسیومە (خەونەکەم هاتەدی) دیارە لەماوەی ئەو ساڵەدا کە من و دڵشادبە تەنیا هاورێ بووین زۆرجار خەونم بەوەوە دەدی کە رۆژێ هاورێیەتیەکەمان ببێتە خۆشەویستی و.. هتد چونکە قەت ئامادە نەبووم بەشێوازێکی تەقلیدی ببمە هاوژینی پیاوێك.. ئیتر لەو رۆژە بەدواوە بەردەوام لەو دەفتەرەدا راو بۆچوون و تێبینی و سەرنجەکانی خۆم لەسەر خودی دڵشادو رەوتی پەیوەندییەکەمان دەنووسی.. هەست و

سۆزو گۆڕانەکانی ناخی خۆم تۆمار دەکرد.. بەڵام وردە وردە ڕستەکان زۆرتـرو پەرەگرافـەکان درێـژترو شێوازەکەشـم ئاشـکراترو ڕوونـترو ڕاستگۆیانەتر دەبوو دیارە هۆکارەکەشی ئەوە بوو ئەو ترسە گەورەیەم نەمابوو لەوەی گەر یەکێك ئەو دەفتەرە ببینێ، چونکە پەیوەندییەکەمان سیفەتێکی ڕەسمی وەرگرتبوو.. هەندێجاریش نووسینەکانم دەچوونە قاڵبی شیعرو پەخشانەوە.. بەهەرحاڵ دوای شەش مانگ ئەو دەفتەرەم پڕکردەوە، ڕۆژێکیان بێ هیچ بۆنەیەك دەفتەرەکەم پێشکەش بەدڵشاد کرد، وتم: ئەمە بۆ تۆیە، لەم دەفتەرەدا گەلێ قسەم بۆ کردووی کە گوێت لێنەبووە.. لەبەرئەوەی من و تۆ جارێ دەزگیرانین، جارێ ماڵێکمان نییە کۆمان بکاتەوە.. نەریتی باوی کۆمەڵگەش لێناگەڕێ بەئاسایی و سانایی یەکتری ببینین، بۆیە زۆرجار دەمەوێ شتێکت پێبڵێم، بەڵام تۆ لەلام نیت، دووری، یان من دوورم ناچار لەم دەفتەرەدا بۆت دەنووسم.. یان هەندێجار لەچرکەیەکدا خەمبار یان تووڕە دەبم، دەمەوێ قسەیەك بکەم بەڵام ناتوانم یان بەباشتری دەزانم نەیکەم، لێرەدا بۆت دەنووسم، ڕاستە بەتێپەڕینی کات تووڕەبییەکەم نامێنێ، بەڵام نەوتنی ڕەخنەو گلەییەکان مانای نەمان و سڕینەوەی نییە، بەڵکو لەناخمانا کەڵەکە دەبن و زیان بەپەیوەندییەکەمان دەگەیەنن، بۆیە بەچاکم زانیوە لێرەدا تۆماری بکەم تا بیاخوێنیتەوە، گەر بەسەریش چووبن ڕەنگە بتوانین هەر قسەی لەسەر بکەین..

کە دڵشاد دەفتەرەکەی وەرگرت و خوێندییەوە هێندە سەرسام بوو کە ئیتر ئەویش بڕیاریدا وەکو من بکات (جگە لەوەی ئەو ماوانەی کە لەیەك دوور بووین من لەبەغداو ئەو لەسلێمانی زۆرجار نامەی بۆ ناردووم).. لەیادی یەکەم ساڵی خۆشەویستییەکەماندا دڵشادیش دەفتەرێکی دامێ کە زۆر شتی تیا نووسیبوو کە بەشێکیان دەقی ئەدەبی جوانن، بەشێکیشیان شایەتی و بەڵگەیەکن لەسەر ڕووداوەکانی ژیانی خۆی و نێوەندی ڕووناکبیری و سیاسی ئەو سەردەمە..

دوای ئەوەی چووینە ماڵی خۆمان ئیتر دڵشاد وازی لەوە هێنا لەدەفتەردا شتم بۆ بنووسێ، من بەردەوام بووم، بەڵام منیش کەمتر دەمنووسی ساڵی وا هەیە هەر چەند نامەیەکم تیا نوسیوە .. تا گەیشتمە ساڵی ١٩٨٩ ئەو ساڵەی دڵشاد لەمانگی شوباتەکەیدا دەسگیرکرا من لەدەفتەری ئەو ساڵەدا چەند لاپەڕەیەکم نووسیبوو، بەڵام ئیتر دوای دەساڵ و نیو لەپێکەوەبوونمان لەماڵێکدا لەیەك دابڕاین و دڵشاد بەرەو نادیار برا، لەو گێژاوەدا.. دەستم کردەوە بەنامە نووسین بۆی.. نامە نووسین بۆ-دڵشاد-ێکی دوور، نادیار، بەڵام بەهیوا بووم ڕۆژێ لەڕۆژان بێتەوەو بیاخوێنێتەوە.. دوومانگ پێش تەواوبوونی ساڵەکە بەوەرەقەیەکی (طب عدلي) هەواڵی مەرگی دڵشادم پێ ڕاگەیەنرا، بەڵام من لەسەر نووسین هەر بەردەوام بووم بۆی، تا لەکۆتایی ساڵداو لە دوا ڕۆژیدا دواپەڕەیم نووسی.

مرۆڤ کاتێ بەبەرچاوی خۆیەوە کەسێکی خۆشەویستی دەمرێ.. بەبەرچاوی خۆیەوە کفن و دفن دەکرێ.. دەیان جار دەچێتە سەر گۆڕەکەی و ئینجاش دەڵێ: باوەڕ ناکەم.. هەمیشە کە دێتە خەوی لێی دەپرسێ: تۆ نەمردووی وا نییە! بۆیە بۆ من کە تاقە بەڵگەم وەرەقەیەك بوو، هەتا ڕاپەڕین زۆر بەهیوا بووم کە مابێت.. تا ڕووخانی ڕژێمیش هیوایەکی کزم مابوو کە ڕەنگە.. ڕۆژێ لەڕۆژان خۆی بکات بەماڵدا..

ئێستا پاش تێپەڕینی هەژدە ساڵ کە بەعەقڵ و مەنتیق بیردەکەمەوە دەزانم نەماوە.. بەڵام هەتا دەمرم لەنەستما، لەخەیاڵما، لەدڵما شتێك دەمێنێ.. خەونێك هەیەو دەرگایەك واڵایە بۆ هاتنەوە.. بوارێك بۆ خەوبینین کە ڕەنگە...

ئێستا نامەکانی من بۆ ئەو.. نامەکانی ئەویش بۆ من لەدووتوێی چوار دەفتەری دووسەد لاپەڕەییدان، دەفتەری پێنجەم ئەو نامانەن کە دوو مانگ پێش دەستگیر کردنی دڵشاد نوسیوومەو دوای گرتنەکەشی هەر بەردەوام بووم، واتە ئەو نامانەن کە ئەو نەیبینیون، دیارە ئەوچوار دەفتەرە، دەفتەرە ئەسڵییەکان نین، چونکە دڵشاد بەر لەشەهیدبوونی ئامادەی کردبوون بۆ چاپ هەرچەندە هیچ هیوایەکی نەبوو کە بەو نزیکانە چاپکرێ، ڕەنگە پێشبینی ئەوەی کردبێت کە مەرگی نزیکە دەشیزانی کە من چەند کەمتەرخەم و پەرپووتم بۆ کۆکردنەوەو پاراستنی شتی خۆم، بۆیە لەگەڵ کۆکردنەوەو ڕێکخستنی نامەکانی خۆیدا ئەوانەی منیشی ڕێکخستبوو.. نامەکانی دڵشاد بە ناوی (چەپکێك نامە)وەیە، لەیەکەم لاپەڕەدا نوسیوێتی(فرمێسك بەشێکە لە هاوکێشەی پێکەنین، پێکەنین قەڵبەزەیەکەلە ڕووباری گرین).. لە لاپەڕە دوودا نوسیوێتی(بۆ شیرین.ك-شووشە- پێشکەشە.. د.م)لە لاپەڕەی سێ نوسیوێتی(مەسەلەکە جوانی باو نییە.. جا ئیتر هەرچەندە ئەو جوانییە بەرەو کاملبوون چووبێ..مەسەلەکە نهێنی جوانی و گیانەکەی ومانایەتی.. نهێنی جوانی تۆش: سۆزە.. گیانەکەشی: ژانە.. ماناکەشی: خۆشەویستییە.. گۆیا)دوای ئەوە پێشەکییەکی یازدە لاپەڕەیی بۆ نوسیوە، کورتەیەك لە ژیانی خۆی باسدەکات لە سەردەمی مێردمنداڵییەوە تا ئەو ساتە وەختەی یەکترمان ناسیوە، هەروەها باسی هەندێك پەیوەندی سۆزداری خۆیم بۆ دەکات، لە کۆتاییشدا دەڵێت(دەشێ نرخی ئەم نامانە لە ڕۆژگارانی ئاییندەدا بەرز بێتەوە چونکە نوسەر و بۆنوسراوی دوو مرۆڤی ئاسایی کورد نین.. هتد)دواتر باس لەوە دەکات کە بە نیاز بووە هەندێ لەونامانەی بۆ هەندێ لە هاوڕێ ودۆست و برادەرانی خۆی نوسیوە کۆبکاتەوەو ئامادەی بکات، دەڵی( بە تایبەتی نامەی ئەوانەی ڕۆڵی گرنگیان هەبووە لە ناو کۆمەڵی کوردەواری و..)دواتر باسی گرنگی (ئەدەبی نامە )دەکاتو دەخوازێ ئەدیب و نووسەران بایەخ بە ئەدەبی نامە بدەن.. نامەکانی خۆم ناوی (دڵنامە)یە دڵشاد کۆیکردونەتەوە وڕێکیخستوون، پێشەکییەکی بۆ نوسیوە تیایدا باسی ئەوە دەکات چۆن پێشنیازی بۆ من کردووە



نامەکانم وەکو کتێبێك کۆ بکەمەوە وژیاننامەیەکی کورتی بۆ بنووسم، بیرمدیٚ من ئەوساش قەناعەتم بەوە نەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ژیانی خۆمدا ئەو نامانە بلاٚو بکرێنەوە، وەکو پێشتر ئاماژەم پێدا من بەردەوام بووم لەسەر نامە نوسین دوای ئەوەی ماڵێکیش کۆیکردینەوە، بەلاٚم یەکەم نامەم لەو ڕۆژەدا بۆ نوسیوە کە دڵشاد داوای لێکردم ببمە هاوسەر وهاوژین و .. دوا نامەشم لە سی و یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی هەزارو نۆسەدو هەشتاو نۆدا نوسیوە کە دوا ڕۆژی ساڵەوهەمووی دوو مانگ وچەند ڕۆژێك بوو هەواڵی مەرگی دڵشادم پێڕاگەیەنرابوو، لە دوا لاپەڕەی دەفتەرەکەمدا نوسیومە(دوا لاپەڕە.. دوا نوسین.. ئەمە دوا لاپەڕەی دەفتەرەکەمە.. ئەو دەفتەرەی بە تەمابووم لێم وەرگری.. یەکەم دەفتەرە کە لێمی وەرناگری..ئەمڕۆ دوا ڕۆژی ساڵی هەشتاکانە،لەدوا ساڵی حەفتاکاندا لانەیەك هەردووکمانی کۆکردەوە.. وا لەدوا ساڵی هەشتاکاندا لێکدابڕاین، لانەکەم چۆڵ نەبووە، ئەگەر بڵێم چۆڵە درۆ دەکەم، چونکە سیٚ نوسخەت لە ڕۆحی خۆت بۆ جێهێشتووم.. ئەمڕۆ دوا ڕۆژی هەشتاکانەو تۆ بەتەنیا، زۆر کوتوپڕ، بیٚ گلەیی، بێئیزنخواستن، بیٚ پشوو، بەتەنیا زۆر بەتەنیا ڕۆشتی، کەی؟ چۆن؟ لە کویٚ؟ لەبەرچی؟ بۆچی؟.. نازانم، پرسیارەکان زۆر زۆر و بێسەرو بەرن.. ئەمڕۆ دوا ڕۆژی ساڵە، ئەمشەو کریسمسە.. هەوا خۆشەو بەفر نابارێ.. ئەمشەو لەپشت پەردەکەوە دەوەستم چاوەڕوانی تاپۆکەت دەکەم، ئەمشەو ئەمەویٚ شێتبم، تاپۆ و سێبەرت بە ئاشکرا ببینم...) ئەو نامانەی هەردووکمان جگە لەلایەنە سۆزداریەکەی نێوان ژن وپیاوێك.. جگە لەوەی زۆری دەقی ئەدەبی جوانن، ئەو نامانە کۆمەڵیٚ بەڵگەی ڕاست و ڕەوانی قۆناغێکی ژیانی ئەم کۆمەڵگەیەیە، بڕیار وابوو نامەیەك یان زیاتریان لەم ڕۆڤارەدا بلاٚوبکەمەوە، بەلاٚم چەند هەفتەیەك بەدەستمەوە بوون نەدەمتوانی بەتەواوەتی بیانخوێنمەوە، نەتوانیم هیچیشیان هەڵبژێرم.. هەرچەندم کرد دڵم نەهات.. من باوەڕم بەوەیە کە ئەدیب و هونەرمەند موڵکی میللەتن، بەلاٚم ژیانی تایبەتیان نا، ئەو نامانەش بەشێکی زۆری ژیانی تایبەتی هەردووکمانی تیایە کە من تا ئەم چرکەیە قەناعەتم بەوە نییە چاوێکی نامۆ بیانبینیٚ و بیانخوێنێتەوە.. من ئەو دەفتەرانە دەپارێزم، وەسێتم بۆ کچەکانیشم کردووە بیانپارێزن.. دەزانم ئەگەر من بمردمایە ئێستا دڵشاد ئەو نامانەی بلاٚودەکردەوە چونکە ئەو رایەکی تری هەبوو لەسەر ئەم مەسەلەیە.. بەلاٚم من نا.. من تا ئەم چرکەیە حەزناکەم هیچ کەس ئەو نامانە ببینیٚ... بەلاٚم دوای خۆم، وەچەکانم خۆیان سەربەست دەبن لەوەدا کە بلاٚوی دەکەنەوە یان نا..

.٢٠٠٦/٦/١

Rovar

A Newspaper Size Magazine

40

کڵپەیەکی کەڵەگەت
فرمێسکێکی کەڵەگەت
مەرگێکی کەڵەگەت
شیعرێکی کەڵەگەت
هەر یەك (شیرین)
کڵپەفرمێسکی داگیرسان
فرمێسك، مەرگی پاراوکردوو
مەرگیش بوو بە باسێکی (بێستوون)ێك و
بۆ ناو گیانو
تاسەر چاومان
هەزار (شیرین)ی
پیا سەرکەوت.

شێرکۆ بێکەس